زنجیرەی بیروباوەڕی خوا بە یەك ناسین

بەرگی 2

# ناوە جوان و پیرۆزەکانی




قال رسول الله ﷺ :

أن لله تسعة وتسعين اسماً مئة الا واحدة فمن احصاها دخل الجنة

رواه البخاري ومسلم


نوسینی

مامۆستا مەلا صابر صالح حسين گەردی

ئیمام و وتار خوێنی مزگەوتی شیفا - لەهەولێر



چاپی سێیەم

٢٠١٣/٨/١




زنجیرەی بیروباوەڕی خوا بە یەك ناسین

﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾

الاعراف: ١٨٠

# ناوە جوانو پیرۆزەکانی خوای گەورە ﷻ

قال رسول الله (ﷺ):

**« أن لله تسعة وتسعين اسماً مئة الا واحدة فمن احصاها دخل الجنة »** رواه البخاري ومسلم


نوسینی

**مامۆستا مەلا صابر صالح حسین گەردی**

ئیمامو وتار خوێنی مزگەوتی شیفا - لەهەولێر



چاپی سێیەم

٢٠١٢/٨/١

**ناسنامەی کتێب**

**ناوی کتێب: ناوە جوان و پیرۆزەکانی خوای گەورە ﷻ**
**نووسینی: مامۆستا مەلا صابر صالح حسین گەردی**
**تایپ:**
**نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆک: نووسینگەی هیوا**
**چاپ: سێیەم ٢٠١٢**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٤١٧)
ساڵی (٢٠٠٠)ی دراوەتێ

# پێشەکی :

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کەرۆڵـەی بـۆ خـۆی بڕیـار نـەداوە ، وەهـیچ هاوبەشێکی نیە لەداراییەکەی وەدۆستێکی نیە لەبـەر کـەم و کـوڕی .. (سـبحانە وتعالی) ..

درووددو سلاوی ئەم میهرەبانە بڕژێ بەسەر گیانی پـاکی پێـشەوای مرۆڤایـەتی کەهەموو چەرخ و زەمانێ هۆشیاران ئاوات بۆ بیرو باوەڕەکەی ئەخوازن ، کەببێتـە بەرنامەی ژیانیـان .. وەبـڕژێ بەسـەر هـەموو هـەلگرانی تاکـە رێـی ئـازادی و سەرفرازی هەتا هەتایی ..

زۆر دەمێك بوو ئاواتم ئەخوازی کەناوە جوانەکانی خوا بەزمانی کـوردی بخەمـە بەرچاوی خوێندەوارانی بەرێز ..

هەرچەندە خاوەنی کەمێ لەم زانیاریە بێ سنورەین بگرە لێیەوە زۆر هـەژارین ، بەلام بەس چۆن گرێ ئیمان و بیروباوەڕمان لێمان ئەگەڕێ دەم کوت و پێنوس شکاو بین بەتایبەتی لەو مەیدانەی کەگۆڕەپانەکەی کەلێنی تیایە !

وەجێگەی گومان نیە کەتائێستا لەبازاڕا کتێبێکی وامان نەدیوە کەبەتەواوی و پوختەیی لەم بارەوە دوا بێت کەچی مافی خۆیەتی کەهیچ لایەنە زانیاریێ ژمـارەی نوسـراوەکانی شـان لەشـانی نـەدات ، هـەروەها خـوای گـەورە هەڕەشـە دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّـاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُوْلَئِكَ يَلْعَنُهُمْ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمْ اللاَّعِنُونَ ﴾ البقرە/ ١٥٩

ئەوانەی ئایەت و فەرموودە دەزانـن و دەیانـشارنەوە ، وەبەخـەلکیان نـالێن و بۆیان شیناکەنەوە ئـەوە خـواو فریـشتەکانی خـواو خـەلك نـەفرین و نەعلـەتیان لێدەکەن ، دیارە خاوەن ئیمانیش ناتوانێ هەڕەشەی خوا فەرامۆش بکـا ، ئەمانـە

بوون پێنوسەکەمانیانی پڕ مەرەکەب کردەوە لایەنی تێکۆشانیان هان داین و نوێیان کردەوە ..

ئەوەی راستیەکی بێ گومان بێت ، هەرچی شیرینی دڵنیایی و راست پەروەری بێ ، یا ئازادی و کامەرانی و سەربەخۆیی بێ ، یا زانیاری لەبن نەهات و بێ ، یا لەززەت لەژیان و مردن بێ .. یا .. یا .. هتد.

هەر گشتیان خۆیان ئارایش داوە لەناو عیشقی خودایی .. هەرچی بازاڕەکانی تر هەیە گشتیان لەچەوساندنەوەو ڕێ بزرکردن و زیاد کردنی تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانن ، وەئەگەر ناوێکی جوان و رازاوەش هەڵبدەن ، ئەوە بوختان ئەکەن بەو دروشمە جوانانە کە وەکو ئاو وان بۆ دڵی ئادەمیزاد بەڵکو گشتیان هەڵخەڵەتاون و نەفامن وە شەیتانەکان کارەکانی خۆیانیان لەبەرچاو جوان کردوون .

﴿ وَزَيَّنَ لَهُمْ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ الانعام : ٤٣ .

ئەمەش راستیەکی نەگۆڕاوە ، لەو ڕۆژەوە خوا ئادەمیزادی لەسەر زەوی بەدی هێناوە تا کۆتایی پێهاتنی ، ئەم راستیە زۆرانبازییەتی لەگەڵ هەر هەموو ڕێچکەکانی کەئادەمیزاد لەچارچێوەی بەندایەتی بەدیهێنراو ئەبەستنەوە ، وەهەر کاتێ ئەم زۆرانبازییە دەستی پێ کردبێ ئەنجامی باش هەر بۆ هەڵگرانی راستی بووە ، وەلەلایەنی پەروەردگاریشەوە بەڵێن پێدراون کەدوا ڕۆژ بەهەشتیان پێ ببەخشرێ ، لەپاداشی باوەڕو کردەوە چاکەکانیانا .. وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ(١٧١) إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ(١٧٢)وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴾ الصافات / ١٧١ ـ ١٧٣.

**صابر صالح حسين گەردی**

## ( بۆ خوایە ناوە جوانەکان – لە الاسماء الحسنى )

ئەوەی بەزەیی بەگیان و ژیری خۆی هاتبێتەوە ، روگەی زانیاری و ژیری گرتبێت و خۆی لەناحەزەکانی رزگار کردبێت ئەوە چاوە جوانەکەی دڵی وەکو وێنەی خونچەی گەشاوە بۆ کراوەتەوە ، جا پێی ئەنوارێتە ناوە جوانەکانی خودا کەلەسەر بەدیهێنراوەکانی ئەدرەوشێنەوە بەم سەیر کردنە باوەش دەکات بەبازاڕی شادمانی بێ پایان ، وەك مێش هەنگوینێ ئەم گوڵ و ئەو گوڵ بکات و خۆی لەشەکراوو شیلەیان تێر بکات ..

وەچاوەکانی سەریشی لەبەر بێهێزی و شەرم کردنا خۆیان لەپەنا پیلوی چاو ئەشارنەوەو ئەکەونە سەریەك ، ئای چەند خۆشی ، گشت هۆشیاران وا لەعیشقت خەویان لێ زڕاوە ، لەلایەکی ترەوە نەزانین و کوڵەوارێتی و بێ ئاگایی ، لەگەڵ دۆستەکانی خۆیاندا دەست لەملێیانە غەم و پەژارەو گیروگرفت و تاڵاوی ژیان و دەردە سەری لەیەکتر هەڵئەمژن..

داخی گرانم لەدەست تۆ نەزانین ، خۆزیا دۆستەکانت ئەیانزانی چەند بێ وەفایی چەند ترسناکی چۆن دۆڵێکی بێ بنی ، خۆزیا دەیانزانی کەتۆ دەستت لەگەردەنیان ناوە ، دەتەوێت بیان خنکێنی ، بەڵام بەزەیی و میهرەبانی پەروەردگار لێت ناگەڕێ و مۆڵەتیان دەدات بەڵکو واز لەدۆستایەتیت بێنن بەڵام چی بکەم زۆربەی زۆری دۆستەکانت خەوی قووڵ فڕاندوونی !..

زاتی خودا لەبەر گەورەیی بێ پایانی ، هەروەها ناوە جوانە بێ وێنەکانی کەهیچ سنوریان بۆ نیە ، لەو مەودایە بەدەرترە کەبیروهۆشی ئادەمیزادو جنۆکە — پێی بگات و لێی حاڵی ببێ ، بۆیە هەر کاتێ بیرو هۆشێ لەم بازاڕە گەڕایێتن ئەوا

بەدەستی خاڵی گەڕاوەتەوەو سەرگەردانی پەشۆکاوی بەشی بووە چونکە بیری تەسکی ئادەمیزاد ناتوانێت گەورەیی بێ سنووری پەروەردگار لەباوەش بگرێت ، وەك چۆن حەوزێکی بچووك ناتوانێت دەریایەکی بێ بن لەناوخۆی کۆبکاتەوەو گل داوەتەوە !! ..

ئەوە پێغەمبەری ئازیز — ﷺ — ئەم راستیەی درکاندووەو فەرمویەتی ﴿ تفكروا في خلق الله ولاتفكروا في ذات الله فإنكم لن تقدروا قدره ﴾ ابو نعيم لەحليەدا باسی کردووە ..

واتە : بیربکەنەوە لەبەدیهێنراوەکانی خودا ، وەبیرمەکەنەوە لەزاتی خودا چونکە ئێوە هەرگیز ژیریتان پەی پێ نابات ..

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الانعام /١٠٣ .

واتە : ئاگاییتان لەهەر سنوورێك بێ ناگات بەناسینی زات بەڵام زاتی خودا زانیاری بێ پایانەو بەهەموو لایەنێکی ئێوە دەگات ، وەخۆی خاوەن نەرمیو بەزەیی و لوتفە و شارەزایە ..

یەکێ لەئیمامەکان دەفەرموێ: ئەگەر لەبیرکردنەوەیا بڵێی لەوانەیە خوای گەورە ئەوهاو ئەوها بێت ، واتە شێوەیەکی بۆ بڕیار بدەی لەناو بیرو فیکرا ئەوە نابێت چونکە دەبێتە موشریك و هاویەش دانەر بۆ خوا .. وەئەگەر بڵێیت هیچ نیەو هیچ شێوەی نیە ئەوە دەبێتە مولحید واتە وجود نادەیتە پاڵ خودا .. ئەی چارە ؟!! باشتر وایە بڵێی ﴿ ربنا رب السماوات والارض لن ندعوا من دونه إلها لقد قلنا إذاً شططاً ﴾ الكهف /١٤ . خوای پەروەردگار ئێمە پەروەردگاری

ئاسمانەکان و زەوییە هەرگیز پەرستراوێ بێجگە لەئەو ناپەرستین و روی تێناکەین ، ئەگەر وانەکەین زۆر لەئاست و حەقیقەتا دورکەوتووینەتەوە ، بڕیاری زۆر دوور لەڕاستیمان داوە .

هەروەها نابێت ئەم ڕاستیەمان لەیاد بچێت کەبیری ئادەمیزاد سنورەکەی وا لەو مەودایەیە کەبینیویەتی و ئەیبینێ .. وەکو مادە بەهەر جۆرو شێوەیەکی بێت — وە خوای گەورە ماددە نیەو وەهیچ لەم شتانە ناکات کەلەبازنەی بەدیهێنراوی دان. ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾ شوری/١١.

واتە : هیچ شتێ لەوێنەی خوا نیەیەو خۆی بیسەرو بینایە ..

ئەی ئادەمیزاد کەواتە بیر لەچی دەکەیتەوە !!؟

هەرچی بیری لێدەکەیتەوە سەرەتاییەکەی لەکەل و پەلە دیتراوەکانا دەستی پێ کردووە.. کەوابێ دەبێ ئادەمیزاد ڕێز لەژیری خۆی بگرێت و سەرپێچی نەکات دەنا (بێ عەقڵی) ئادەمیزاد لەهیچ شتێ بێ نیاز ناکات ..

بۆمان روون بووەوە کەبیرکردنەوە لەزاتی تەعالا راستی دەست ژیری ناخات .. گومانی تیانیە کەناوە جوانەکانی خودا بەستراوەن بەزاتی خوای گەورە ، کەواتە بیرکردنەوە لەچۆنیەتی سیفەتی خوا وەك بیرکردنەوە لەزات وایە — چونکە سیفەت بەزاتەوەیە — کەوابێ بیرکردنەوە لێی شتێ دەست ژیری و عەقڵ ناخات !!!؟ دەی باشە ئەی چارە!!؟

بێگومان دەبێت بەهێزی ژیری خۆمان سیفەتە جوانەکانی خوا لەسەر بەدیهێنراوەکانی هەست پێبکەین و کەمێکی لێوە بدوێین ، دەنا سیفەتە

جوانەکانی خودا لەبن نەهاتوون لەتوانای ئـادەمیزاد نیـە بەتـەواوی باسـیان لێـوە بکات ..

لەوانەیە یەکێ پرسیار بکات و بڵێت چۆن !؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دوو نمونە ئەهێنمەوە :

١ – وەکو (تەشبیهی نەبێ) وێنەگایـەك (منظـر) کەوێنـەکێش (رسـام) دیـار نەبێت ، جا ئەتوانی بەسـەیرکردنی بـەش بـەش وێنەکـە توانـاو لێهـاتووی وێنـە کێشەکە دیاری بکەیت ..

٢ – وەکو (تەشبیهی نەبێ) شیعری شـاعیرێك کەشـاعیرەکە نەناسـراوو دیـار نەبێت ، ئەتوانی بەهێزی ژیـری لەسـەر شـیعرەکانی ، توانـاو لێهـاتوویی شـاعیر بزانێت .

بۆ نمونە : شاعیرێکی لێهـاتووە ، کـێش و قافیەکـەی تـەواوە ، ئـەم شـاعیرە لەشیعرەکانی وادیارە کەهەڵگری بیروباوەڕی خـوا بەیـەك ناسـینە ، ئـەم شـاعیرە زمانەکەی پاراوە ، زۆر جـوان و وورد شـیعرەکەی دارێـژتووە ، ئـەم شـاعیرە ئـەم شاعیرە ، .. هتد .

جا لەسەر بەدیهێنراوەکانی خوا دروشمـی سـیفەتەکانی تیـادا ئەدرەوشـێتەوە ، دڵانی هۆشیار پڕ ئەکەن لەشیرینی باوەڕو شادی و کامەرانی .. هتد .

ئەوەشتان بخەمەوە یاد کەناوە جوانەکانی خوا – کارو سیفەتەکانیەتی – خوای بەخـشندە بەبـەزەیی و میهرەبـانی خـۆی لەکیتابـەکانی بۆمـانی رەوان کـردووە بەرێچکەی پێغەمبەران – علیهم الصلاه والسلام ، کەدواییەکـەیان پێغەمبـەری مەزنمانە موحەممەد – ﷺ - ..

ئادەمیزاد نابێت خوای خۆی لەیاد بچێت و بچێتە ریز لـەخوا بـێ ئاگایانـەوە، چونکە خوای گەورە سەرچـاوەی هـەموو سـوودو زیانێکـە وەئـادەمیزادیش ئـەوا هەموو کات لەم نێوانەدا دەخولێتەوە ، جا ئەگەر بێت و بکەوێتە دوای لەخوا بـێ ئاگایانەوە بەمە رەزامەندی خوای لەکیس ئەچـێت و دۆزەخـیش لـەوێ بوەسـتێ ، سەیرکە بزانە خوای گەورە چی دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنْ الْجِـنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْـصِرُونَ بِهَـا وَلَهُـمْ آذَانٌ لاَ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمْ الْغَافِلُونَ ﴾ الاعراف / ١٧٩ .

واتە : بەراستی ئامادەمان کردووە جەهەندەم و دۆزەخ و بۆ زۆرینەی ئادەمیزادو جنۆکەکان – بێگومان لەبەر ئـەوەش نیـە کەبـەبێ هـۆو تـاوان ، بـەڵکو لەسـەر ئەوەبووە کەزانیاری و زانستی داهاتوومان (علم الغيب) سنوری داوە بـەبیروباوەڕو کاری بەدکاران، لەبەرئەوە دڵێکیـان هەیـە راسـتی پـێ وەرنـاگیرێ وەچـاوەکانیان راستی نابینێ وەگوێیـان ووتار بەمانای خۆی نابیستێ بەشێوەیەك کـەببێ بـەدەلیل لەسەر گرتنی رێگەی راست و دادپەروەری .

لەراستیدا بەشە هەستیارەکانی ئادەمیزاد گوێ گرو خزمەتکاری دڵن ، هەرچـی کەدڵ فەرمانی بدا ئەوان ئارەزووی ئـەوە ئەکـەن، دەی کـەوابێ دڵـی بـێ بـاوەڕان بەبیری ناهەموار تاریك بووە، جابەشە هەستیارەکانیش لەسەر شێوەی ئەم تاریکیە ئەرۆن و، ئەدڵ خێر لەبەشـە هەسـتیارەکان ئـەبینێ و ، ئەبەشـە هەسـتیارەکانیش رووئەکەنە شتی بەسوود ، جالەسەر ئەم بارەیە بێبـاوەڕان سـوود لەچـاوو گـوێ و دڵیان وەرناگرن وەکو ئاژەڵ وانە لەوەدا کەدڵێکی خاوەن سوودیان نیـە ، جائـاژەڵان رێومایی خوایی ژیـان ئەبەنـە سـەر ، بـەڵام بێبـاوەڕان شـایانی ئـەوەنین کـەخوا

رێنومابییان بکات بۆ نورو هیدایـەت ، مـادام ئـەوان بـەئارەزووی خۆیـان کـوفرو بێباوەڕی هەڵئەبژێرن ، کەواتـە گـومڕاترو دوورتـرن لـەئاژەڵان ، وەزۆر رووچـوونە بەغەفڵەت و بێ ئاگاییدا ، وەکو ئادەمیزادی سەرسام هەرچی هەوڵی لەگەڵا بـدەی بێ سـوودە ، بـەڵام ئـاژەڵان بـەزۆری و لێ راهـاتوویی شـوانەکەیان کـۆ ئەبنـەوە لەجێگەی بەسوود وەلەجێگەی زیان و نالەبار دوور ئەکەونەوە ..

جا ئادەمیزادی ئیماندار ئەبێت دوور بێت لەغەفڵـەت و بـێ ئاگـایی، هـەردەم لەیادی خودا بێت وەکو چۆن یەکێك گەر بیەوێ بچێتە حـەج و بـەڕێ بکـەوێ جـا لەهەر قۆناغەکانی رێگاکە حەجی هەر وەبیرە چونکە جێگای بۆچوون و ئاواتیەتی.

گریمان گەر چەند خولەکێك لەیادی بچێت کەبۆ کوێ دەچێت ئەوە ڕاستە رێگەی لێ دەگۆڕێ و روو دەکاتە لایەکیتر ، ئاوەها ئیمان داریش گەر ڕوو بکاتە غەفڵەت ڕاستە رێگەی لێ وون دەبێت ، بەڵکو ئەبێت ژیـان و هەسـتان و دانیـشتن و کـارو کردەوەی گشت بۆ خوا بێت ، تا نەکەوێتە غەفڵەت و بـێ ئاگـایی و، شـەیتانەکان هەلیان بۆ هەڵ کەوێ بیبەنە بازاڕەکەی خۆیان ..

خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ : ﴿ وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَـادْعُوهُ بِهَـا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ الاعراف / ١٨٠.

بێ باوەڕانی ئەمڕۆ وەکو بێ باوەڕانی کۆن دڵیان هاوڕێکە ، بێ بـاوەڕانی کـۆن لەمەککەیەکان بـێ شـەرمیان ئـەکرد لەبـەکارهێنانی ناوەکـانی خـواو ئینکـاری بازێکیان دەکردو بازێکیان دەگۆڕی و دەیان کرد بـەناو بـۆ بتـەکانیان ، بـۆ نمونـە ووشەی (الله) یان ئەکرد بەلات و ووشەی (عزيز) یان ئەکرد بە (عـزّى) و (منّـان) یان ئەکرد بە(مناة)، ... بێ باوەڕانی ئەمڕۆش سروشت یا مادده یا رێکـەوت یـا

.. یا .. هتد ، داناوه لەشوێنی خوای گەوره (سبحان الله عما یصفون) .. جا خوای گەوره بۆ پەرچ دانەوەی ئەوان نوستوانەی کۆن و نوێ ، فەرمووی بۆ خوایە ناوه جوانەکان ، بەناوه جوانەکانیەوه بانگی لێ بکەن و لێی بپاڕێنەوه واز لەوان کەسانە بێنن کەبێ باوەڕن لەبەکارهێنانی ناوەکانی خواو ، لەرێگەی راست لادەدەن و ناوەکان بەکەم و زیاد ئەگۆڕن وه یا لێیەوه بێ باوەڕن ، لەمەوپاش پاداشی وەرئەگرن بەرامبەر ئەو کاره نابەجێیەی کەدەیکەن .. ناوەکانی زاتی خوای گەوره بریتین لەو ناوانەی کەلەقورئان و فەرموودەی پیرۆزدا هاتوون ، وەك کەباسیان ئەکەین .. جا ئەگەر ناوی زات بێ وەکو (الله) یاناوی (صفه) بێت وەکو (خالق ، رزاق ، هادي ، .. هتد) وه غەیری ئەمانەش، وەدروست نیێە بێجگە لەو ناوانە بەکار بهێنرێ چونکە ئەبێ بەئیلحاد لەناوەکانا بەتایبەتی گەر بۆنی کەم و کورتی لێ بێ وەکو (عاقل) (حارث) (زراع) (عارف) ، .. هتد . وەئەو ناوانەی کەمەشهورن و ئیزنیان لەسەر هاتووه (نەوەدو نۆ ناون ، وەکو پێغەمبەر – ﷺ – دەفەرموێ خوای گەوره (٩٩) ناوی هەیە هەرکەسێ لەبەریان بکات و رەفتار بەمانایان بکات دەچێتە بەهەشت ، خوای گەوره تاکەو تاکی خۆش دەوێ .. تەرمزی و بەیهەقی ئەم ناوانەیان دیار کردوون کەبریتین لە : هو الله الذي لاإله إلا هو :

١ – الرحمن

٢ – الرحيم

٣ – الملك

٤ – القدوس

٥ – السلام

٦ – المؤمن

٧ – المهيمن

٨ – العزيز

٩ – الجبار

١٠ – المتكبر

١١ – الخالق

١٢ – البارئ

١٣ – المصور

١٤ – الغفار

١٥ – القهار

١٦ – الوهاب

١٧ – الرزاق

١٨ – الفتاح

١٩ – العليم

٢٠ – القابض

٢١ – الباسط

٢٢ – الحافظ

٢٣ – الرافع

٢٤ – المعز

٢٥ – المذل

٢٦ – السميع

٢٧ – البصير

٢٨ – الحكم

٢٩ – العدل

٣٠ – اللطيف

٣١ – الخبير

٣٢ – الحليم

٣٣ – العظيم

٣٤ – الغفور

٣٥ — الشكور

٣٦ — العلي

٣٧ — الكبير

٣٨ — الحفيظ

٣٩ — المقيت

٤٠ — الحسيب

٤١ — الجليل

٤٢ — الكريم

٤٣ — الرقيب

٤٤ — المجيب

٤٥ — الواسع

٤٦ — الحكيم

٤٧ — الودود

٤٨ — المجيد

٤٩ — الباعث

٥٠ — الشهيد

٥١ — الحق

٥٢ — الوكيل

٥٣ — القوي

٥٤ — المتين

٥٥ — الولي

٥٦ — الحميد

٥٧ — المحصي

٥٨ — المبدي

٥٩ — المعيد

٦٠ — المحيي

٦١ — المميت

٦٢ — الحي

٦٣ — القيوم

٦٤ — الواجد

٦٥ — الماجد

٦٦ - الواحد

٦٧ — الصمد

٦٨ — القادر

٦٩ — المقتدر
٧٠ — المقدم
٧١ — المؤخر
٧٢ — الاول
٧٣ — الاخر
٧٤ — الظاهر
٧٥ — الباطن
٧٦ — الوالي
٧٧ — المتعال
٧٨ — البر
٧٩ — التواب
٨٠ — المنتقم
٨١ — العفو
٨٢ — الرؤوف
٨٣ — مالك الملك
٨٤ — ذو الجلال والاكرام
٨٥ — المقسط
٨٦ — الجامع
٨٧ — الغني
٨٨ — المغني
٨٩ — المعطي
٩٠ — المانع
٩١ — الضار
٩٢ — النافع
٩٣ — النور
٩٤ — الهادي
٩٥ — البديع
٩٦ — الباقي
٩٧ — الوارث
٩٨ — الرشيد
٩٩ — الصبور

هەموو ناوەکانی خوا تاکن چونکە خوای گەورە خۆی تاك و تەنهایە .. خوای گەورە گەلێ ناوی تریشی گێڕاوەتەوە بێجگە لەوەی نوسیومانە ئەمانەش هەرچی لەقورئانـدا هاتووە وەکو (مولی ، نصیر ، غالب ، قـاهر ، قریـب ، رب ، ناصـر ، اعلـی ، اکـرم ، احسن الخالقین ، ارحم الراحمین ، ذي الطول ، ذي القـوة المـتین ، ذي المعـارج ، .. هتـد) وەلەفەرمودەشا هاتووە ، وەکو (حنان ، منـان) وەلەریوایـەتی ئـیبن و ماجـەدا چـەند ناوێتر هەن کەلەڕیوایەتی ناوبراودا نـین وەکـو (تـام ، قـدیم ، وتـر ، شـدید ، کـافي ) وەبێجگە لەمانەش .. ئیبن و کەثیر لەتەفسیرەکەیدا ئەفەرموێ تێکڕای ناوەکـانی خـوا لەقورئان و فەرمودەدا هەزار ناون کەئەمانە هەندێك لەناوەکەم ناسراوەکانن :

الاحد ، الاکرم ، الاعلی ، احسن الخالقین ، ارحم الراحمین ، البرهان ، التام ، الجواد ، الجمیل ، الحـاکم ، الحفـي ، الخلاق ، الـدائم ، ذو الطـول والانعـام ، ذو قـوة المـتین ، ذو المعارج ، الرفیع ، رب المشرقین والمغربین ، رب العالمین ، الـستار ، الـشدید ، الـصادق ، العالم ، العلام ، الغافر ، الغالب ، الفاتح ، الفرد ، خالق الحب والنوی ،القدیر ، القدیم ، القریب ، قابل التوب ، الکفیل ، الکافي ، المولی ، المنان ، المبین ، المنتقم ، الوتر .

وەهەندێ لەزانایان لەفزی (هـو) یـان لـەناو ناوەکـای خـوا حـسێب کـردووە کەلـە سوورەتی (الاخلاص) دا هاتووە کەدەفەرموێ : ﴿ قل هو الله احد)

# ناوی زاتی الله جل جلاله

ئەو خوایەی کەناوی زاتــی (الله)یــە وە (٢٧٠٢) جــار لــەقورئانا هــاتووە ، خــۆی تاکــە پەرستراوە هیچ پەرستراوێتر نیە بەغــەیری خــۆی ، وە هــەر خــۆی بەڕێوەبــەرو پــەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییەو بەوەی کەتیایان دایە ، یا بەمانایــەکیتر سەرپەرشــتی کــاری هــەموو دروست کراوو بەدیهێنراوەکانە ..

زانایان لەناوی (الله) دەڵــێن ، سەرچــاوەی ئــەم نــاوە پــیرۆزە بنــچینەکەی (إلــه) بــووە ، هەمزەکەی لابراوە ، وە (أل)ی بۆ زیاد کراوەو تایبــەتی خــوای گــەورە کــراوە ، هــەر خــۆی دەفەرموێ ﴿ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا ﴾ مريم / ٦٥ .

واتە پەروەردگاری ئاسمانــان و زەوی و ئــەوەی وا لەنێوانیاندایــە هــەر ئــەو بپەرســتە زۆر خۆگرو بەئارامیش بە لەپەرستنیا ئایا بیستوتە یا زانیوتە هاوناوی هەبێت ؟

پاکی و بێگەردی و هاوتایی بۆ خوای میهرەبانە ..

جا ئەم ناوە پیرۆزە بەهیچ شێوەیەك هاوناوی هاوتای نیەو ناشی بێ وەلەزمانی عەرەبیدا نەبووە بەمەصدەرو شتی تری لێوەرنــاگیرێ ، هەنــدێ لــەزانایان دەڵــێن کــە (أل) هەمیــشە لازمیەتی خۆ ئەگەر ئەلفەکــەش لابــرێ (لــە) دەمێنێتــەوە کــەزەمیری ئیــشارەی متــصلەو وەمەبەست هەر ئەگەڕێتــەوە بــۆ ئــەو واتــە خــوای گــەورە وەك لــەم ئایەتــەدا ئاشــکرایە ، کەدەفەرموێت :

﴿ ولــه مــافي الــسموات والارض ﴾ یــا ﴿ لــه الحمــد في الاولى والاخــرة ولــه الحکــم ﴾ یــا دەفەرموێ ﴿ وله الاسماء الحسنى ﴾ خــۆ ئەگــەر لامــە دووەمینەکــەش لابــدەین (هــا)یەکــە دەمێنێتەوە کەدەست نیشانە بۆ زاتــی (الله) جــل جلالــە کــە (هــو) دەگەیــەنێ وەکــو لــەم ئایەتانەدا ..

﴿ لاتدركه الابصار وهو يدرك الابصار ﴾ يا ﴿ وجعلوا لله انداداً ليضل عن سبيله ﴾ يا ﴿ الله لاإله الا هو ﴾

جا ئەم ناوە پیرۆزانە واتە (الله) (١١٢٥) جار لەحاڵەتی جەردا واتە (الكسرە) دا هاتووە (٥٩٢) جار لەحاڵەتی نصب (الفتحە)داو (٩٨٠) جار لەحاڵەتی رفع (الضمة)دا لەقورئاندا هاتووە وە (٥) جاریش لەگەڵ زەمیری موتتەصلی (هم)دا (اللهم) ، کەهەمووی دەکاتە (٢٧٠٢) جار . خوێنەرانی خۆشەویست و بەڕێز ئەمەتان لەیاد نەچێت و فەرامۆش نەکەن کەمەبەست لەفێربوونی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە ئەوەیە :-

کەلەڕوانگەیانەوە خوای پەروەردگارمان بناسین و بەو ناوانە هاواری بۆ بەرین و لێی بپاڕێینەوەو هەوڵ بدەین کەڕەببانی بین ، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێداوین و دەفەرمووێ ﴿ کونوا ربانیین ﴾ ال عمران / ٧٩ .

کەواتە ئەبێ هەوڵ بدەین بەگوێرەی توانامان خۆمان لەسیفەتەکانی خوا بڕازێنینەوە بێجگە لەسیفەتەکانی کەتایبەتن بۆ خوای گەورە وەکو ( خالق ، کبر ، عظیم ، .. هتد ) جا یەکەیەکە ناوە مەشهورەکانی خوای گەورە باس ئەکەین بەگوێرەی توانامان کە ژمارەیان (٩٩)یە ...

## ١ ـ (الرحمن)

الرحمن : ناوێکی پیرۆزی خوای گەورەیە ، بنچینەکەی (رحم)ە واتە بەزەیی و بەخشندە، الرحمن واتە خاوەن بەزەیییەو رەحم بەخشە بەهەموبوونەوەرەکان بەتایبەتی بەبەرەی نادەمیزادو جنۆکە ، ژمارەی ئەم ناوە لەقورئانی پیرۆزدا لە (١٦٩) شوێندا هاتووە ، کەئەم ئایەتانە هەندێکیانن .

**بسم الله الرحمن الرحيم**

ئەم ئایەتە کەناوی رەحمانی یەکەوجار لەباوەش گرتووەو ، وە یەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆزەو لەسەرەتای هەموو سورەتەکاندا هاتووە (تەنها سورەتی تەوبە نەبێ کەچی لەسوورەتی نەملدا لەدوو شوێن هاتووە ، واتە لە (١١٤) شوێندا ئەم ئایەتە دووبارە کراوەتەوە کەبووەتە دەرگا بۆکردنەوەو چونە ناو نامە پیرۆزەکەی خوا .. ئەمەش بەرزی ئەم ناوەمان واتە (رحمن) بۆ دەردەخات .. وەئەم ئایەتەش بەکورتی واتە بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان .. بەخشندەیی و میهرەبانێتی خوا سنورەکەی زۆر فراوانترە لەسنوری ژیرو بیری نادەمیزاد !! چۆن ؟

هەر بەشێك یا هەر پارچەیەك لەبوونەوەرەکان سەرتاپای بەخشندەیی خوای گەورەی لێ دەدرەوشێتەوەو پڕێی بەخشراوە ، وەئادەمیزاد تائێستا وەتا لەسەر ئەم زەوییە بژێت ناتوانێت سنوری سەرەتاو کۆتایی ئەم بونەوەرە بزانێت ، کەواتە ناتوانێ بەخشندەیی و میهرەبانی خوا سنورەکانی دیار بکات ،چونکە ئەوانەی بەخشندەیی خوایان لەگەلاّ کراوە سنورەکەی بەدەرترە لەسنوری زانیاری و ژیرو بیری نادەمیزاد ، بۆ نمونە :

لەپێش سەدەی بیستەمدا نەدەزانرا کەئاسمان هێندە فراوانە ، بەلاّم بەپێش کەوتنی باری زانیاری رون بووەوە کەئاسمان گەلێ فراوانترە لەوەی کەئیحتمالی بۆ ئەکرا ، تائێستا نزیکەی (٢٠٠٠) ملیۆن کەشکەکان (مجرە) زانراوە ، وەگەلێ زیاتریش چاوەڕێ دەکرێ بزانرێ ، وەهەر کەشکەشانێ زیاتر لە (١٥٠) هەزار ملیۆن ئەستێرەیە !! کەچی سەد سالّی پێش ئێستا

ئەمە بەخەونی شەوانیشا نەزانرابوو ، وەجێگەی گومـان نیـیە ئـەو پێـشکەوتنەی کەچـەند سەدە ساڵی تر ئیحتمالی بۆ هەیـە ئـەوە ئێـستا بەخـەونیش نـەبینراوە، وە ئـەم زەویـیـەی لەسەری ئەژین بەهەر کاتژمێرێ (٨٦) هەزار کیلۆمەتر ئـەبرێت بەسـێ مـەدار ئەخولێتـەوە لەیەك کات و ساتدا ، دەورەیەکی بەدەوری خۆی و یەکێ تر بەدەوری خۆرداو دەورەکەی تـری لەگەڵ کۆمەڵەی خۆردا ! جا ئەبێت ئەم زەویـیە لەکوێ وەهاتبێ و ماوەکەی چەند بێ وە بـۆ کوێ بڕوات؟

ئەوە زیاتر لەچەند ملیۆن ساڵە ئەم بوونەوەرە لەبوونایە !! .. ئەمە لەلایێ ، وەلەلاییێ تر بەلای ووردەکاری وە ، زۆر گیانلەبەری بچووك دۆزراونەتەوە بەهۆی ئـامێرە ووردبینەکانـەوە — وەکو بەکتریاو جۆرەکانی ، کەچـی سـەد سـاڵێك پـێش ئێـستا خـەیاڵی بۆنەچـوو بـوو ، وەهەندێ زیندەوەری بچووك دۆزراونەتەوە بەهۆی شوێنی کارگەریان دەنا خۆیان هێـشتا بـەر ئامێرە وورد بینەکان ناکەون — لەبەر بچوکیان — گومانی تیا نیـیە پاش چەند سەد ساڵێکی تر کەزیندەوەری وا بچووك ئەدۆزرێتەوە ، کەتائێستا نەدۆزراونەتەوە وەیا خوای گەورە گـەلێ بەدیهێنراوی تر بەدی ئەهێنێ کەهێشتا رەگەزی لەبوندانیـە لەمانـە وەك (دابـة الارض) خـۆ ئەمانیش سەرتاپا پێویستیان بەبەخشندەیی خوا هەیە ..

بۆ ئادەمیزادی هۆشیار ، کە جاران چاو — چاوی ئـادەمیزاد — بەبەخـشێکی گـەورەی خوا ئەکەوتەبەر چاو ، وەئەم رۆی رۆژگار کەزانراوە چاو بەهەزاران خانـەی ووردی وای تیایـە کەهەریەکـەیان تەواوکـەری ئـەوی تریانـە بـۆ پێکهێنـانی چـاوی تـەواوو پوختـە ، ئـەم ووردەزانینەش بوەتە هۆی ئەوەی کەچاو بەبەخششێکی زۆر گەورەی خـوا بکەونـە بەرچـاو ، هەروەها هەموو پارچە بەشە لەشەکانی تری ئـادەمیزاد کەچـی پێـشوو ئـەم ووردەکارییـەو رێکیـیە لەبەرچاوی زانینا نەبوو !! ..

کەواتە فراوانی بەخشندەیی خوا هەر خۆی دەیزانێ ، وەئێمەش بەپلەی ئیمان و زانیاریمان تام و لەزەت لەم رەحم و بەزەییـیەی خوا دەکەین ..

پێغەمبەر – ﷺ – دەفەرموێ : خوای گەورە لەو ڕۆژەی کە بەزەیی و ڕەحمی بەدیهێناوە (١٠٠) پلە بووە ، یەکێکی داوە بەدونیای بەدیهێنراو ، وە (٩٩)ی هەڵگرتووەو داینـاوە بـۆ ڕۆژی قیامەت ، وەئەگەر بێ باوەڕ ئەیزانی خوا چەند بەڕەحمە هەرگیز لێی بێ هیوی نەدەبوو ، وەئەگەر ئیمانداریش بیزانیایە کەخوا عەزابی چەند سەختە هـەرگیز لێـی دڵنیـاو ئـەمین نەئەبوو .. متفق علیە.[1]

﴿ الحمد لله رب العالمین ، الرحمن الرحیم ﴾

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایە کەبەڕێوەبەری جیهانەکانـە ، بێگومـان عـالمین جـەمعی (عالم)ە ، کەواتە عالمین واتە دونیای ئادەمیزادو دونیای پەری – جن – و دونیای ئاسمان (عالم الفضـاء) و دونیای دەریاکان (عالم البحار) ودونیای فریشتەکان (عالم الملائکة) وە .. هتد.

بەکورتی واتە بەڕێوەبەری گشت دروست کراوو بەدیهێنراوەکانە ، وەووتمان بەدیهێنراوەکان ئەمڕۆ گەلێ فراوانترو ووردتـر ئاشـکرا بوونـە ، لەبەرچـاوی زانیـاری ، وەتـاکو گـەورەیی و فراوانی و ووردی بەدیهێنراوەکان زیاتر روون بێتەوە ، دەسەڵاتی گـەورەیی بـێ پایـانی خـوا زیاتر خۆی ئاشکرا دەکاو دەنوێنێ ، هـەروەها بەخـشندەیی و میهرەبـانی بێپایـانی خـوای گەورە زیاتر روون و ئاشکرا دەبێت .

زیاد بوونی زانیاری لەفراوانی و ووردەکاری بونەوەرا گەورەیی و بەخشندەیی خوای گەورە لەبەردڵی هۆشیاران زیاتر روو ن دەکاتەوە ، کەواتە ئادەمیزادێکی هۆشـیاری ئـەمڕۆ کـاتێ کەدەڵێت (بسم الله الرحمن الرحیم) پێویستە سۆزی دەربڕین و تام و چێژی ئەم دێـرین گـەلێ

---

[1] گەر یەك ڕەحمی خوا ژیان بخاتە ڕێڕەوی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو گیرو گرفتەی ژیان و ژینگە ، ئەوە دیارە ڕۆژانی قیامەت هێندە سەخت و دژوارن پێویست بە (٩٩) ئەوەندەی تر دەکات ، یا بەمانایێکی تر ئەگـەر ژوورێکی دونیا گڵۆپێ روناکی بکاتەوە ئەوە لەڕۆژانی قیامەت پێویست بـە (٩٩) گڵـۆپ دەکـات بـۆ رووناك بوونەوەی ..

زیاتر بێت لەئادەمیزادێکی هۆشیاری درێژترین هەروەها کاتێ کەدەڵێ (الحمد لله رب العالمین) پێویستە ئەم سوپاس و ستایشە سۆزو ڕەگەکەی زۆر قوڵبێ بۆ بەڕێوەبەری جیهانەکان لەچاو ئادەمیزادی دێرین ، چونکە جیهانەکانی ئەمڕۆی ڕۆژگار زیاتر خۆیان دەنوێنن لەچاو ڕابردوو ، هەروەها هەمان شت لەدەربڕینی (مالك یوم الـدین)[1] هەرچـەند زانـین و زانیـاری بـەرەو پێـشوەتر بـڕوات ، بەخـشندەیی و میهرەبـانی و دەسـەڵاتی بێپایـان خـوا زیـاتر خۆیـان بەدەردەخەن ، کەواتە هەرچەندە زانین و زانیاری بەرەو پێشەوە تر بڕوات خواناسی گـەورەتری لێیەوە دێتە کایەوە ، ئیمان و باوەڕ پۆڵاترو فراوانتری بەرهەم ئەهێنێ : ﴿ إِنْ كُلُّ مَنْ فِـي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ إِلاَّ آتِي الرَّحْمَانِ عَبْدًا ﴾ مريم/٩٣ .

هیچ ژیرو هۆشیارێ کەوان لەئاسمانەکان و زەویدا نیە ئیللا ئامادەن لەبەندایـەتی ڕەحمـان – جل جلاله – بەخشندەیی میهرەبان شایانی خۆیەتی هەرچی لەبووەکان هەیە بەنـدەیی بـۆ بکات ، چونکە لەلای ئەم بەخشندەوە لەدونیای نەبوون ڕزگاریان بووەو هاتنە دونیای ڕووناك ، هەر یەکێك لەم بوونەوەرانە کەسەرتاپاکەی بەخششی خوایە، وەبەردەوامیش خوا بەخششی بەسەردا دەبارێنێ و سەرپەرشتی دەکات.. بۆیە ئەمانیش بەزمانی حاڵ هەریەکەیان بەجۆرێ و لەشوێنی خۆیدا بەپاکی و بێگەردی ئەم خوایە بەخشندەیە هەڵ دەڵێن و یـادی ئەکـەن .. ئەمەش ڕاستیەکی بێگومانە هەرچەندە ئەم زانینە لـەدەرەوەی زانـینی ئـادەمیزادە ، بـەڵام خوای گەورەو میهرەبان ئەم ڕاستیەی بۆ ئێمە ئاشکرا کردووە وەك دەفەرموێ : ﴿ تُسَبِّحُ لَـهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِـنْ لاَ تَفْقَهُـونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ الاسراء/ ٤٤ .

---

[1] بێگومان ئەمانە گشتی لەسورەتی فاتیحەن و لەنوێژدا دەخوێندرێن ، خۆیـان بەزەمانـە بەسـتوە بـۆنی کۆنیان لێ نایەت ، هەروەها هەموو قورئان ، وەك باسمان کرد جا ئەوەی مانای کۆنەپەرستی ئەداتە پاڵ قورئان و نوێژ کردن ئەوە لەگوێی گایا نووستووە .

واتە: تەسبیحی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی وەئەوەی تیایان دایـە ،وەهـیچ شتێ ئیلا وا لەتەسبیح و ستایشی خوادایە ، بەڵام ئێوە لەچۆنیەتی یادی ئەوان تـێ ناگـەن ، ئەو خوایە زۆر لەسەر خۆو تـاوان پۆشـە ، گـەلێ ئایـەت و پـەردەیان لەسـەر ئـەم راسـتیە هەڵمالیوە هەروەها گەلێ فەرمودەی پێغەمبەریش ( ﷺ ) ئەم راستیە دەردەخات لەمانـە وەك دەفەرموێ } لایسمع صوت المؤذن جن ولا إنس ولا شجر ولا حجر ولا مـدر ولا شـئ الا شُهِدَ له يوم القيامة{ رواه البخاري

واتە هەرچی گوێی لەبانگدەر بێت لەپـەری وە یـا ئـادەمی وەیـا دار وەیـان بـەرد یـا کەشکەخۆڵ یا هەر شتێ ئیللا لەرۆژی قیامەتا شایەدی بۆ ئەدا ، واتە ئـەم شـتانە لـەدونیا هەموو بانگەکەیان بیستووە ، بۆیەش لەرۆژی قیامـەتدا لەلای خـوای رەحمـان شـایەدیان بـۆ دەدەن ..

جابێ باوەڕانی سپلەو هیچ نەزان لەئادەمیزاد و جنۆکە هەرگیز یادی خوا نەکەن ، خـوای گەورە بێ نیازە لەهەموو جیهانیان ﴿ إن الله غني عن العالمين ﴾

رەحمەتی خوا لەدەروونی ئادەمیزادو جیهانەکان دەرکـەوتووەو دەردەکـەوێ .. بـەزەیی و خۆشەویستی دایك بۆ ساواو کۆرپەلە بێ چارەکان ، بۆ ئەوەی ژیـان بەرنەسـەرو لـەژیان بـێ بەش نەبن ، مێینە لەهەر جۆرو سەرەنێ بێ ، بەو پەڕی دڵسۆزی و دڵ بـڕاوی خـۆی فیـدایی بێچووەکانی دەکات ، لەلاواندنەوەو پەروەردەو بەزەیی پیاهاتنەوە بەڕادەیـەکی وا ئامادەیـە گیان و ژیانی خۆی ببەخشێ لەپێناوی پارێزگاری کردنی کۆرپەلەکانی و بەختەوەر کردنیـان ، جا ئەگەر بەزەیی دایك نەبووایە بێچوو پێداویـستیەکانی ژیـانی بـۆ مایـە سـەر نـەدەبوو ، وەئەگەر ئەم بەزەیی و رەحمە نەبوایە ، هەرەوەزی و کۆمـەکی لەناو هەر یەك لەجۆرە رەگـەزە بوە زیندوەکانا دەپچڕاو ژیانیان دەکەوتە گێژاوی تاڵێتی و لەناوچوون ..

ڕێژەی سۆزو بەزەیی و خۆشەویـستی جیایـە لـەنێوان تاکـەکانی هەریـەك لـەجۆرە بـووە زینـدوەکان، بـۆ نموونـە تـا نزیـك تربـێ بـەزەیی و خۆشەویـستی زیـاتر دەبێـت ، وەك خۆشەویستێتی دایك لایەنە کەم و کورتیـەك پـڕ دەکاتـەوە ، کەچـی خۆشەویـستی بـاوك

لایەنێکیتر لەکەم و کوڕی پڕ دەکاتەوە .. وەهەروەها لەبارەی کوڕ و کچ و براو خوشك و خزمانیترو جیرانان ..

ئەمەش ژیان کێش دەکات بۆ ئەو پەڕی بەختیاری و کامەرانی ، سەرەنجامی ئەو رێژانەش بەزەیی بێ پایانی خوایە ئەدرەوشێتەوە لەدروست کراوو بونەوەریدا ..

بەو جۆرەش پێویستە لەنێوان هەر نەتەوەیەکدا ، لەسەر بنچینەی رەحم و سۆز پەیوەندی و هاوکاری یەکتری بکرێ ، نەك ئەو نەتەوانەی کەوا خاوەن سامان و بۆ پێش کەوتوو دەسەڵاتن ، ببنە دڕندە لەگەڵ میللەتانی تری هەژارداو درێخی نەکەن لەچەوساندنەوەیان، چونکە ئەو جۆرە پەیوەندیە واتای بەزەیی و سۆزی مرۆڤایەتی پێچەوانە دەکاتەوە کەواتە ئەو سۆزو رەحمەی سیفەتێکی سروشتی خوایییە دراوە بەئامادەمیزادو پێویستە لەسەر ئەم رێڕەوە بڕوا بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بەگشتی لەسەر ڕووی زەوی برابن و هاوکارو هاو رێبن ، وەرێڕەوی بونەوەر تێك نەشکێنن لەسەر خۆیانا..

## ٢ ـ الرحيم

الرحيم : ناوێکه له‌ناوه جوانه پیرۆزه‌کانی خوا بنچینه‌که‌ی (رحم)ه، واته به‌زه‌یی ، الرحیم واته به‌به‌رده‌وامی به‌خشنده‌یی میهره‌بانه به‌خشنده‌ی خۆی ئه‌به‌خشێ به‌به‌دیهێنراوانی .. له‌سیفه‌تی (ره‌حمان)دا له‌ده‌ریای ره‌حمه‌ت و به‌زه‌یی خواییدا دڵۆپێکمان هه‌ڵێنجاو دیار کرد ، وه‌له‌ئه‌نجامی لێووردبوونه‌وه‌و تێڕوانینێکی ژیرانه ده‌رده‌که‌وێ که‌ره‌حمه‌ت وه‌گه‌ڕخه‌ری ره‌وره‌وه‌ی ژیانه .. هه‌ر به‌دیهێنراوێکی خوا ، له‌چه‌ند لاوه میهره‌بانێتی خوای پێوه دیاره بۆ نمونه وه‌ك له‌م ئایه‌تانه‌دا دیاره که‌ده‌فه‌رموێ : ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى(١)الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى(٢)وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى ﴾ الاعلى ١ ـ٣ .

واته : دووربگره له‌که‌م و کورتی ناوی په‌روه‌ردگاری به‌رزت ، ئه‌و په‌روه‌ردگاره‌ی هه‌موو بووه‌کانی به‌دیهێناوه ـ خلق ـ ئه‌مه لایه‌نه میهره‌بانیه‌ك ، له‌گه‌ڵ به‌دیهاتندا رێکی خستووه ـ فسوی ـ وه‌هه‌ر ئه‌و په‌روه‌روه‌ردگاره رێژه‌ی گونجاوی بۆ هه‌ر بوونێك داناوه ـ قدّر ـ له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش رێنموونه‌یی ژیانی پێبه‌خشیوه ـ فهدی ـ ئه‌مه‌ش لایه‌نه میهره‌بانی ترن .. که‌واته هه‌ر بوونێك له‌چوار لاوه میهره‌بانێتی خوای پێبه‌خشراوه‌و لێی ئه‌دره‌وشێته‌وه ..

زیادبوونی زانیاریمان له‌باره‌ی هه‌ر به‌دیهێنراوێك ـبه‌خشش و میهره‌بانێتی خوای زیاتر بۆ ره‌وشه‌ن تر ده‌کاته‌وه ..

کاتێ که‌سه‌یری سوڕی ژیانی هه‌ر گیان له‌به‌رێك ده‌که‌ین ، ده‌بینین که‌چۆن میهره‌بانێتی خوای گه‌وره خۆی ئالاندووه به‌قۆناغه‌کانی ژیانی ، به‌م تێڕوانینه ئیمان و باوه‌ڕمان وه‌کو گوڵی پشکوتوی به‌هار به‌شنه‌بای به‌زه‌یی په‌روه‌ردگار ده‌له‌رێته‌وه .. خوای گه‌وره به‌خشنده‌یی خۆی به‌سه‌ر هه‌موو ئاده‌میزادێکا ده‌بارێنێ له‌دونیادا جا چ ئه‌هلی خودایی بێ ، چ بێباوه‌ڕو گومڕاو بێ ئاگابێ ، چونکه دونیا له‌لای خوا له‌بزنێکی مرداره‌وه‌بوو بێنرختره ، وه‌ژیانی دونیاش بۆ تاقیکردنه‌وه‌ی ئاده‌می و جنۆکه‌یه ، وه‌کو چۆن هۆڵی تاقیکردنه‌وه له‌بارکراوه بۆ قوتابیانی زیره‌ك و ته‌مبه‌ڵ ، هه‌ر جۆریان په‌ڕاوو پێنووس و شوێن و ئاوو .. و .. هتد وه‌کو

یەك بۆیان ئامادەكراوە ، بەڵام دیـارە لـەكۆتایی هەنـدێكیان ژێـر دەكـەون ، وەهەنـدێكیان سەردەكەون ، جانەم سـەركەوتوانە بـەر میهرەبـانێتی — الـرحیم — خـوا دەكـەون لـەڕۆژی دواییداو وەهەتا هەتایە .. جا ئادەمیزادی ئیماندار كەسـەیری هەریـەك لەبـەدیهێنراوەكانی یـەزدانی پـەروەردگاری دەكـات ، یـەك پارچـە داڕژاوە لـەمیهرەبانێتی خـوا ، وەك چـۆن (تەشبیهی نەبێ) یەكێ هۆنراوەی شاعیرێك بخوێنێتەوە لەبـەر بـەهێزی هۆنراوەكـە ، توانـاو سۆزی شاعیرەكە هێرش بباتە سەر دڵی خوێنەر ئاوەهاش سۆزی خۆشەویـستی میهرەبـانێتی خوا مژدەو مزگێنی دێنێ بـۆ دڵـەی هۆشـیاری ئیمانـدار ، ئـەو سـاكە دڵ بـەیادی خـواوە ئەحەسێتەوە وەكو كۆرپەی ناو لـەیلۆكێ كـەدایكی دەسـتی تیـا هەژانـدبێ ، ئـاواتی حـەق پەروەری سەر لەنوێ دەبوژێتەوەو بەڵێن و پەیمان لەم دڵە بەسـۆزە هەڵـدەقوڵێن بـۆ یـەزدانی میهرەبان ، بەئاواتی بەخشێتی خوا لەڕۆژی خۆیدا ، وەرزگـاربوون لەئەشـكەنجەو ئـازاری دۆزەخ ..

جا چی هەیە دیاردەی رەحمەتی خودای رەحمان و رەحیم نەبێ ، بۆ هۆشیاری خاوەن چـاوی بینین بێ ئەوەتە خوای گەورە بەزمانی فریشتەكانەوە دەفـەرموێ : ﴿ الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُـلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴾ المؤمن / ٧

ئەو فریشتانەی هەڵگری عەرشی خودان وەئەوانەی لەدەورەیـدان تەسـبیحاتی ستایـشی پەروەردگاریان دەكەن و خاوەن ئیمانی تەواون بەپەروەردگاریانـەوە ، وەداوای لێخـۆش بـوون دەكەن بۆ خاوەن ئیمان و باوەڕان بەوەی كەدەڵێن پەروەردگارا فراوانیت داوە بەهـەموو شـتێ بەرەحمەت و زانینا جا ببوورە لەوانەی تەوبەیان كردووە ڕێگاكەی تۆیان گرتووەتەبەر، وەبیـان پارێزە لەعەزاب و ئازاری جەحیم و دۆزەخا .. بەڵێ فریـشتەكان نـەفس پـاك و بێگـەردن و وتار راست و راستڕەون دوورن لە غەوغای ژیان و گوناه و چاوی بینینیـان پـەردەی غیـشاوە دای نەپۆشیوە دڵی بێگەردیان شەیتان هێلانەی تیا نەكردووە ئەوەتە خوای گـەورە ووتاریـان بۆمان دەگێڕێتەوە ﴿ .. وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا .. ﴾ فراوانیـت بەهـەموو شـتێ داوە

بەرەحمــەت و زانیــاری .. بــەڵێ هــەموو شــتێ چ ئاسمــان و زەوی ، چ کەشکەشــانەکان و مەجەرەکان، چ زەوی و ئەستێرەکان ، چ دەریاو دەریاچەکان، چ جۆگەو کانیاوەکان ، چ باخ و بێستانەکان، چ شاخ و چیاو دۆڵەکان، چ دەشت و چۆڵ و بیابانەکان، چ ئاوو هەواو گازەکـان، چ عەقڵ و هۆش و بیرەکـان، چ جۆرەکـانی خـواردن و ڤیتامینـەکان، چ بـەدەن و روخـسارە جوانەکان، ئای چەند زۆرن لەزۆریانا لەژمارە نایەن .

بەڵێ ئەوان راستی دەبینن بۆیە دڵی پاك و بێگەردیان رووەو خوا بەدوعاو نزاوە بۆ خاوەن باوەڕانی تەوبەکار لەگەڕدایە .

ئازیزان .. خۆشەویستان :

هەروەها خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُـسِكُمْ أَزْوَاجًـا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم / ٢١

لەنیشانەو ئایاتەکانی خوای گەورەیە کەبۆ ئێوەی بەدیهێناوە لەنـەفس و گیـانی خۆتانـا هاوجووتی بۆ ئەوەی دڵگیرو ساکن بن پێیەوە ، سەرەڕای ئەمـەش لەبـەینی ئێـوەی گێـڕاوە سۆزو خۆشەویستی و رەحمەت بەڕاستی لەم هەموو دیاردانە نیشانەو ئایاتی زۆرن بـۆ گـەلێ بیروهۆشی خۆیان بەکارخەن ..

بەڵێ زۆرجار هێرشی توڕەیی و دڕندەیی لافاوێ هەڵ دەستێنێ لـەدەروونا بـەهۆی فـووی شەیتانەوە، ئەگەر ئەو ڕەحمەی خوای گەورە بەری لێ نەگرێ کەوەکو سروشت و دیاری داویـە بەئادەمیزاد، لەوانەیە هاوجووتەکەی خۆی هەپرون بەهەپرون بکـات، یـا تێکـی وەرشـێلێ، وەیان ژیانی لێ لەنگ و تاڵ بکـات، و بـەدەنی جـوانی لێ ناشـیرین بکـات ، ئـەی خوایـە خۆشەویستەکەمان چەند میهرەبانی گشت شتێکت بەمیهرەبانی بەخشیوە بەئێمە، هەر تـۆی رام و موسەخخەرت کردووە بۆ ئێمەی ئادەمیزاد بەهەرچی لەئاسمان و زەوی نێوانیـان دایـە،

وەکو دەفەرموێ : ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ .. ﴾ الجاثية / ١٣ .

بۆ ئێوەم رام و موسەخخەر کردووە بەهەرچی لەئاسمانەکان دایەو وەبەهەرچی لەزەویدایە هەر گشتیان بەڵی هەر گشتیان .

ئازیزەکانم خۆشەویستان :

خوای گەورە کەخۆی رەحیم و رەحمانە وەبەخشندەو میهرەبانە، خۆشی لەوەدێ کەئێمەش ئەو سیفەتە بکەینە کاڵاو باڵای خۆمان ، وەرەحم و بەزەییمان بەگیانی خۆمان و غەیری خۆمان بێتەوە ، بۆیە ( رحمة للعالمين )یشی بەئێمە بەخشیوە کەپێغەمبەری خۆشەویستمانە، کەلەئاستیا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ ﴾ واتە رەوانەمان نەکردووی تەنها بەرەحمەت نەبێ بۆ گشت جیهانیان .. جا کەخواکەمان رەحمان و رەحیم بێ وەپێغەمبەرەکەمان (رحمة للعالمين) بێ وەکیتابە پیرۆزەکەمان نامەو مەنهەجی رەحمەتی رەببانی بێ، وەرن بائێمەش مەردی خودابین لەگەڵ یەکا خاوەن بەزەیی رەحمەتی فراوان بین تا لەگەڵ (رحمن الرحيم) ئاشنا بین، تا لەناو کۆمەڵەی رەحم پێکراوا بین .

پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ : } الرحمن يرحمهم الرحمان ارحموا من في الارض يرحمكم من في السماء { .

واتە خودای رەحمان و رەحیم رەحم بەخاوەن رەحمان دەکات جا رەحم کەن بەوانەی لەسەر زەوین رەحمتان پێدەکات ، هەروەها دەفەرموێ : من لايرحم لايرحم .. ئەوەی رەحم نەکات رەحمی پێ ناکرێت ..

ئەی خودای بەرەحم و بەزەیی لەدەریای رەحمەتی بێ سنورت برژێنە بەسەر کوردستانی دڵ بەبرینم بەسەر دنیای سەر لێشێواوو رەشبینم هەر دەرگای رەحمەتی تۆیە شك دەبینم .. ربّنا اغفر وارحم وانت خير الراحمين ..

ئیمان بەم زاتە پاکە بێ وێنەیە راستیەکە پێویست بەبەڵگە ناکات وەهەست و شعور دامەزراوی لەڕاست ئەم صیفەتەی پەروەردگار، شیفا بۆ دەیان نەخۆشی دەروون دێنێ ژیان خۆش و بەلەزەت دەکات نومێدو هیوای خاوەن باوەڕ دەبوژێنێتەوە وەلەڕەش بینی و بێ نومێدی و بێ هیوی‌و رزگاری دەکا . ئەوەی جێگەی سەیرو موعجیزەی غەیبیە ئەوەیە کەهیچ شتێ جێگەی ئەم باوەڕە پڕ ناکاتەوە لەدەروندا ، عەقڵ و فیطرەو عیلمیش شایەدی بۆ دەدا ، کاتێ نەفسی لەخوا بێئاگا کەمێ هۆشی بووە هەستی پەشیمانی و داماوی دەبزوێ نارەحەتی دایدەگرێ لەئەنجامی کاری ناهەمواری رابردووی جا کاتێ کەهاتە پێشەوەو بیستی ئاوازە خۆشەکەی ﴿ ..لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ الزمر/٥٣ .

بێ هیوا مەبن لەڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە بەڕاستی خوای گەورە لەگشت گوناهان دەبوورێ، ئەگەر خاوەنەکەی تەوبەو پەشیمانی بکا بەکاڵاو باڵای، جا بەم ئاوازە خۆشە وەکو یەکێ مزگێنیەکی زۆر گەورەی بۆ هاتبێ و خۆشی و کامەرانی بگرێتە باوەش، نومێدو هیوای ببوژێتەوە ، ئاوا سەرگەرمی و دڵسۆزی و هاتنە پێشی کارو پیشەو ئاوات دەبێ، کەئاوازە خۆشەکەی تری بیست کەیەك پارچە نوورو رەحمەت و هیدایەتە لەژێر سێبەری ئەم ووشانە رەنگ دەداتەوە کەتیێدا دەفەرموێ ﴿ فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴾ الفرقان / ٧٠

بۆ ئەو جۆرە کەسانەی وان لەدەرگای رەحمەتی میهرەبان بەتەوبەکاری‌و پەشیمانی ، ئەوە میهرەبان کارە ناهەموارەکانیشی بۆ بەچاکە دەگۆڕێتەوە، شان و شکۆو لێبوردەیی ئەم زاتە لەم سنورە بەدەرترە لەژیرو بیری ئادەمیزاد پێی بکات و تێی بگات و لێی حاڵی بێ، جا ئەم نەفسە لەگەڵ ئەم ئاوازە پڕ میهرەبانێتی‌یە دونیای خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی‌و بەختیاری بۆ دەخاتە سەر گازی پشت ، لەلایێ لەشەرمی پەروەردگاری چین چین تەوژمی بارانی رەحمەت لەنوکی پێیا دەست پێدەکا لەتەوقی سەریا دەچێتە دەرەوە، لەگەڵ هەرچینە تەوژمێ رەنگێ دێنێ و رەنگێ دەبا لەبازاڕی رەنگا بازاڕی (یعرف المجرمون بسیماهم ) بەجێ

دێڵێ و بۆ بازاڕی (سيماهم في وجوههم من اثر السجود) بار دەکا، ئای چەند خۆشی گشت هۆشیارانی بێدار، تامی تۆیان لەبیر نەچۆتەوە ، وەلەلایێ تر ئەم هیواو ئومێدی بوژانەوە بۆ بەرزی ئەم پیرۆزییە، بۆ دۆستایەتی و جیرانێتی ئەو رەحمان و رەحیمە، بۆ بەهەشتی پڕ نیعمەتی نەبڕاوەی لەبن نەهاتوو، بۆ رزگاری لەو سەرەنجامە ترسناکەی کە بەرۆکی چارەنووسی ئادەمیزاد دەگرێ، هەموو میحنەو موصیبەتێکی لابچوك دەکاتەوە، هەموو ناخۆشی و ناڕەحەتیەکی ژیانی سادەو ساکار دەکا، وە دەیان نەخۆشی نەفسی و دەروونی شیفا دێنێ خۆی تێدا دەناسێتەوە پێش و پاش و ژێر پێی خۆی پێ دەکەوێتەوە ئاشنایی خەیاڵ و بیری دەبێ ﴿..يَاحَسْرَتَا عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ.. ﴾ الزمر / ٥٦ .

داخی گرانم لەسەر ئەو هەموو کات و ژیانەم کەبەفیڕۆ چواند لەڕاست خوای گەورە..

ئازیزان .. خۆشەویستان : رەحمەت و بەزەیی خوای گەورە وەکو بەماددیات گشت لایەکی پڕ کردۆتەوە ئاواش گشت لایەنە مەعنەوی و غەیبیەکانی‌دا راگرتووە ، ئازیزان جێگای سەرەنج راکێشان وپرسیار کردنە لەنەفسێ کەکەوتۆتە گێژاوی غەفلەت و بێئاگایی وەخەریك بوون بەکاری لاوەکی و لاسایی !!

ئەی نەفس تۆ وا لەسەر زەوی خوا دەڕۆیت سەیری ئاسمانی خوا دەکەیت هەوای خودا هەڵ دەمژیت ئاوی خوا دەخۆیتەوە ، جا چیت هەیە ئی خوا نەبێت ، هەر بەلای ئەویت و بەلای ئەویشا دەگەڕێیتەوە چی وای کردووە ئاوا نوستوی، لەخوای خۆت بێخەبەری کردوویت!! ، بەڕاستی خوای گەورە حەقیەتی کەدەفەرموێ :

﴿ يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ(٦)الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ (٧) فِي أَيِّ صُورَةٍ مَاشَاءَ رَكَّبَكَ ﴾ الانفطار.

ئەی ئادەمیزاد چی وای کردووە کەلات بدا لەپەروەردگاری بەڕێزو خۆشەویست، ئەو زاتەی بەدیهێناوی و خەلقی کردووی، رێکی کردووی تەعدیلی کردووی، لەو وێنەیەی کەحیکمەت و دانایی خواستبی تەرکیبی کردووی ..

ئازیزان خۆشەویستان : ئەم صیفەتە دڵخۆشکەرەی هۆشیاران کەرەحمان و رەحیمە، لایەنی ئیجابی زۆری تیایە گەر زۆرێکیشی لێ باس بکەین ، ئەوە زۆرێکیش لەدەرەوەی زانست و

زانیاری ئادەمیزادە . هەست کردن بەسیفەتی رەحمانێتی خودایە لافاوی خێرەت و ئازایەتی لەدەروونا هەڵ دەستێنێ بەرامبەر بە سەرکەشانی ستەمکارانی خوانەناس لەئەنجاما تەخت و بەختیان تێك دەشکێنێ، هەزاران ستەم دیدەو لێقەوماوان رزگار دەکاو کۆت و زنجیران دەپسێنێ ، هەستی شۆڕش گێڕێتی و ئازادی خوازیان بۆ دێنێ، یەکێ رەحمی خوای لەسینەدابێ هەرگیز بەوە رازی نابێ تاغووت و فیرعەونێ خۆی لەخەڵك بکات بەخواو یاری بەماڵ و نامووس و چارەنوسیان بکاو عیززەت و کەرامەت و سەربەخۆییان تێك بشکێنێ و تووشی بەندایەتی هەواو ئارەزووی خۆیان بکات ، چونکە خودای بەخشندە بەئازادی خەڵکی بەدیهێناوە، وەکو دیاری و بەخششێك ئەو ئازادییەی پێبەخشیوە، تەنانەت بەزۆری زەبری ناچاری ناکا بەوەی ئەو بپەرستێ چونکە زۆری و زەبری سیفەت و کاری خوا نیەو لەگەڵ مانای (إله) خوایەتی یەك ناگرێتەوەو، لەگەڵ خوایەتی خوا ناگونجێ ، خودا ئازادی پێخۆشە بۆ هەموو کەسێ ، جامادام خوای گەورە ئەو هەموو بارە نیعمەتەی بەئێمەی داوە و بەکۆل قەرداری ئەوین و سەرەڕای ئەوەش ئازادیمان لێ زەوت ناکات بەڵکو بەپێچەوانەوە ئازادی پێداوین و داوای ئازادیمان لێ دەکات، جا چۆن حەلاڵە یەکێ تر ئازادیمان لێ زەوت بکاو بەناحەق بمان کات بەبەندەی خۆی ، نەخێر بۆ کەس حەلاڵ نیە وەحەلاڵیش نابێ ..

بەڵێ بۆیە ستەمکارە دونیاخۆرەکان هەوڵ دەدەن سەر لەخەڵك بشێوێنن لەخوای خۆیان بڕەنجێنن تاکو خەڵك بێ رەحم بێ لەئەنجامدا بێغیرەت بێ تا ئاغایەتیەکەی وان سەربگرێ ، نازانن خەیاڵ پڕاوی دەکەن لەوەی ئازادی خەڵك زەوت دەکەن ، سەرەنجام حاڵی دەبن کاتێ پڕچاویان خۆڵ دەکەن .. ﴿ أَلَمْ نُهلِكِ الأولينَ ثُمَّ نُتبِعهُمُ الآخرين كذلكَ نفعَلُ بالمُجرمين﴾ المرسلات: ١٦-١٨ .

ئازیزان خۆشەویستان : خوای گەورە رەحمی چاندووە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزاددا ، فیطرەو بوونی ئەم شاهیدی و گەواهییە دەدات ، ئەگەر لەبەر ئەم رەحمەی خودا نەبوایە ژیان هیچ تامی نەدەبوو خۆشەویستی بێ روح و گیان دەبوو ، ساواو بێچوو بێ خزمەتگوزار دەبوو، زەویش جۆراو جۆر خواردنی نەدەڕواند، ئاسمانیش بارانی نەدەباراند، ئاویش تینواتی نەدەشکاند، روح و لاشەو بەدەنەکان لێك دەترازان، هۆش و بیرو فامەکان ئاڵۆزدەبوون،

ڕێچکەی وەچەی گشت زیندووان ماتڵ دەبوون، بەڵام بەزەیی و ڕەحمەتی پەروەردگارا هەموو شتێکی لەشوێن خۆیا، بەحیکمەت و داناییەوە داناوە، تاکو بن بەئایات لەسەر گەورەیی و تواناداری میهرەبان، تاکو بەشێ لە(إقامة الحجة) تەواو بکەن لەسەر ئادەمیزادو جنۆکە . تاکو ئالآی ڕەحمان و ڕەحیمێتی خوای گەورە هەڵگرن و بەرزی کەنەوە ، جا چ شتێ هەیە مانای ڕەحمانێتی خوای گەورەی تیا دیار نەبێ ، بەزمانی حاڵ وەصفی ڕەحمان و ڕەحمێتی خوای گەورە نەخوێنێ ؟

ئەی خوای گەورە ئەی میهرەبان تۆ ڕەحمەتت زاڵە بەسەر غەزەبتا ، تۆ هەموو شتێکت داگرتووە داپۆشیوە بەرەحمەت، تۆی حەز دەکەی ڕەحمەتت ببەخشێنی بەسەر بەندە، ئەوا ئێمەش ڕوومان کردە دەرگای ڕەحمەتی تۆ ، وەك سواڵکەرێ دەرگای بەر ڕەحمەتت بەرنادەین ، دەرگای بەر ڕەحمەتت بەرنادەین ، دەرگای بەر ڕەحمەتت بەرنادەین ..

## ٣ ـ الـمـلـك

الملك : ناوێکه لەناوه پیرۆزەکانی خوا (١١) جار لەقورئانا هاتووه کەتەنها لەپێنج شوێنا مەبەست خوایه ، واته پاشای هەموو پادشایانەو دەستی بەسەر هەموویانا دەڕواو کەس نیـه دەستی بەسەرا بڕوا ، بەم پادشاییەتیه وه کارگوزاری بەدیهێنراوەکانی دەکات و پـشتیوانیش لەکۆمەڵی ئیمانـداران دەکـات ، جـا ئیمانـداران پـشت ئەسـتورو بـەهێزن بەپـشتیوانەکەی خۆیانەوه، پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ خوای گەورە فەرمویەتی: } یاابن آدم لاتخفنَّ من ذي سلطان مادام سلطاني باقياً وسلطاني لاينفد ابداً {..

واته : ئەی رۆڵەی ئادەمی نەترسـیت لـەهیچ خـاوەن دەسـەڵاتێ مـادام دەسـەڵاتی مـن لەئارادایه، وەدەسەڵاتی منیش هەربەردەوامە هەتا هەتایه شەکست نـاهێنێ .. پادشـایەتی ئەم بەخشندەیی میهرەبانە یەك پارچە دادپـەروەرێتی و حـەق پەروەرێتییـە ئەمـەش لـەژێر زانایەتی و دانایەتی بێ پایانیەتی ، وەهیچ بەدیهێنراوێ نیە ئیللا وا لەژێر پادشـایەتی ئـەو زاتەدایه ..

ئەمانە هەندیك لەو ئایەتانەن کەناوی (الملك)یان تیا هاتووه :

﴿ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ ..﴾ طه / ١١٤

گەورەیی و بەزەیی و شکۆمەندی بۆ ئەو خودایەیە کەمەلیکێکی حـەق و دادپـەروەرە .. بەڵێ خوای گەورە وەکو ئادەمیزاد نیە لەهیچ روویەکـەوە بەتایبـەتی لـەڕووی مەلیکایـەتی دادپەروەریەوە ، ئادەمیزاد خاوەنی نەفسێکی هەمیشە فەرمان دەرە بەکاری ناهەموار وەکـو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إن النفس لأمارة بالـسوء ﴾ سورەتی یوسف ، وەلەهەمان کاتیـشا لەڕووی زانیارییەوە کەموکوڕی هەرگیز تەواو نابێ وەلەڕووی ژیـری و عەقڵیـشەوە هـەرگیز ناگات بەچڵە پۆپە ، هەرچەند ئاسۆکەی فراوان کـات هـەر کـەموکورتی تیایـە، وەغـەیب و نادیار نازانێ ، لەسەرووی هەموشیانەوە شەیتان کـارە چـاك و خراپـەکانی لێ دەگـۆڕێ وە لێڵـی دەکـات ، بۆیـە ئـەم ئـادەمیزادە کـاتێ کـەدەوری مـەلیك بەسـەر هەنـدێك

لەمەردوومەكانەوە دەبينىٚ لەدەستىيەوە دەكەونە نارەحەتيەوە دادو فيغانيان لىٚهەڵدەستىٚ ، مەگەر ئەو نادەميزادەی خوا رەحمی پیٚ کردووە زاڵـە بەسـەر نـەفس و شـەيتانی، لەهـەمان كاتيشا زانياری و عەقڵ و ژيری خۆشی بەرەو ئاسۆی روناك هيٚنـاوە ، بـەئيمان و سـيقەبوون بەخواو بەرنامەكەی، جا ئەم جۆرە ئادەميزادانە هەر خوای گەورە بەمەليكی حەق دەزانـن و خەليفايەتی ئەو دەكەن لەسەر زەوی و وەخۆيان هەر پیٚ بەندەيە ، گوێڕايـەڵی فەرمانـەكانی ئەو دەكەن، خوای گەورە خاوەن نەفسيٚكی وەكو ئينـسان نيـە بـەڵكو لەسـەر نەفـسی خـۆی رەحمەت نوسيوەو ستەم و زوڵمی لەسەر نەفسی خۆی حەرام كردووە هەروەها لەڕووی زانيـاری و عەقڵ و ژيری يەوە بەهيچ شيٚوەيیٚ كەم و كوڕی نيەو ڕووی تیٚ ناكـات وەشـەيتانيش بـۆی نيە بتوانیٚ كاری چاك و خەراپ لەخوای گەورە تيٚك بشيٚويٚنیٚ و ليٚلی بكـات .. جـا بەمـەوە هيچ كۆسپ و تەگەرەيیٚ نيەو نابیٚ و لەرێگەی مەليكايەتی دادپەروەريٚتی خوای گەورەوە .

ئازيزان خوای گەورە لەسورەتی المؤمن ئايەتی (١١٦)دا دەفـەرمویٚ ﴿ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾

بـەرزی و شـكۆمەندی بـۆ خـوای گەورەيـە كەمـەليكيٚكی حـەق و دادپـەروەرە وەهـيچ پەرستراویٚ نيەو وەهيچ مەليٚكی نيە تەنها خۆی نەبیٚ وەخـۆی بەڕيٚوەبـەرو خـاوەنی عەرشـی بەڕيٚزو گەورەيە كاری بیٚهودەو دانايی ئـەنجام نـادات ، هـەروەها خـوای گـەورە لەسـورەتی حەشردا لەئايەتی (٢٣) دا دەفـەرمویٚ ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِـكُ الْقُـدُّوسُ ..﴾ خوای گەورە ئەو زاتەيە كەهيچ پەرستراویٚ نيە تـەنها خـۆی نـەبیٚ كەمـەليك و قـوددوس و پيرۆزە .. ئەوەی شايانی باس بـیٚ خـوای گـەورە خـاوەن هـەمو سيفەتە پاكـە جوانەكانـە وەسيفەتەكانی هاوشان و هاوڕێك و هاوپەيوەستن بۆ نمونە خوای گەورە مەليكە كەپەيوەسـتە لەگەڵ دەسەڵاتی بیٚ سنوری و خاليقيٚتی و دادپەروەريٚتی هەروەها حەكيمە لەپاڵ زانياری بـیٚ سنورو خەبيریٚتيەوە وە رەحمان و رەحيم لەپاڵ دەست رۆيشتنی و دەوڵەمەندی بـیٚ سـنوری و سەخاوەتيەوە .. خوای گەورە لەسورەتی جومعەدا لەئايەتی يەكەمدا دەفەرمویٚ : ﴿ يُـسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ الجمعە/١.

تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات هەرچی لەئاسمانەکان دایەو هەرچی لەزەویدایە، ئەو خوایەی کەمەلیك و پادشایە قودوس و پیرۆزە ئازیزو شکۆمەندە حەکیم و داناو کارزانە .. بەڕاستی و بێگومان خوای گەورە شایستەی خۆیەتی هەمموو شتێ تەسبیحاتی ئەو بکات ، بەتەسبیحاتی ئەوەوە هەمموو شتێ شایستەی بوون و مانەوەیەتی لەعالەمی مەوجودا .. تەسبیحاتی ئەوە ئادەمیزادو پەری دەگەیەنێتە پایەی بەرزی و پیرۆزی ، هاوڕێك و هاوبیرو باوەڕی دەکات لەگەڵ هەمموو کەون و بوونا ، لەدونیای وێڵی و سەرگەردانی فریای دەکەوێ و رزگاری دەکا بۆ دونیای هیدایەت و هەمیشە بەختیاری .. خوای گەورە لەسورەتی (الناس)دا بۆمان رون دەکاتەوەو ئاشکرای دەکات کەهەرخۆی بەڕێوەبەرو کارگوزاری مەردووم ئەنجام دەدا، وەهەر خۆی مەلیك و پادشای خەڵك و مەردوومە، وەهەرخۆی پەرستراو ئیلاهی خەڵك و مەردوومە، وەهەرخۆی شایەستەی ئەوەیە پەنای خەڵك و مەردووم بدا، وەکو دەفەرموێ :
﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ(١)مَلِكِ النَّاسِ(٢)إِلَهِ النَّاسِ ﴾ الناس/١ـ٣.

ئازیزان : ئیمان و باوەڕ بەزاتی خوای گەورە کەمەلیك و پادشایە راستیەك و حەقێکی دامەزراوە، ئەم ئیمانە کرۆکەی هیدایەت ڕێنومایی خواییە، وەرزگاربوونە لەوێڵی و گومڕایی .. حاڵی بوونە لەپلەو پایەی خوای گەورە، وەلەپلەو پایێتی ئادەمیزادا لەدونیای بەندایەتیدا ئەم هەست و نست و باوەڕە کاریگەرێکی یەکجار گەورەی هەیە لەدەروونی ئادەمیزاد ، ئەم کاریگەریە لایەنە ئیجابی یەکجار زۆری لێ دیتە کایەوە، جۆرو چەندێتی لایەنە ئیجابیەکان بەستراوەن بەڕاددەی پلەی ئیمان و باوەڕ بەمەلیك و پادشایێتی ئەم خوایە گەورەیە ..

لەلایەنە ئیجابیەکانی ئەم هەست و نست و باوەڕەیە، کەئادەمیزاد رزگار دەکات لە هەڵوێستی ناهەمواری نەفسی ئەمارەو پێشنیاری پووچەڵی نابەجێی شەیتان و، کەوتنە سەر رێگای هیدایەت و حاڵی بوون لەپلەی کەسایەتی ئادەمیزاد لەدونیای بەندایەتیدا، وەهەست کردن بەخاوەنێتی، لەناو گێژەڵوکەی ژیانداو، ئەمەش خۆی لەخۆیدا شیفای چەندین نەخۆشی نەفسی و دەروونیە، چونکە ئەم خاوەنەی کە ئەو ئیمانی پێیەتی هەم مەلیکەو

هەم پادشایە هەم دادپەروەرەو هەم رەحمان و رەحیمە هەم عـەزیزەو هـەم حـەکیم و کارزانـە وەهەروەها .. لەباقی سیفەتەکانی بەرزی تری .

ئەم ئیمانەیە عەزم و جەزمێکی پۆڵاینی لـەدەروونی ئـادەمیزاددا دەڕوێـنێ لەمەیـدانی خۆگری و تێکۆشانا کەبەهیچ شێوەیێ وەسوەسەو پێشنیارەکانی شەیتان نـاتوانێ ڕیـشە لـەم دەروونە داکوتێ، وەناتوانێ هەیبەت و سامێکی درۆینەو نالەجێی سـتەمکاری چـۆکی پـێ شل بکاو عەزم و جەزمی پێ بلەقێنێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئیمانی بۆ زیاد دەکاو چـروکی و بێ نرخی و بێهێزی ستەمکارانی زیاتر بۆ دەردەکەوێ و بۆ روون دەبێتـەوە .. وەکـو خـوای گەورە لەو وەسفەی ئیماندارانداا لەسورەتی الاحزابدا دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّـــا رَأَى الْمُؤْمِنُـــونَ الأَحْزَابَ قَالُوا هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا ﴾ الاحزاب / ٢٣ .

لەو کاتەی کەئیماندارەکان ئەو ئەحزابانەیان دیت کەبەمەبەستی لـەناوبردنی پێغەمبـەرو یاوەرەکـانی هـاتبوون، بەوپـەڕی عـەزم و جەزمـەوە ووتیـان ئەمەیـە وادەکـەی خـواو پێغەمبەرەکەی بەڕاستی خواو پێغەمبەر ڕاستیان فەرمووەو وادەیـان بەجێیـە ، ئـەو کاتـە تەنگانەو دژوارە هیچی بۆ زیاد نەکردن تەنها ئیمان و باوەڕ نەبێ لەگەڵ گوێڕایەڵی و متمانە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، کەچی دڵ نەخۆشەکان بەپێچەوانە بیریان دەکردەوە، لەڕاستیدا ئـەم ئیمانە ئازایەتی و جەسوریی لەدەروونا دەڕوێنێ کەئەویش بەرهەمەکەی ئیمانە ، شایەستەی خۆیەتی گەلانی چەوساوەو ستەم لێکراو رووی تێبکەن و خۆیانیان پێ ئازادو بەختەوەر بکەن

جا خوای گەورە ئەم ئیمانەی بەبەخـشش و رەحمـەت نـاردووە بـۆ ئـادەمیزاد بەگـشتی، وەهەرکاتێ بیکەن بەچەکی دەست و دڵیان ئەوە خوای گـەورە سـەرفرازی هـەردوو دونیایـان پێدەبەخشێ ، وەکو لەم ئایەتەدا ئەم راستیانەی تێیدا رەوشەن و ئاشکرایە .. ﴿ وَنُرِيـــدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمْ الْوَارِثِينَ ﴾ القصص / ٥ .

خوای گەورە دەفـەرموێ دەمانـەوێ نیعمـەت و منـەت بخەینـە سـەر چەوسـاوەو سـتەم لێکراوان بەوەی کەسەریان خەین لەسەر زەوی، وەبیان گێڕین بەپێشەواو خـاوەن دەسـەڵات و شکۆمەندی ، ئەوە جێگەی سەیرو موعجیزەیە هیچ شتێ و هیچ هەست و بیرێ جێگەی ئـەم باوەڕە پڕناکاتەوە لەواقیع و دەروونی ئادەمیزاددا، ئەمەش نیـشانەو ئایـەتێکی درەوشـاوەیە لەسەر ئەوەی ئەم بیروباوەڕە هەدیەو رەحمەتی خوای گەورەیە بۆ ئادەمیزادەکان .. وەکو خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیا داوامان لێدەکەن بەرەو ئیمان بین، بەڕاستی و پیرۆزی شـادمان ببین و وریای شەیتان و شەیتان سیفەتان بین لەهەمان کاتیشا بوون و فیطرەش هـەمان داوات لێـدەکات وەشـایەدی دەدات لەسـەر سـیفەتانی بـەرزی پـەروەردگار، لـەم سـیفەتانەش مەلیکایەتی ...

خوای گەورە لەو مەلیکایەتیەی خۆیدا خاوەن یاساو نیزامە ، وەهەموو شتێکی بەیاسـاو نیـزام نەخـشاندووە، وەخـاوەن سـوونەتی نـەگۆڕە لـەم کەونـەدا ، بـۆ هـەموو مـەخلوق و گیانلەبەرێ سەرەتاو کۆتایی بۆ بڕیارداوە ، وەکارێکیشی بێ حیکمەت و دانایی نیـیەو نـابێ ئەگەر سەریشمان لەکارەکانی دەربچێ یا دەرنەچێ .

لەعبداللە ی کوڕی ئیمامی عومەرەوە دەگێڕنـەوە کەپێغەمبـەر – ﷺ – فەرموویـەتی لەرۆژی قیامەتا خوای گـەورە ئاسمانـەکان دەپێـچێتەوە بەدەستی راسـتیان دەگـرێ پاشـان دەفەرموێ : أنا الملك أين الجبارون أين المتكبرون ، پاشان زەویەکان دەپێـچێتەوە بەچـەپیەوە دەفەرموێ : أنا الملك اين الجبارون اين المتكبرون .

کوانێ ئەو ستەمکارانەی خەڵکیان ژێر پێدەخست و دەی چەوساندنەوە ، کوانێ ئەو لوت بەرزو موتەکەبیرانەی هەواو ئارەزووی خۆیانیان دەپەرست ، دیـارە بێگومـان هـیچ وەڵامـی لەهیچ لاوە نیـیە[1] .

ئازیزان الملك یا ملیك یا مالك هەمووی یەك مانا دەگەیەنێ بەمانای خاوەن دەسـەڵات و سامان و موڵك و خاوەن هێزو شکۆمەند ، جا هەرچی لەبووندایە لـەم بوونـەوەرو کەونـەدا ،

---

[1] تاج ،ج٥ ،ل٣٦٧.

لەکەشکەشان و مەجەرەکان، لەکەوکەبی زەوی و ئەستێرەکان، وە بەوەی لەزەوی‌دایە لەچیاو کێو شاخەکان، لەدەریاچەو بەحرو روبارەکان، لەجۆگەو کانیاو بەستەکان، لەدەشت و چۆلّ و بیابانەکان، لەباغ و بێستان و دارستانەکان، لەمەردووم و جنۆکەکان، لەفریشتەو مەلەکەکان، هەر گشتیان لەگیانداران و بێگیانەکان لەزەردو سپی و سورەکان لەنوێو نزم و بەرزەکان هەر گشتیان مولکی خودان ، کەسێ نیە خاوەنی قتمیرێ بێ وەکو خوای گەورە لەسورەتی فاطر ئایەتی (١٣) دا دەفەرموێ : ﴿. وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ ﴾ فاطر / ١٣ .

وەکەسێ نیە هاوشانی بێ یا شەریکی بێ یاخاوەنی نەقیرێ بێ ، هەر خۆی خاوەن هەر خۆی صاحێب هەرخۆی پادشا هەر خۆی مەلیك ، ئەمرو فەرمانی جاری دەبێ بەسەر هەموو بووەکانی ، کەسێ نیە ئەمری بڕوا یا فەرمان بکا بەسەر خودای گەورەو میهرەبان ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلاَ نَصِيرٍ ﴾ البقره / ١٠٧ .

ئەو پادشایە هەر خۆی تەصەروف دەکا بەسەر بەدیهێنراوەکانی بەو پەڕی حیکمەت و دانایی و زانایی‌یەوە وەهەموو کارەکانی بەوپەڕی کارزانی‌یەوە ئەنجامی دەدا .

مەلیکایەتی هەر لەخۆی دێ ، هەر خۆی کەموکوڕی بەسەر نایێ هەر مەلیك بووەو هەر مەلیکیش دەبێ ، مەلیکایەتی ئەو خوایە ڕوو لەفەناو کەموکوڕی ناکات ئەگەر لەدەروازەی فیطرەوە هەندێ زانیاری لێبقۆزینەوە زیاترو باشتر گەورەیی ئەو پادشایەمان بۆ دەردەکەوێ بۆ نمونە ، ئەگەر بێت و ووردبینەوە لەبەسەرهاتی حەزرەتی (یونسی کوڕی مەتێ) واتە نەبی یونس (علیه السلام) بەڵێ ئەو نەبی یونسەی کەوا ئێستا گۆڕی مویارەکی والە موصلایە یا لەنەینەوایە، کاتێ کەصەبرو ئارامی نەگرت لەسەر گەیاندنی پەیامی خودا، بێ ئەوەی ئەمری خوای بۆ بێ کۆچی کرد ، بەمەوە کەوتە بەر عیتابی خوای گەورە سەرەنجام خۆی لەناو زگی نەهەنگەوە (حوت) دیتەوە .

دیاره کەسێ نیە پەنای بۆ بەرێ خودای گەورە نەبێ بۆیە لەقوڵایی دڵەوە بەوپەڕی قەناعەت و ناوجەرگەی فیطرەوە لەبەر خوای گەورە پاڕایەوەو ناڵایەوەو ووتی ﴿ لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظالمين ﴾ واتە هەر تۆ تاکە پەرستراوی تاکە مەلیکی هەر تۆ خاوەن گشت شتی، پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە، من بووم لەستەمکاران .. بەڵێ ئەم بەسەرهاتە خوای گەورە بۆمانی دەگێڕێتەوە لەقورئانی پیرۆزدا ..

کاتێ لەناو زگی نەهەنگ دایە، مەشغەڵەت و غەوغای دونیا بەرۆکی بەردایە، ئەوە بەفیطرەی پاکەوە، رووەو خوای گەورە دەناڵێتەوە، دەیسەلمێنێ هەر تۆی ئاگادار بەحاڵم، کەهەردەم ئاگاداری بەهەموو شتێ، هەر تۆی نوسکەمت گوێ لێیە، بالەبن بەحرو ناو زگی نەهەنگیشبێ ، شتێ نیە بتوانێ دەنگێ لەتۆ بشارێتەوە ، هەر تۆی چاوی میهرەبانیت لێمە بالەبن دەریابێ و بالە ناو زگی نەهەنگیش بێ ..

هەر تۆی خاوەن ئیرادەو ویستی بەسەر بەدیهێنراوەکانت گەر خواستت لێ بێ رزگارم دەکەی . کەسێ نیە خواستی تۆ بەرپەرچ داتەوە ، هەر تۆی فەرمانت جاری دەبێ بەسەر هەموو بوێ، وانیوچاوانیان بەدەستی تۆوەیە، گەر نەهەنگی بن دەریاکانیش بێ، سەرەنجام خوای گەورە نزاو دوعاکەی گیرا کردو رزگاری کرد بەلای سەد هەزارو زیاتریش کەلەولاوە خوای گەورە بەبەرەکەتی دوعاو پەشیمانی تەوبەیان هیدایەتی دابوون، نەجاتی دان لەو غەزەب و عەزابەی کەڕووی تێکردبوون ..

جاخوێنەری خۆشەویست قەناعەتت بێ ئەگەر من و تۆش بکەوتباینە ئەو مەوقیعەو مەوقیفە هەر پەنامان بۆ خوا دەبرد، لەبابی فیطرەشمانەوە بۆمان دەسەلما کەهەر خوای گەورە ئیرادەی جارییە بەسەر مەخلوقەکانی هەر خوای گەورە گوێی بیستنی لەهەموو دەنگێکایە، لەهەر شوێنێ بێ، هەر خوای گەورە چاوی بینای لەهەموو شوێنێکایە، پەردەو حاجزێ نیە بەرچاوی بگرێ، هەر خۆی دەستی قودرەتی وا بەنیو چاوانی گش مەخلوقێکەوەیە، کەواتە هەر خۆی مەلیکە هەر خۆی پادشایە ، مەلیکایەتی هەر لەخۆی دێت ، زۆرێك لەنەفسەکان لەمێژوودا لەداهاتوودا هەریەکەیان ووتویەتی و دەڵێ منیش

مەلیکم ، ئەوەنیە دەسەلاتێکم هەیە و خاوەنی چەند مولکێکم، سواری زۆر چاك و كۆشـك و باڵەخانانی زۆرم هەیەو خەلکێکی زۆرم لەژێر دسەتەو خاوەن جۆگاو کانیـاوم، خـاوەن بـاغ و بێستانم، خاوەن پایەو سوڵتانم بوون و فیطرەی لیّ دیّتە وەلام بەزمانی حالّ دەلیّ ئـەی نـەفس بزانە تۆ مەلیك و پادشا نیت بەلکو تۆ مەملوك و بەندەی خـۆت بەباشـی بناسـە خـۆت لیّ نەگۆڕیّ ، مەلیك ئەوەیە حوکم بکاو حوکمی بەسەرا نەکریّ ، ئەوە نیە تـۆ دێـیت و دەڕۆی، دەبی و دەمری، بـیّ هێـزو پیردەبـی، بـەلاو نەخۆشـی دات دەگـریّ، پێداویـستی زۆر رووت تیّدەکا، کەوتویتە ناو نەخۆشیە دەرونیەکان، بەو مالّ و سامانەی هەتە بەو دەسەلاتەی هەتە هەلّمەخەلّەتیّ ئەمە ئی تۆ نیە گشت ئی مەلیکی گەورەیە بەئەمانەت داویە بەتۆ هەر کاتیّ خواستی کرد، لیّت دەسێنێتەوە .

جا روو لەمـەلیکی گەورە دەکەین دەیکەینە رووگەی دلّمان و پڕ بەهەست و ئەستەوە پیّی رادەگەیەنین و دەلـێین ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ(٤)إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ(٥)اهْـدِنَا الـصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ(٦)صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ﴾

## ٤ ـ القدوس

القدوس : ناوێکه لەناوە پیرۆزه جوانەکانی خوای بێ هاوتا ، بنچینەکەی (تقدیس)ه واتـه پیرۆز و پاکی (القدوس) لە (٢) جێگا لەقورئانا هاتووه واتـه زۆر پـاك و پـیرۆزو بێگـەردە لەهەرچی کەموکورتی هەیە دوره ، وەهەموو بەدیهێنراوەکان شایەدمانی دەدەن لەسـەر ئـەم راستیە ، وەکردویانه بەروگەی خۆیانا ، وەهۆشیارانی ئادەمیزادو جنیش لەدێرین و داهاتوودا سەری کڕنوشی بۆ دادەنەوێنن و پێشوازیان لەرێزو شکۆی ئەم خوایە کردووەو دەیکەن ، ئـەم ناوە جوانە کەسیفەتێکی خوای گەورەیەو ، لەسەر زوبانی فریـشتەکان دەفـەرموێ : ﴿ نحـن نسبح بحمدك ونقدس لك ﴾ البقره .

واتە ئێمە سوپاس و ستایش بەخاوێنی بۆ تۆ دەکەین و تۆ بەپاك رادەگرین .. فریشتەکان بەراسـتی خـوا بـەپاك و خـاوێن دەزانـن ، بـەدووری دەگـرن لەهەرکـەم و کورتیـەك ، ئـەو سیفەتانەی فریشتەکان راستەقینەن بۆیەش بەراستەقینەی خوا بەپاك دەزانن چونکە گیانـانی پاکن بەنیسبەت ئادەمیزادەوە .. وەئـادەمیزادیش بـۆی هەیـە بەپایـەی فریـشتەکان بگـا ، لەپاکیداو وەلەرێزی ئاژەڵ هەڵگوزێ و پەروەردگاری خۆی بەپاکی و بـێ خـەوش رابگـرێ .. کەواتە ئەو سێ هەنگاوانە لەئارادان ، هەنگاوی ئـاژەڵی ، هـەنگاوی ئـادەمی ، هـەنگاوی فریشتەکان ، بێگومـان ئـادەمیزاد تێکەڵـە لەلایـەنی ئـاژەڵی وەکـو ئـارەزووی خـواردن و خواردنەوەو شـەهەواتی جیـنس ، وەفریـشتەیی وەکـو ئـارەزووی زانیـاری و خواپەرسـتی و پەروەردەی گیان و روحی .. جا ئەگەر ئادەمیزاد لایەنی ئارەزووی ئاژەڵی بەرەڵلا بکات ئەوە لەشوێنەواری گرنگ و مام ناوەندی دادەبەزێ بۆ رێزی ئاژەڵان بگـرە نـزمتریش وەکـو خـوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ ..أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ..﴾ الاعراف/١٧٩ .

واتە ئەوانە وەك ئاژەڵان وان بەڵکو گومڕاتریش ، وەئەگەر ئادەمی لایەنی روحی و گیانی خۆی بەهێز بکات وەك تەقواو خواپەرستی و زیکرو یادی خواو خـۆ دوورگـرتن لەغەفڵـەت و گوناه و تاوان ، ئەوە لەرێزی فریشتەش تێدەپەڕێت ، وەکو خوای بێ هاوتـا دەفـەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ..﴾ الاسراء/٧٠. واتە ئادەمیزادمـان رێزلێنـا .. وەهـەروەها خـوای

گەورە دەفەرموێ : ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيــزِ الْحَكِيمِ ﴾ الجمعه / ١.

واته پاكی و بێ گەردی خوا دەنوێنێ هەرچی لەئاسمانەكان و زەویدا هەیە وەگشتیان موڵك و سامانی خوای پاك و بێگەردە ..

بونەوەر بەخۆرو كۆمەڵەكانیانەوە بەهەموو ئەو شتانەی كەتیایدان، لەخولانەوەی تەنە گەورەكان لەژیانی گیانداران لەكشتوكاڵ و جۆراوجۆر درەختەكان و ئاوو هەوا .. هتد هەمر هەموویان فەرمانەكانی سەرشانی خۆیان بەرامبەر بەقودسیەتی خوا بەجێ دێنن و خوا بەپاك و بێگەرد رائەگرن .. جاهەر یەكەیان بەزمانی حاڵ و بەشێوەی تایبەتی خۆی .. پێویستە ئادەمیزاد هەرچەندە ئازادی پێدرابێ خۆی واڕابێنێ كەلەرژێم و یاسای بوونەوەر لانەداو خۆی بەهاوەڵێتی شەیتانەكان و لەخوا بێ ئاگایان نەهێڵێتەوە ..

جا ئەگەر ئادەمیزاد لەرژێمی بوونەوەر لای نەدا ئەوا لەریزی فریشتە نزیك دەكەوێتەوەو سەرەنجام لەنزیكی پەروەردگاری دا نیشتەجێ دەبێ و دەحەسێتەوە هەتا هەتایە .. وەلەعائیشەوە رەزای خوای لێبێ ریوایەت كراوە كەپێغەمبەر (ﷺ) لەرەكوع و سوجدەدا ووتویەتی : ( سبوح قدوس ربنا ورب الملائكة والروح )

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (سبحان ملك القدوس ، سبحان ملك القدوس ، سبحان ملك القدوس ، سبوح قدوس ربنا ورب الملائكة والروح )

ئەمانە تەسبحاتێكن كەقودسەت و پاكی و بێگەردی خوای گەورە دەردەخەن .

پیرۆزێتی شایستەی خوای بێ هاوتایە وەسەرچاوەی گشت پیرۆزێتی هەر خۆیەتی هیچ پیرۆزیێ چ كەم چ زۆر لەهیچ لاوە وجودو ناوەڕۆكی نیە لەهیچ دروست كراو مەخلوقی ، مەگەر خوای گەورە بەش و بارێكی پێبەخشیبێ ، كەواتە پیرۆزی (كەعبە) لەماهیەت و بوونی خۆی دا نیەیە بەڵكو خوای گەورە پێی بەخشیوە ، ئەمەش جۆرە رەحمەتێكی خوداییە بۆ خاوەن باوەڕان كەجێگەی كۆبوونەوەی ساڵانەیانە ، هەروەها قورئان بۆیە پیرۆزە چونكە كەلام و سیفەتی خوای گەورەیە ، ئەو شتانەی ماناو واتای پیرۆزیان دراوەتە پاڵ

ئەگەر سەرچاوەکەی لەخواوە نەهاتبێ بێگومان ئەم پیرۆزییە بنـچینەیەکی نیـەو پیرۆزیـتی حەقیقی پێوە نییە و شـەیتان جـوانی کـردووەو رازاندویەتیـەوە لەهەڵوێـست و بـیری چـەن کەسانێ کەحەقیقەت و ماهیەتی پیرۆزی نازانن و شارەزای نین ، شەیتانیش ئـەم کـارەی بـۆ ئـەوە کـردووە تـاکو بەشـێك لەخـەڵکان و مـەردووم وێـڵ و سـەرگەردان بکـات . چـونکە لەحەقیقەتدا بنچینەی پیرۆزێتی تەنها شایستەی پەرستراوە کەپەرستراوێتیش هەر شایـستەیە بۆ خوای گەورە..

ئادەمیزادیش دەتوانێ خۆی بەهرەمەند بکات بەبەشێك لەم پیرۆزییە بەیارمـەتی خـوای گەورە، ئادەمیزاد ئەگەر روو لەپەروەردگاری پیرۆزی بکات وەخۆی پاك بکاتـەوە لـەژەنگ و ژاری گوناە و تواناو بێئاگایی و غەفڵەت ، لەهەمان کاتیشا بەندایەتیەکی رێـك و جـوان و بەجێ بکات بۆ پەروەردگاری، وەهەڵوێستەکانیشی لەناسینی خوای گەورەدا لەشوێن خۆیـابێ .. ئەو کاتە خوای گەورە ئیمانی بەبەخشش و رەحمەت و دیاری پێدەبەخشێ ، ئەو ئیمانـەی کەکاڵاو باڵای پیرۆزی پۆشیوە ، چونکی لەلای خوای پیرۆزو پاکەوە هاتووە ..

ئەم ئیمانە کاڵاو باڵا پـیرۆزە روح و گیـانێکی زینـدووە لـەناو گیـان و رۆحـە پاکـەکانی ئادەمیزادەکان ئاشنادەبێ و دەڕوێ وگەشە دەکات ، جا ئەگەر بەهەر روح و گیـانێ شـادمان بوو ، ئەم روحە شادمانی و بەختەوەری دادەگرێ هـۆش و عـەقڵ و بـیری دەکەوێتـە شـوێن خۆی، دڵ و چاوو گوێچکەکانی لەزەمینەیەکی پاکدا دەمێنێتەوە، هەر کـارو هەڵوێـستێـێ بەسەنگ و نرخی خۆی دەی پێون و دەیکێشن دەیچێژن ..

جاچۆن خوای گەورە سەرچاوەی رەحمەتە ئاواش سەرچاوەی پیرۆزی و پاکیـیە، بەخواست و ویستی خۆی کەیەك پارچە حیکمەت و داناییـیە بەچەن و چۆنیەکی بوێ دەیبەخـشێ بەهـەر کەسێ یا هەر مەخلوقێ کەشایستەی ئەو پێ بەخشینە بـێ، وەیـا لێـی دەسـێنێتەوە گـەر شایستە نەبێ .

## ٥ ـ السـلام

السلام : ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە ، بنچینەکەی (سِلمَ)ە .. واتە دور لەناتەواوی و کەموکوڕی ، (السلام) (١٤٢) جار لەقورئانا هاتووە تەنها لەیەك شوێن مەبەست خوای گەورەیە، کەئەویش لەئایەتی (٢٣) سورەتی حەشرە ﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ .

السلام : واتە خوای گەورە ئاشتی خوازو ئاسایش و هێمنی دەبەخشێ بەدروست کراوو بەدیهێنراوەکانی .. ئاشتی سیفەتێکە لەسیفەتە جوانەکانی خوا ، دروشمی ئاشتی لەسەراسەری بونەوەر دەردەکەوێ لەنەخش و نیگارەکانی خوا ، لەڕازاندنەوەی بوەکان ووشەی (ئاشتی) دەخوێندرێتەوە ، ئاشتی هەنگاوێکە ئیمانداران لەسەر زەوی بەرەو ڕوی دەڕۆن تابەهۆی ئاشتی دونیایەوە ئاشتی هەمیشەیی وەدەست بێنن ..

گیاندارە شاخدارەکان — قۆچ دار — شاخەکانیان وەك ئالاّی ئاشتی بێ وایە ، چونکە بۆ پارێزگاری ئاشتی خۆیانە لەدەستی دڕندە ناحەزەکان ، باڵندە جوانەکانی ناو گەڵاّی سەوزی دارەکان ، ڕەنگە وێچوو گونجاوەکانیان لەگەڵ درەختەکان دروشمی ئاشتین ، بۆ ئەوەی ڕاوچی نەیداتەبەر هێرشەکەی ، نەبادا ئاشتی ژیانیان بەکوێتە بڤەوە (خطر)ەوە .. چونکە جیهان ئاشتییەو خوای ئاشتی ویست بەدیهێناوە .. باڵندەکان و گیاندارە ووردەکان حەز لەئاشتی دەکەن لەدەستی ناحەزەکانیان خۆیان دەشارنەوە یا ڕادەکەن بۆ ئەوەی ئاشتیان لێ تێك نەچێت ، هەروەها ماسی لەدەریادا نێچیر لەدارستانیدا ، هەندێ زیندەوەری بچووك لەژێر زەویدا .. هتد .

ئەمانە گشتی دەستکردی پەروەردگارێکی ئاشتی دۆستەو هێمای ئاشتی پەروەردگارە بۆ ئەو ئادەمیزادانەی بینایی‌و لێووردبنەوەو ژیریان هەبێ .. ڕۆژی دواییش هەر ئاشتییە بۆ هەڵگرانی ئالاّی ئاشتی لەپێغەمبەران و ئیمانداران ، ئەو ئاشتییە نەبڕاوەو گشتییە بۆ

هەموو ئەوانەی لەسەر رێنومایین – هیدایەتن – وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ ﴿ والـسلام علی من اتبع الهدی ﴾

ئاشتی لەسەر ئەو کەسەی دوای هیدایەت کەوتووە .. وەکو واچۆن لەدونیا سڵاویان نـزای ئاشتیبووە لەیەکتر لەکاتی بەیەك گەیشتنیانا ، وەئیمانداران بەخۆشەویستی و پێشکەش بـۆ یەکتری رەوان دەکەن ، دەی ئیمانداران سڵاو لەیەك بکەن با ئاشتی بـڵاو بێتـەوەو یـەکترتان خۆش بوێ ئومێد وایە لەئاشتی دونیاو قیامەت بێبەش نەبن ..

خوای گەورە کەئاشتیخوازی سیفەتی خۆیەتی ، بۆیە بەشێکی لێ ئاخنیوە بەناو فیطرەی کەون و بونەوەر لەمانـەش بەتایبـەتی ئـادەمیزاد ، بۆیـە لەهـەر کـۆڕو کۆمـەڵێکا کاتێـك کەدەسەڵات دارەکانیان دەست دەکەن بەزیادەڕەویو ستەم کردن بەشکاندنی سنوری ئاشـتی ، ئـەو کاتـە هۆشـیارانی ئـەو کـۆڕو کۆمەڵـە کاردانـەوەو رەد فیعلیـان لا دروسـت دەبـێ و لەبەرامبەریانەوە دەوەستن و دروشمی ئاشتی خوازێتی بەناو گەل و نەتەوەوە بـڵاو دەکەنـەوەو بەرز دەکەنەوە، وە شۆڕشیان لەدژا دەکەن ، چارەنوسـی ئاشـتی ئـازادی دەکـەن بەئومێـدو ئاواتی هاووڵاتیان و ، ئەو کاتە هاووڵاتیـانیش پـشتیوانیان لێدەکـەن وەخۆشـیان دەوێـن ، چونکە ماناو سیفەتی ئاشتێتی شێلدراوە لەگەڵ بوون و فیطرەیانا .

وەکو سروشتی ئادەمیزاد وایە کاتێ بێ دەسەڵات و بـێ پـارەو پوولـە ئـاوات دەخـوازێ کەرۆژێ بێ دەسەڵات و پارەو پوولی ببێ ئەوسـا خـۆی دەزانـێ چ دڵـسۆزو بەوەفایـەکی لێ دەردەچێ، چۆن دەسەڵات و پارەو پولەکەی دەخاتە خزمەتی گەل و نیشتمانەوە، بـەڵام کـاتێ کەبەئاواتەکەی گەیشت لەخۆی بەولاوە کەسیتر نابینێ و ناناسێ، دەکەوێتە خزمەت کردنـی نەفس و هەواو ئارەزووی خۆیەوە ، مەگەر ئەو ئادەمیزادە ئیمانداره نەبێ کەئیمانی بـەخوای ئاشتی خواز بەهێزەو بەچاوی چەپی جەهەندەم و دۆزەخ دەبینێ و بەچاوی راستی بەهەشتانی پڕ نیعمەت دەبینێ جا ئەم ئیمانەی ژیانی دونیای بۆ میزان دەکاو زاڵی دەکـا بەسـەر هـەواو ئارەزووەکانی و، هەڵوێست و کاری لەبارو بەجێ بڕیارو ئەنجام دەدات .

بنچینەی ڕەگی ئاشتی خوازێتی بەرهـەمی ئیمانـە (خواپەرسـتێتیەتیە) وەکـو بنـچینەو ڕەگی شەڕخوازێتی بەرهەمی بێ ئیمانی و شەیتان پەرستیەتیە ، گەر سەیرێکی مێژووی خوا پەرستان بکەین دەبینین چەندین گەلیان بۆ مـاوەی سـەدان سـاڵ وەکـو بـرا بەئاشـتیخوازانە ژیانیان بەخۆشی و ئاسودەیی دڵنیایی پێ بەسەر بـردوون ، بـەڵام هـەر کـاتێ خواپەرسـتان سەریان ئاوابوو، گەلان نەهەر لەگەڵ یەکا بەڵکو لەناوەخۆشـیانا کەوتوونەتـە گیـان و مـاڵی یەکتری و ، بێڕەحمی و نادڵنیایی و غەرەزو بوغزو قینیان لەڕاست یەکا لێ هەڵساوە مانـای ئاشتیەیان لێڵ کردووەو کـاڵاو باڵایـان جـڕ بـەجڕ کـردوە کەسـیان ڕەچـاوی ویـژدان و سـك پێسوتانی بەرامبەر ئەویتر نەبووە.

ئـازیزان .. ئیمـامی غـەزالی لـەکتێبی (احیـاء علـوم الـدین) دا بۆمـان دەگێڕێتـەوە ئافرەتێکی خواپەرست و زانا برازایەکی لەخۆی خواپەرست و زاناتری هەبوو پێـی ووت ئـەی ڕۆڵە : ئەگەر هاتو خوای گەورە بەکەرەم و ڕەحمی خۆی ژیانی بەسەر بردم و گیـانمی کێـشا ، جا ئەگەر خواپەرستیم و چاکەکانم جێگەی ڕەزامەندی خوای گەورەبوو بڕیاری وابوو نەم بـەن بۆ دۆزەخ و جەهەندەم بەڵکو بم بـەن بـەرەو ئاسمانـەکان ، یەکـە یەکـەو تـا سـەرەوەی هـەر حەوتیان، وەلەوێدا رووحم بەلیقای خوا گەیشت جاچی بڵێم خزمەت خـوادا ؟ وەحـەز ناکـەم بەنکولی و بێ دەنگی لەخزمەت خوادا بم و پێی بگەم ؟

جابرازاکەی بەڕوێکی خۆشەوە هاتە وەڵام و ووتی ئـەی پـوری خۆشەویـستم (انـشاء الله) خوای گەورە تەمەنێکی درێژی پڕ بەرەکەتت بەقسمەت دەکات ، وەکاتێ کە ئـەمری خـواش بەجێ دێنێ (انـشاء الله) خوای گەورە بەرەحمەتی خۆی دەتبەخشێ و دەگەی بـەلیقای خـوای گەورە بەسەرەوەی حەوت ئاسمانەکانا ، جا لەو کاتە لەخزمـەت خـودا بفـەرموو : اللـهم انـت السـلام ومنـك السلام تبارکت یاذا الجلال والاکرام .

واتە پەروەردگارا بەڕاستی تۆ ئاشتیخوازی وەئاشتی خوازێتی لەلای تۆیە، پیرۆزی بـەرزی و بەرەکەت شایەستەی تۆیە، ئەی خاوەن شکۆمەندی بێ لەکە ئەی خاوەن کەرەم و بەخـشش .

جا ئان و زەمانێ هات و رابردوو ئافرەتەکە ئەمری خوای بەجێگەیاند ، چەند رۆژێکی زیاتری پێنەچوو ، هاتەوە خەونی برازاکەی پێی ووت ئەی رۆڵە بەخوا قەسەم زیکرو وێردێکی وات فێرکردم لەخزمەت خوادا پێشکەشم کرد خوای گەورە گشت گیانی داپۆشت بەبەزەیی و ڕەحمی خۆی و تابلێی پێی شادمان بووم ، خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە .

خوای گەورە لەدوا رۆژا سەلام لەئەهلی بەهەشتیان دەکات وەکو لەسورەتی یاسین دا دەفەرموێ : ﴿ سَلَامٌ قَوْلاً مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ ﴾ یس / ٥٨ .. هەروەها خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە کەسلاو کردن لەخوو ڕەوشتی بەهەشتیانە وەك دەفەرموێ : ﴿ لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلاَ تَأْثِيمًا (٢٥) إلا قِيلاً سَلاَمًا سَلاَمًا ﴾ (٢٥ ـ ٢٦) الواقعە .. لەناو بەهەشتا لەغوەو قسەی زیادیان گوێ لێ نابێ وەتووشی تاوان و ناڕەحەتی نایەن بەڵکو تەنها پێیان دەووترێ سڵاوو رەحمەتی خواتان لێبێ و بەهەشتتان پیرۆزبێ .

هەروەها فریشتەکان پێشوازی لەئەهلی بەهەشت دەکەن سڵاوو پیرۆزباییان لێدەکەن دەڵێن فەرموون برۆن بۆ بەهەشت و هەتا هەتایی تیا بمێننەوە ، وەك لەمانای ئایەتی (٧٣)ی سورەتی (الزمر)دا هاتووە .

لەعبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خوایان لێبێ) : پیاوێ پرسیاری لەپێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) کامە کارو خووڕەوشت لەئیسلامدا باشترین و خێرترین شتێکە ؟ فەرمووی خۆراك بەخشین وە سڵاو کردن لەو کەسەی کەدەیناسی و لەوەی کەنایناسی .

وەکاتێ کەمیوانە بەرێزەکانی حەزرەتی ئیبراهیم (کەبریتی بوون لەچەند فریشتەیەك) هاتنە لای و سڵاویان لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامی دانەوە ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ(٢٤)إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلاَمًا قَالَ سَلاَمٌ قَوْمٌ مُنكَرُونَ ﴾ ذاریات/٢٤ — ٢٥ .

لەئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (لەو کاتەی کەخوای گەورە حەزرەتی ئادەمی خەڵق کرد پێی ووت برۆ سەلاو لەو کۆمەڵە فریشتە

دانیشتوانە بکە، وەگوێ بگرە و ببیستە لـەوەی کەحـەزت لێیـەتی و خۆشـتیان دەوێ ، جـا ئەمە سەڵاوی تۆیە و وەسەڵاوی نەوەو وەچەی تۆیە ، چـووە لایـان و وتـی (الـسلام علـیکم) فریشتەکانیش وەڵامیان دایەوە بە (السلام علیکم ورحمـة الله ) لەوەڵامەکـەدا (ورحمـة الله)ی یان بۆ زیاد کرد ) متفق علیـە .. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ ئەگەر چونەماڵی سـەڵاو لەخانەوادەی ئەو ماڵەو بکەن بەسەڵاوی کەلەلای خواوەبێ پیرۆزو موبارەك و پـاکو بێگـەرد بـێ ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ نور /٦١ ، هـەروەها سـوننەتە ئـادەمیزاد کـاتێ کەگەڕایـەوە ماڵـەوە سـەڵاو لەخانـەوادەی ماڵـەوە بکـات ، کەمایـەی خۆشەویـستی و بەرەکەتـە بـۆ هەموولایەك لەخانەوادەدا ، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بەئەنەس دەفەرموێ : ئەی رۆڵـە ئەگـەر چویتە ماڵەوە ، سەلام لەخانەوادەت بکە دەبێتە بەرەکەت و رەحمەت بۆ خۆت و بۆ کەسـانی ماڵەوەت ) رواه الترمذي .

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست لەم ئایات و فەرموودانـەی باسمـان کـرد زیـاتر بۆمـان روون بوەتـەوە کـەخوای گـەورە ئاشـتیخوازە خۆیـشی لـەوە دێ کەبەندەکانیـشی کـاڵاو بـاڵای ئاشتیخوازی بپۆشن و کارو رەفتاریان بێ .. وەلەکۆتاییدا دەڵێین :

اللهم انت السلام ومنك السلام فاحيينا بالسلام تباركت ياذا الجلال والاكرام ..

## ٦ ـ المؤمن

المؤمن : ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای ئاشتیخواز ، ئەم ناوە (١٥) جار لەقورئانا هاتووە ، تەنها جارێکیان مەبەست سیفەتی خوایە کەئەویش ئایەتی (٢٣)ی سورەتی حەشرە ، بنچینەی ئەم ناوە (امین)ە واتە ئەمینی و ئارامی و دڵنیایی ..

المؤمن : واتە خوای گەورە دڵنیاو ئەمینەو دڵئارام و ئاسودەیەو بێ ترسە ، بەڵکو هەموو کەس و شتی دەبێ لەو بترسێ ..

خوای گەورە دەسەڵاتدارێکی بەسەرەوە نییە تارەچاوی یاسای بکاو لێی بترسێ ، بەڵکو هەر خۆی خاوەن هەموو دەسەڵاتێکە ..

ئادەمیزادی ئیماندار نابێت لەخوای خۆی دڵنیابێ بەڵکو دەبێت هەمیشە لێی بترسێ تاکو بەدڵ ماڤ خوایەتی خوا بدات ، ئەمە حەقیقەت و ڕاستەقینەی خواناسینە .. وەئەم ترسەش سەرچاوەی هەموو دانایی و حیکمەتێکە ، وەکو لەفەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) دا دەردەکەوێ کەدەفەرموێ : (رأس الحكمة مخافة الله)

جا ئەم ترسە زۆر لەبەرەی ئادەمیزاد ئەگێڕێتەوە لەزۆر کاری ناپەسەند، کەلەوانەیە سەر بکێشێ بۆ بەدکاری و زوڵم و ستەم لەسەر ڕووی زەوی . کەواتە ئەم ترسەش ڕەحمەتی خوایە ، بەدانیشتوانی سەر زەوی جالەهەر ڕەگەزێك بێت ..

زۆر جاریش بەخواستی خوا ئەم ترسە لەدڵی ئیمانداران تەشەنە دەکات و دەبێتە یەکگرتنی ئیمانداران و پەیابوونی هێزێکی گەورەی خوایی دژ بەبەدکاران و ستەمکاران، سەرەنجام پادشایانی تاغوت پەرست بەخۆیان و کورسیەکانیانەوە ، ژێراو ژێر دەبن وخواپەرستی و دادپەروەری شوێنی دەگرێتەوە .. هەر ئەم ترسەشە زانایان ئەلەرێنێتەوە کەبەدەم خەڵکەوە بچن و فێری زانین و زانیاریان بکەن، تاکو ئەوانیش لەو بەخششە خواییە بێبەش نەبن، ئەمەش دەبێتە گۆڕان کاریەکی گەورە لەڕوی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیدا ، چونکە زانیاری زەوت کردن و ماف ئەدانی بەخەڵکانی موستەحەق بەشێوەو

نوسلوبێکی جوان ، وەکو ماڵ زەوت کردن وایە کەبیشاردرێتەوە لەهەژاران و داوامـان بگـرە زۆر خەراپ تریشە .. پاشای گەورەش لەتۆڵەی دا سزای سەختە ..

خوای گەورە رێگای دڵنیایی و سەرفرازی دەخاتە پێش بەندەکانی جا چ ئادەمیزاد بێ یان پەری (جن) ..

وەئیمانداران لەیەکتر ئەمینن و هەڵگری ئاڵای ئەمینین و وەبەدیهێنراوەکانی خـوا لێیـان ئەمینن و ئاواتیان ئەمینی هێنانە بۆ بەرەی ئادەمیزاد ،ئەمەش بەخشش و رەحمەتی خوایـە بۆ بەندەکانی، وەخوای گەورە ئیمانداران ئەمین و دڵنیا دەکـات لـەئازارو ئەشـکەنجەی رۆژی دوایی‌دا . گەر سەیرێکی بێباوەڕان بکـەین پێـچەوانەی ئیمانـدارانن ، کەسـیان لەکەسـیان ئەمین و دڵنیا نی‌یە ، وائەزانن هەرچی لەبوونا هەیە خۆی لەسەنگەر نـاوە دژ بـەئادەمیزادی بەدبەخت ،ئەم بێباوەڕیەیان و بۆچوونەیان ، لەبازاڕی گومڕایی و نـەزانین نـوقمی کـردوون ، تووشی دڵەڕاوکێ و ترس و نائەمینی کردوون، کەچی ئیماندار لەهەموو رووێکـی ژیانـەوە ، وەلەهەموو کات و ساتەوە دڵئارام و بێترس و ئەمینە .. ئەم ڕاسـتی‌یەش گـرتنی رێـچکەی یاسای بونەوەرە ، کەهەر پارچەو بەشێکیان ئەم سیفەتە بەرزەی خوای لێ ڕەونەق ئەداتەوە ..

خوای گەورە هیچ ترس و سامێکی نـەبوەوو نـایبێ لـەهیچ روو لایەنەکـەوە، لەهـەموو روێکەوە بێنیازە لەغەیری خۆی ، وەکو ئادەمیزاد نیە کەهیچ روو لایەنێك نیە ئیللا بێنیاز نی‌یەو پێداویستی هەمەچەشنەی هەیەو دەیبێ ، جا بۆیە خوای گەورە دڵنیاو ئەمینـە بـەڵام ئادەمیزاد لەبەر زۆری پێداویستی ژیان لەڕووی ماددی‌و مەعنەوی‌یەوە مەترسی جـۆراو زۆر ڕووی تێدەکات .

یەك لەو پێداویستیانەی ئادەمیزاد ئەوەیە کەدەبێ بەدڵ لەخوا بترسێ مافی خوایەتی خودا بدات بەواقیعی حاڵی خۆی دان بنێ بەسیفاتی هەرە بەرزی – تاك و نەزیك بێتەوە لەسیفەتی کەمالی . وەئەم ترسە خوایی‌یە لەدڵ و دەروونی ئـادەمیزاد ژیـانی بـۆ هاوسـەنگ و میـزان دەکات، لەسەر راستە شەقامی ژیان راگیری دەکات ، ئەمە لەلایێ، لەلایێ تر بەرابەری ئـەو هەموو خواست و داخوازی‌یە نابەجێیانەی نەفسی ئەمارەو شەیتانی لـەعین دەکـات ، بەمـە

ئادەمیزاد هێزێکی وای بۆ دروست دەبێ لـەدژی ئـەو هـەموو تەووژمـە داخـوازی کارانـەی کەدەیکێشن بۆلای فەسادی و فاحیشەو کاری ناهەموارەوە .

بەڕاستی ترسی خوای گەورە کەرەم و نیعمەتێکی گەورەیە بـۆ بـەرەی ئـادەمیزاد ، ئـەم ترسە خوایی‌یە ئادەمیزاد نائـەمین ناکـات، وەکـو ترسـی مـەخلوق و بـەدیهێنراو ، بـەڵکو جیاوازیان گەلێ زۆرە بۆ ئەوەی زیاتر نیعمەتی ترسی خواتان بۆ روون بێتەوەو دەرکەوێ ، بـا هەندێ لەو خاڵانەی کەجیاوازی نێوان ترسی خوداو ترسی مەخلوقن بۆتـان روون بکەینـەوە ، بەڵێ ترس هەر ترسە ، بەڵام سەیرو موعجیزەی ئەوەیە تـرس لـەخودا کاریگەرییـەکی زۆری ئیجابی دێنێتە واقیعی ژیانی ئادەمیزاد ، بەڵام ترس لەمەخلوق کاریگەریـەکی زۆر سـەلبی دێنێتە ئەنجام بەپێچەوانەی ترسی خـوای گـەورە ، وەئـەم خاڵانـەی کـەبۆتان بـاس دەکـەین هەندێکن لەجیاوازی نێوان ترسی خالق و مەخلوق یا بەمانایـەکی تـر تـرس لـەخوداو تـرس لەغەیری خودا .

١ — ترس لەخودا : لەئەنجامی لێکۆڵینەوە لەحەقیقەت و دووربینی و ووردبینی‌یەوە دێتە کایەوە بـەڵام تـرس لەمـەخلوق لەئـەنجامی بێئاگـایی لەحەقیقـەت و خۆپەرسـتی وتەسـك بینی‌یەوە دێتە کایەوە .

٢ — ترس لەخودا وا لەئادەمیزاد دەکات کەژیانی یەکپارچە ببێتە مایەی خزمەت کردنی کۆڕو کۆمـەڵ بەباشترین شێوە ،بەڵام ترس لەمەخلوق وا لەئادەمیزاد دەکات کـەژیانی ببێتـە باری زەحمەت و ناخۆشی بەسەر شانی کۆڕو کۆمەڵەوە .

٣ — ترس لەخودا ئادەمیزاد جوان و نورانی دەکات لەرەنگ و روخساردا وەکـو کـەخوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ﴾ فتح/ ٢٩ ، بـەڵام ترس لەمەخلوق ئادەمیزاد قەبیح و ناشیرین دەکات لەرەنگ و روخساردا ، وەکو خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ ﴿ يُعْرَفُ الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ.. ﴾ الرحمن/٤١ .

٤ — ترس لەخودا ، بیروهۆشی ئادەمیزاد فراوان دەکات ، سەخی ودەستکراوەی دەکات ، بەلاّم ترس لەمەخلوق بیروهۆش تەسك دەکات و ئادەمیزادی رەزیل و دەست قوچاوی دەکـات

٥ — ترس لەخودا ، صەبرو ئارامی لەسروشتی ئـادەمیزاد زیـاد دەکـات ، بـەلاّم تـرس لەمەخلوق صەبرو ئارامی لەسروشتی ئادەمیزاد کەم دەکاتەوەو دەیشلەژێنێ .

٦ — ترس لەخودا ، والەئادەمیزاد دەکات کەهەردەم داواکارو طـالبی حـەق بـێ ، بـەلاّم ترس لەمەخلوق ، والـەئادەمیزاد دەکـات داواکـارو طـالبـی حـوکمی نەفـسی خـۆی بـێ و مەسلەحەتی بێ جا هەق بێ یان نا .

٧ — ترس لەخودا ، ئـادەمیزادی ئـازاو چـەپوك دەکـات ، وەك لەفـەرموودەدا هـاتووە دەفەرموێ : من خاف الله وحده خوّف الله منه جمیع خلقه . واتە ئەوەی بەتەنها لەخوا بترسێ خوا گشت مـەخلوقی لـێ دەترسـێنێ ،مـەلاّم تـرس لەمـەخلوق ، ئـادەمیزادی ترسـنۆك و داوەشاوی دەکات ، وەك لەدوابەشی فەرموودەکەی ووتمان دەفەرموێ : ومـن لم یخـف الله وحـده خوّفه الله من جمیع خلقه ،واتە ئەوەی بەتەنها هەر لەخوا نەترسێ واتە لەشتی تـریش بترسـێ ئەوە خوای گەورە لەگشت مەخلوقی خۆی دەیترسێنێ .

٨ — ترس لەخودا ، بەرەکەت دێختە عیلم و زانیاری و رزق ورۆزی و ژیرییـەوە ، بـەلاّم ترس لەمەخلوق بەرەکەت لادەبا لەعیلم و زانیاری و رزق و رۆزی و عـەقلّ و ژیرییەوە .

٩ — ترس لـەخودا ، خـۆراکی گیانـەو حـەلاوەو شـیرینی ئیمـانی تیایـەو دلّ و دەروون ئاسوودە دەکات ، بەلاّم ترس لەمەخلوق ، پیسی و چـەپەلّیـەکی شـەیتانیـیە وەسوەسـەیەکی درۆییـنەیە ، وەروح و گیان پیس دەکات و دلّ و دەروون تێك دەشێوێنێ.

١٠ — تـرس لـەخودا ،ئـادەمیزاد شـیفا دێـنێ لەنەخۆشـیـیە نەفـسی و دەرونیـەکان و کۆمەلاّیەتیەکان ،بەلاّم ترس لەمەخلوق ئادەمیزاد تووشی نەخۆشیە نەفـسی و دەروونیـەکان دەکات لەگەلّ نەخۆشیـیە خێزانی و کۆمەلاّیەتییەکان .

١١ — ترس لەخودا مایەی هیدایەت و راستە شەقامی ژیانە ، بەلام ترس لەمەخلوق مایەی گومڕایی و سەرگەردانی ڕێگا بزرکردنە .

١٢ — ترس لەخودا ، ڕێکی حەق و عیلم و نەقڵ و فیطرەی ئادەمیزادە ، بەلام ترس لەمەخلوق ناڕێکە لەگەڵ حەق و عیلم و نەقڵ و فیطرەی ئادەمیزادەوە .

١٣ — ترس لەخودا ، والەئادەمیزاد دەکات لەهەموو کارەکانا حەکیم و دانابێ ،بەلام ترس لەمەخلوق والەئادەمیزاد دەکات کەحەقیقەتی حەکیمایەتی و دانایەتی لێ وون ببێ .

١٤ — ترس لەخودا ، برایەتی و خۆشەویستی و هێزی خێرخوازی دروست دەکات ، بەلام ترس لەمەخلوق برایەتی و خۆشەویستی تێك دەشکێنێ و هێزی شەڕ دروست دەکات.

١٥ — ترس لەخودا ، سەرەنجامێکی باش چاوەڕێی دەکات وەکو بەهەشتان پڕ نیعمەت و جیرانێتی خوای گەورە و .. بەلام ترس لەمەخلوق سەرەنجامێکی خەراپی بەدی چاوەڕێی دەکات کەجەهەندەم و (دۆزەخ) وەپەشیمانی و نەدامەتە ، ئەم خاڵانەو گەلێ خاڵی تریش کەلەمە زیاتر لێرە جێگەی نابێتەوە .

سەیرو موعجیزە ئەوەیە ترس هەر ترسە کەچی ترس لەخوا وەك باسمان کرد چۆن نیعمەت و بەهرەیەکە خوا داویە بەئادەمیزاد ، بەلام ترس لەغەیری خوا تۆڵەیەکی سەختی خوایە بەسەر ئەو کەسانەی کەچاویان کوێرو لێڵ بووە لەڕاست حەق و راستیدا..

ئا بەم باسەوە بۆمان رون بووە کەئادەمیزاد پێویستی بەترسی خوای گەورە هەیە بێی ترسی خودا کون و کەلەبەرێکی زۆر دەکەوێتە واقعی گیان و ژیانی، وەئەو کەموکوڕیەی کەلەئادەمیزاد دا هەیە بەترسی خودا پڕ دەبێتەوە، وەئەو جۆرە کەم و کوڕیانە یا هەر جۆرە کەم و کوڕیێ لەخوای گەورە دوورەو شایستەی خوای گەورە نین، دەی کەواتە خوای گەورە شایەستەیە بەبێ ترس و ئەمینی، حەقی خۆشیەتی کەنای (المؤمن)ە .

خوای گەورە لەبارەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە لەسورەتی ئەنعام لەئایەتەکانی (٨٠ — ٨١ — ٨٢) دەفەرموێ :

﴿ وَحَاجَّهُ قَوْمُهُ قَالَ أَتُحَاجُّونِي فِي اللَّهِ وَقَدْ هَدَانِي وَلاَ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِـــهِ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبِّي شَيْئًا وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلاَ تَتَذَكَّرُونَ(٨٠)وَكَيْفَ أَخَافُ مَا أَشْـــرَكْتُمْ وَلاَ تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُمْ بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالأَمْنِ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ(٨١)الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمْ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ ﴾

کاتێ کەحەزرەتی ئیبراهیم قەومەکەی دەمەقالێ (چەلەحانێ)یان لەگەڵ دەکرد فەرمووی ئایا ئێوە دەمەقالی لەگەڵ منا دەکەن کەبەڕاستی خوای گەورە هیدایەت و ڕێنومایی کردووم ، وەمن ناترسێم و نام ترسێنێ لەو هاوبەشیەی ئێوە کەبۆ خواتان بڕیارداوە چونکە بتـەکانتان و ئەوانەی بەهاوبەشی خواتان داناوە هیچ هێزو توانایێکیان نیە تاکو مـن لێیـان بترسـێم ، مەگەر ئەو ترسەی خوای گەورە خواستی لێبێ بیخاتە دڵمەوە ، وەپەروەردگارم فراوانی داوە بەهەموو شتێ بەعیلم و زانیاری وەئێوە چۆن ناترسـێن کەداهاتوویـەکی زۆر خـەراپ و بـەد چاوەڕێتان دەکات بەوەی کەهاوبەشتان بـۆ خـوای گـەورە بڕیـار داوە بـەبێ ئـەوەی بەڵگـەو دەلیلتان هەبێ هـەر بەهـەوای ئـارەزوو شـەهەواتەوە بەکوڵـەواری و جەهلـەوە داکـەوتوون، جاکامە پۆل و دەستە شایەستەو حەقی دڵنیاییان هەیە ئەگەر ئێوە بیزانن .

بەڕاستی ئەوانەی ئیماندارن و ئیمانەکەیان دانەپۆشراوە بەهاوبەش دانان و شەریك بۆ خوا شایەستەو موستەحەقی ئەمن و دڵنیایی‌و ئاسایشن، وەخۆیـان لەسـەر ڕێگـەی هیدایـەت و ڕێنومایی خودایین، بەڵێ ئادەمیزاد ئەگەر لەشتێ بترسێ لێی دووردەکەوێتەوە بەڵام لەترسی خوادا لێی نزیك دەبێتەوە .

خوایە گیان لەترسی خـۆت دەوڵەمەنـدمان بکـەو لـەرۆژانی قیامـەت و حەشـرا دڵنیـاو ئەمینمان بکە .

## ٧ ـ المهيمن

المهيمن : ناوێکه لەناوە جوانەکای خوای دڵنیا ، وەیەك جار ئەم ناوە لەقورئانا هاتووە کەلە ئایەتی (٢٣)ی سورەتی حەشرە ، بنچینەی ئەم ناوە (هَیمن)یە واتە ئاگاداری و چاودێری ، المهیمن واتە خوای گەورە زاڵەو ئاگادارە بەهەمەوو دروست کراوو بەدیهێنرەکانی جا چ گیان لەبەربێ یا بێگیان بێ ، وە سەرپەرشتی گشتیان دەکات و بەڕێوەیان دەبات ، وەهەرچی بێئاگایی‌و غەفلەت هەیە لێیەوە بەهیچ جۆرێ هەرگیز رووی نەداوەو روش نادات، گەر سەیرێکی ووردی گیان لەبەرانی سەر ڕووی زەوی بکەین ، دەکەوێتە بەرچاوی ژیریمان کەخاوەنەکەی لێیانەوە بێ ئاگا نیەو رەسەنی هەریەکەیان دەپارێزێ‌و رزق و رۆزیان پێدەداو پەروەردەیان دەکا ، وەهیچ جۆرو تاکێکیان نەکەوتووەتە مەیدانی لەبیرچونەوەو فەرامۆشی ، جائەگەر ئەم گیانلەبەرانە باڵندەکانی ئاسمان بن، وەیان زیندەوەرەکانی سەر ڕووی زەوی بن، یا زیندەوەرانی ژێر زەوی بن، یا جۆراو جۆری دارو بارەکان بن ، یا درندەو کێوییەکانی دارستانەکان و کێوەکان بن ، وەیا ماسی و جۆرەکانی ، بن دەریا بن ، هەروەها تەنە گەورەکانی ئاسمان خۆرەکان و کۆمەڵەکانیان لەخولگەی تایبەتی خۆیان لانادەن و بەندایەتی خوا دەکەن و دروشم و هێمای ئاگادرای‌و چاودێریتی پەروەردگاریان دەردەخەن بۆ کەسێ ژیرو بیری خۆی لەدەست نەدابێ . خوای گەورە لەبەر هەزاران دانایی‌و حیکمەت مۆڵەتی هێزو دەسەڵاتی ستەمکاران و زاڵمان دەدات ، ئەگینا هیچ هێزو دەسەڵاتێ نیە لەبەرامبەر هێزو دەسەڵاتی خوا بوەستێ ، وەك دەفەرموێ : ﴿ وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ ﴾ ابراهیم .. واتە وامەزانن خوا بێئاگایە لەو کارەی زاڵمان و ستەمکاران دەیکەن ، بەڵکو خوا مۆڵەتیان ئەداو ئەیان هێڵێتەوە بۆ ڕۆژێ کەچاو تیایدا مۆلەق دەوەستێ ..

ئازیزان دیاردەی ئەم کەون وبونەوەرە کەبەشێکی بەچاوی ژیری‌و زانیاری خۆمان دەی بینین و دەیزانین و پەی پێدەبەین، بۆمان دەسەلمێنێ کەخاوەنەکەی لێیانەوە بێ ئاگانیەو فەرامۆشیانی نەکردووەو بەڵکو زۆر بەجوانی و بەباشی ئاگاداریانەو دەستی میهرەبانێتی

پێیانەوە گرتووەو بەڕێوەیان دەبات . جا چ مەجەرەو کەشکەشانەکان بن ، کەهەمیشە لەجوولەو خولانەوەن لەبۆشایی‌یەکانی ئاسمانا، پابەندی ئەو قانون و یاسایەن کەخالیق و بەڕێوەبەریان بۆی دیاری کردوون، وەچ ژیانی گیاندارە بچوك و گەورەکان بن کەهەریەکەیان بەیاسای رێك و پێك و سوڕی ژیانیان بۆ مایەسەر دەکات وئەنجامی دەدات، وەچ گژوگیاو داروبارو جۆرەکانیان بن، کەهەرجۆرو نەوعیان سەرتاپای لەسەر ووردکاری‌و یاساو دەستووری خۆی لەبون و لەگەڕدایە ، کەهەر جۆرێ جیاوازیەکی زۆری تیایە لەگەڵ جۆرێکی‌تر ، چ لەڕوی یاساو پێکهاتەکانیەوە چ لەڕووی شێوەو رەنگیەوە چ لەڕووی تەمەن و چۆنیەتی گەشە کردنیەوە .

جا لەم کەون و بونەوەرە ئادەمیزاد لێیەوە حەیران و سەرسوڕماوە، بەهەر کام لا دەڕوانێ هەزارەها یا ملیۆنەها یاساو دەستوور لەناویەکا لەئالآدان و تەواوکەری یەکترن لەبەڕێوەچووندان، وە هەموو بەش و پارچەکانی مل کەچ و پابەندی ئەو یاسایانەن کەخالیق و بەڕێوەبەریان بۆی دیاری کردوون ، تەنها ئادەمیزادو جنۆکەیە کەبەشێك لەئیرادەیان هەیە واتە لەچەند رووێکەوە ئازادیان پێدراوە تاکو ماهیەت و کەسایەتی خۆیان بنوێنن ، تاکو خوای گەورە مامەڵەیان لەگەڵا بکات هەرکەسەی بەپێی ماهیەت و سیفەتی خۆیەوە ، ئەمانەی باسمان کرد بۆ چاوی عەقڵ و ژیری‌و زانیاری دەیسەلمێنن کەپەروەردگاریان هەمیشە ئاگادارو هۆشیارو زاڵە بەسەر هەموو بەش و پارچەکانی بوونەوەر، لێیانەوە غافڵ و بێ ئاگا نیە وەکو غافڵ و بێ ئاگا نەبووەو وەلێشیانەوە غافڵ و بێ ئاگا نابێ ، چونکە بێئاگایی و غەفڵەت شایەستەی خوای گەورە نیەو نەبووەو نابێ..

ئازیزان : ئەگەر لەدەروازەی فیترەتیشەوە بەچاوی ژیری‌و هۆشیاری‌یەوە بۆی بڕوانین بۆمان روون دەبێتەوەو دەردەکەوێ کەخالیق و پەروەردگارمان هەمیشە ئاگادارەو غەفڵەت روو لەئەو ناکات و، بەڵکو ئێمەین کەم ئاگاو غافڵین لەڕاست دەسەڵاتی بێپایان و ئاگاداری بەهێزی ئەو . بۆ نمونە . کاتێ کەیەکێ کەوتووەتە دەستی نەیارو ناحەزەکانی تووشی بەندایەتی و بێچارەیی هاتووە، ناحەزەکانیشی بەو پەڕی بێ ئینسافی و بێ رەحمیەوە کەوتوونەتە ئەشکەنجەو ئازاری وەگرتویانەو لەژووری تەنهایی (انفرادی) دایان کردووە ،

سەرەڕای ئازادی زەوت کردنی ئازاری گیان و نەفسیشی دەدەن ، تا لەم کات و سەخڵەتیەیدا کەبێ هیوای و ئومێدبووە لەدەوروبەریەوە یەکسەر پەنا دەبات بۆ خوداو سکاڵاو هاواری خۆی پێ ڕادەگەیەنێ .. بەمەوە سەلماندی و دەیسەلمێنێ کەپەروەردەگارەکەی لێی بێ ئاگا نیەو ئاگاداره بەحاڵی و چاوی میهرەبانێتی لێیەتی و گوێی بیسەری لەسکاڵاکەیەتی و خاوەن ویست و تواناداره، گەر خواستی لێبێ دەرگای رەحمەتی ئاوەڵایەو کەس ناتوانێ بەری لێبگرێ و نەجاتی دەدات . کاتێ کەسەیری دایکێکی دڵ زامار دەکەی کەمنداڵەکەی سووتاوە یا سەیارە لێی داوە، یا نەخۆشیی یەخەی پێگرتووە خێرا بەرەو تەواری و نەخۆشخانە دەیهێنێ، کەگەیاندیە بەردەستی دکتۆرەکان ئەو کاتە ڕووەو خوا دەبێتەوە سکاڵاو نزای خۆی حەواڵە دەکاو دەڵێ پەروەردگارا چاکی کەیتەوەو شیفای بۆ بێنی و رەحمان پێبکەی ، ئەی خودایە گەر چاکی کەیتەوە شەرت بێ ئەم خێرەو ئەو خێرەیە بکەم ، ئەمجارە زۆر بەباشی دەبێ ئاگاداری بکەم و نەیەڵم تووشی هیچ چەرمەسەریێ ببێ .. لەدەروازەی فیترەی ئەم ئافرەتە سەلماندی کەخوای گەورە ئاگاداره بەحاڵی و چاوی میهرەبانێتی لێیەتی و گوێی بیستنی لەسکاڵاو نزاکەیەتی و چارەسەرو شیفا هەر لای ئەوەو هەر خۆی شافییەو کەس ناتوانێ دەرگای شیفاو رەحمەتی داتخا گەر خۆی خواستی لەسەر کردنەوەبێ ، وەبەدوعاکەی تریشیەوە کەدەڵێ گەر شیفای بۆ بێنی ئەوەندە دەکەمە خێر ، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کەخێرو خێرات دەبێتە مایەی لابردن و دەفعی بەلاو موصیبەت و نەخۆشی و ناخۆشی وەکو لەفەرموودەدا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : } الصدقة تدفع البلاء وتزيد العمر وتدفع ميتة السوء { واتە خێرو خێرات مایەی لابردنی بەلاو موصیبەتەو بەرەکەت دێخاتە تەمەنی ئادەمیزادومردنی بەرەزالەت لەسەر ئادەمیزاد لادەبات.

ئایا کەسێ هەیە ئەم مامەڵەیە لەگەڵ خودا بکات ، دەی مەجالە تاکو ئەجەل وەفای کردووە دەنا دوایی داری پەشیمانی هیچ بەرناگرێ و هیچ داد نادات ..

ئەگەر سەیرێکی هەژارێکی داماو بکەین کەپێداویستیەکانی ژیانی بۆمایەسەر نابێ هەژاری کەوتۆتە گیانی و ئازارو نارەحەتی دەکات، بەو پەڕی قوڵایی دڵەوە ڕووەو خوا دەبێتەوەو سکاڵاو نزای خۆی دەردەبڕێ ، لەنزاکەیدا دەڵێ ئەی خودایە لەم هەژاریەم رزگار

بکەی ماڵێکی چاك و باشم پێ ببەخشی بەڵێن بێ ئەگەر ماڵم بدەیتێ خێرو خێرات بکەم ئاگام لەهەژاران بێ و دەبێ بێ دینی و ستەمی پێنەکەم ..

جا لەدەرگای فیترەی ئەم هەژارەشەوە بۆمان روون دەکاتەوە کەخوای گەورە ئاگادارە بەحاڵی هەژاری ئەوو کلیل و دەرگای موڵك و سامان هەر لەدەست خۆیەتی، وەچاوی میهرەبانێتی لێیەتی وەگوێی بیستنی لەنزاو سکاڵایەتی ، وەخاوەن ویست و ئیرادەیە گەر خواستی لێ بێ لەهەژاری رزگاری دەکا وەئەگەر دەرگای رەحمەتی لەیەکێ کردەوە کەس توانای داخستنی نیە هەر خۆی جێگەی ئومێدو ئاوات و مەبەستەکانە ..

ئەگەر سەیری موسافیرو رێبواری بکەین کاتێ کەسواری فڕۆکەو تەیارەکەی دەبێ لەرێگادا بەرێوەیە بەڵام لەهەنکاوێ دەڵێن کەموکوریێ و خەلەلێ لەفڕۆکەکەمان پەیدابووە، زەحمەتە بەسەلامەتی بگەینە جێ .. جائەو موسافیرە رووەو قاپی خودا دەگەڕێتەوە سکاڵاو هانای خۆی دەباتەوە بەر قاپی رەحمەتی خوای گەورەو تێی دا دەڵێ : ئەی خودایە بەساغ و سەلامەتی بمان گەیەنیتە جێ، ئەی خودایە فڕۆکەکەمان چی لێنەیێ ئەی خودایە بیکەی بۆ خاتری فلان و فیسار ئەم جارەش هیچمان لێنەیێ .. لەنزاکانی ئەم موسافیرەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کەخوای گەورە چۆن دەسەڵاتی بەسەر زەویدا هەیە ئاواش دەسەڵاتی لەئاسمانا لەئارادایەو، خاوەن هەموو دەسەڵاتێکە، وەئەوەشمان بۆ روون دەکاتەوە کەتەنها خوای گەورە ئادەمیزاد نەجات و رزگار دەکات لەبەڵاو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە .. هەروەها بۆمان روون دەکاتەوە کەچاوی میهرەبانێتی خوای گەورە لەهەموو شوێنێکایە وەکو گوێی بیستنی لەهەموو شوێنایە، جا باناو ئاسمان و ناو فڕۆکەش بێ .. هەروەها ئەوەشمان حاڵی دەکات کەخوای گەورە هەمیشە ئاگادارە بەحاڵی هەموو مەخلوقێ و وەئەگەر دەرگای رەحمەتی لێ بکاتەوە کەسێ نیە بۆی بکاتەوە وەئەگەر دەرگای رەحمەتی داخست کەسێ نیە بۆی بکاتەوە

هەر خۆی شکۆمەندو کار بەجێیەو بەڕێوەبەرایەتی گشت مەخلوقەکان دەکات و هەر خۆی جێگای ئاوات و ئومێدی هۆشیاران و ژیرانە .. [1]

ئەگەر سەیری یەکێ بکەین کەمویتەلا بووەو کەوتۆتە ناو ئاوەوەو نەهەنگ قووتی داوە ، وەك حەزرەتی یونسی کوڕی مەتی ، ئەو کاتە هیچ چارەو مەفەڕێ شك نابات تەنها قاپی رەحمەتی خوای گەورە نەبێ سکالاو نزای لێ بەرز دەبێتەوە رووەو قاپی یەزدان ، پەروەردگارا تۆ پاکیت دوریت لەهەرچی کەموکوڕی هەیە بەڕاستی و تەنها هەر تۆ پەرستراوی بێجگە لەتۆ هیچ پەرستراوی تر نیە من ستەمم کردووەو لەستەمکاران بوومە ، هەرچاوم لەکەرەم و رەحمی تۆیە پەنام بدەو رزگارم بکە .. ئەگەر ووردبینەوە لەنزاو پاڕانەوەکانی بۆمان دەردەکەوێ لەدەرگاو دەروازەی فیترەوە کەپەروەردگار ئاگادارە بەحاڵی‌و چاوی میهرەبانی لێیەتی گوێی بیستنی لەسکالاّیەتی‌و وەتواناداره بەسەر هەموو شتێ وەئەگەر دەرگای رەحمەتی ئاوەلاّ بکات کەسێ نیە دای بخا، وەچۆن تواناداره بەسەر ووشکایی و ئاسمان ئاواش تواناداره بەناو ئاوو دەریادا ، ئاوچاوانی گشت مەخلوقێ بەدەستی خۆیەتی بانەهەنگیش بێ .. ئەوەشمان بۆ دەسەلمێنێ لەو بەلاّو میحنەو موصیبەتانەی کەتوشمان دێ زۆربەیان لەبەر کاری نادانایی و ناحەکیمانەی خۆمانە ، وەصەبرو ئارام نەگرتن لەسەر کاری حەکیمانەو فەرمانی خودا بەئەنجامی خەراپمان دەگەیەنێ سەرەنجام کەسێکیش نیە پەنای بۆ بەرین خودا نەبێ .

ئازیزان : لەو نمونانەی کەباسمان کرد بۆمان روون بووەوە کەخوای گەورە ئاگاداره بەهەموو مەخلوقێ و بەڕێوەیان دەبات جا لەسەر زەوی بێ یا لەئاسمان بێ یا لەبن دەریابێ، وەچۆن چاوو عەقڵ و ژیری شایەدی لەسەر ئەم راستیە دەدات ئاواش فیترەو دەروازەکەی شایەدی و گەواهی لەسەر دەدەن ، بەلاّم ئادەمیزاد لەم ئاگاداریەتیەی خوای گەورە کەم ئاگایە یا هەر بێ ئاگایە لەبەر مەشغوڵ و خەریك بوونی بەکارو شتی لاوەکی‌و، وەلەبەر تێکەڵی لەگەڵ

---

[1] ﴿ قل أرايتم إن أتاكم عذابُ الله أو أتتكُم الساعة أغيرَ الله تدعون إن كنتم صادقين * بل إياهُ تدعونَ فيكشفُ ماتدعونَ إليه إن شاء وتَنسونَ ماتُشرِكون ﴾/ الانعام (٤٠-٤١)

غەوغاو چەپەڵی ژیان ، وەلەبەر ئیهتیمام نەدان بەزانیاری و عیلمی خواناسین ، گەرچی خۆشی بەقەد چاوقوچانێ ناتوانێ بێ یارمەتی و کۆمەکی خوای گەورە بژێ و ژیانی بەئەنجام بگەیەنێ .. جائەم بێ ئاگاییەی لەم حەقیقەتە سەرەنجام ماڵی ئادەمیزاد کاول دەکاو لەپلەو پایەی ئادەمیزادێتی دایدەبەزێنێ جەهەندەم و دۆزەخ بەرۆکی پێدەگرێ وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ الاعراف / ١٧٩

جارووەو قاپی رەحمەتی خوای گەورە دەپارێینەوەو دەڵێین : اللهم ربّنا لاتجعلنا مع القوم الغافلين .. لا إله الا انت المهيمن العزيز الحكيم ..

## ٨ ـ العزيز

العزيز : لەناوە جوانەکانی خوای ئاگادارە ، ئەم ناوە (٩٢) جار هاتووە لـەقورئانا وە لـە (٨٣) شوێن مەبەست سیفەتی خوایە ، بنچینەکەی (عزّ)ەیە واتە بەرزی و عیززەت.

العزیز : واتە خوای گـەورە خـاوەن دەسـەڵات و عیززەتـی بێپایانـەو بـێ کـەموکوڕی و شکـستە، وەهـەرگیز شەکەسـتی بەسـەرا نایـت ، هـەر ئـەوە بەتـەنها زاڵـە بەسـەر هـەموو بەدیهێنراوەکانی و شەکەست دەدات بەو بەدیهێنراوەی کەشایانی ئەوەیە شکستی بەسەرا بێت .

دەسەڵاتی خوا سەرەتاو کۆتایی بۆ نیەو وەهەرچی هاتووەتـە شکـست لەدێرینـدا وەیـا دێتە شکست لەداهاتوو گشتی بەهێزو خواستی ئەم خودایەیە ، بەغەیری خۆی کەس ناتوانێ شکست بەسەر شتێکا بێنێ وەهەموو هێزو دەسەڵاتەکان وەك سـەرباز وان لـەژێر خواسـت و ویستیدا ، جا چ بێ بڕوابن یا بڕواداربن . وە سەرکەوتن دەدات بـۆ ئـەو دەسـتەی خواسـتی لێبێت .. وەخوای گـەورە بەخواسـتی خـۆی خـاوەنی دەسـەڵات و عیـززەت و گـەورەیی و شکۆمەندییە . ئەم ناوە پـیرۆزەی خـوا وا لـەدڵانی خـاوەن بـڕوا دەکـا کەهەسـت بـەهێزو دەسەڵات و گەورەیی خوا بکەن ، ئەو کاتە ئیتر ئـارامی بـاڵی خـۆی دەکێـشێ بەسـەر ئـەو وڵاتەدا وەچاك دەزانن کەلەسەرووی ئەم بوونەوەرە هێزێکی زۆر بەتواناو بەهێز هەیە، کەهیچ شتێ ناتوانێ زاڵ بێ بەسەریا، هەرچەندە ستەمی ستەمکاران بگاتە ئەوپەڕی وەزوڵمی زاڵمان لەسنور دەرچێ ، موسڵمانان خەیاڵیان ئاسودەیە کەئەمانەو هـاو وێنـەیان لەدەسـتی خـوای عەزیزو ڕزگاریان نابێ و دەرناچن .

بۆ ئەوەی زیاتر لەماناو ناوەڕۆکی ئەم ناوە یا ئەم سیفەتەی خودای گـەورە حـاڵی بـین .. پێویستە سەرنج بدەین لەو ئایەتانەی کەئەم ناوەیان تیا هاتووە..

ئەوەی شایانی باس بێ لە (٨٣) ئایەت باسی ئەم سیفەتەی خوای گەورە دەکـات لەهـەر شوێنێ بەشێوەیێ، وەلێرەدا جێگەی باسی هەموان نابێتەوە بۆیە تەنها چەند ئایەتێك بـاس دەکەین ..

١ – خوای گەورە لەسورەتی (البقرە)دا لەئایـەتی (١٢٩) باسـی دوعایەکـەی حـەزرەتی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : ﴿ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ البقرە / ١٢٩ .

واتە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمویەتی : پەروەردگارا پێغەمبەرێکی خاوەن پەیام بۆیان بنێرە لەخۆیان، کەبەسەریانا ئایات و کیتابی تۆ بخوێنێتەوە، وەفێری زانست و زانیـاریو دانایـیـان بکات ، وەپاکیان بکاتەوە لەژەنگ و ژاری گوناه و تاوان و تەزکیەیان بکات ، بەڕاسـتی تـۆ ئازیزو شکۆمەندو دانایی ، ئا لەم ئایەتەدا چەند لایەنە عەزیزایەتیەکی خوای گەورە دەخاتە ڕوو کەتواناداروەو خاوەن دەسەڵات و کەرەمە، دەتـوانێ پێغەمبـەرێ بنێـرێ بـۆ نـاو گـەل و کۆمەڵێکا کەلەخۆیان بێ وەئەو توانایەشی پێ ببەخشێ کەکەسانی تـر فێـرە مەعریفـەت و زانیاری و دانایـیان بکات، وەتوانای ئەوەشی پێبدات کەبزانێ و لێهاتوو بێ بۆ پاك کردنەوەی دڵ و دەروونەکان لەنەفامی و گوناه و تاوان .. کەئەم کارو ئەم سـیفەتەش هـەر لـەخۆی دێ هەر شایستەی خوای گەورەیە و ، کەسێکی تر خاوەن ئەم دەسـەڵات و شـکۆمەندییە نییـە کارێکی وای پێبکرێ یاکردبێتی ..

٢ – هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (البقرة)دا لەئایـەتی (٢٦٠)دا دەفـەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُـنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ البقرة/٢٦٠ ، واتە : کاتێ کەحەزرەتی ئیـبراهیم فەرمووی ئەی پەروەردگارە پێم نیشان بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە جـا خـوای گـەورە فەرمووی ئایا تۆ ئیمانت نەهێناوە ، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی بەڵێ ئیمانم پێ هەیە بەڵام دەمەوێ دڵنیابم و دڵم موتمەئین بێ .. جا خوای گەورە پێی فەرموو چـوار باڵنـدە ڕاگـرەو ڕایان بێنە بەلای خۆتەوە تاکو باش بیـان ناسـیتەوە ، پاشـان بیـان کـوژەوەو پارچـە پارچـە ئێسکەکانیان هەر هەندێکی بخەسەر شاخ و چیایێ ، پاشان بانگیان بکە وەکو بلێی زینـدوو ببنەوە بەئیزنی خودا ئەو کاتە دەبینی بەزیندویێتیەو گورج و گۆڵ دێنەوە لات، وەبزانە و فێرە

ئەو زانیاریـیە ببە کەخودای گەورە بێگومان عەزیزو حەکیمەو شـکۆمەندو دانایــە ، خـاوەن عیززەت و کارزانە توانادارو کار بەجێیە ..

بەڕێزان لەم ئایەتەشدا چەند لایەنە عەزیزایەتیەکی خودای گەورەمان بـۆ روون دەکاتــەوە وەکو زیندووکردنەوەو دڵ و دەروون اتمئنــان کـردن، دیــارە ئەنجامــدانی ئــەو کارانــەش هــەر بەعەزیزایەتی خودای گەورە دەکرێ کەسێ تر نیە ئەو سیفەتەو ئەو توانایەی تیـابێ مەگـەر خوای گەورە بەشێکی کەمی بۆ ماوەیەکی کەم وەکو موعجیزەیێ بەپێغەمبەرێکی بەخشیبێ دەنا ئەصڵ و بنچینەی ئەم سیفەتە هەر هی خودای گەورەیەو هەر شایستەی ئەوە .

٣ – بـەڕێزان هــەروەها خــوای گــەورە لەســورەتی (ال عمــران) دا لەئایــەتی (٥ و ٦)دا دەفەرموێ ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَخْفَى عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ(٥)هُوَ الَّذِي يُــصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ واتە بەڕاستی خوای گەورە هیچ شــتێ لێی شاراوە نییەو نابێ جا چ لەزەوی بێ وەیا لەئاسمان، هــەر خــۆی وێنــەو نیگــای ئێــوەی کێشاوە لەناو رەحمی دایکتانا، ئەم کارەشــی بەخواســتی پــڕ لەحیکمــەت و دانــایی بەســەر بردووەو ئەنجامی داوە، وەهیچ ئیلاه و پەرســتراوێ نیــەو نــەبووەو نــابێ تــەنها خــۆی نــەبێ کەعەزیزو حەکیمە شـکۆمەندو دانایــە خـاوەن عیــززەت و کارزانــە توانـاداری بــێ ســنورو کاربەجێیە ..

بەڕێزان لەم ئایەتانەشدا چەند لایەنە عەزیزایەتیەکی خودای گەورەمان بۆ روون دەبێتەوە، کەبریتییـە لەوەی کەهیچ شتێ لێی شاراوە نییەو نابێ جا لەهەر شوێنێ بێ وەخـۆی تــەنها وێنەو نیگای نادەمیانی کێشاوەو دەکێشێ ، بەڕاستی ئەم کارانەش هەر بەعەزیزایەتی خوای گەورە دەکرێ کەسێکیتر نییە توانادار بــێ بــەو کــارە یــا شایەســتەبێ ، بۆیــە هــەر خــۆی شایستەی پەرستراویتییە بەهەمموو ماناکەی خۆی .

٤ – گوێگرانی بەڕێز هەروەها خوای گەورە لەسـورەتی (الانفـال) دا لەئایـەتی (٦٣) دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە خودای گــەورە تــەئلیفی دلانــی موســڵمانەکانی کــرد کەبەیەکەوە هۆگربن و دوبەرەکیو دودڵ و دڵەڕاوکەی لــەناویانا لابــرد ، ئەمــەش کــاری پــڕ

نیعمەت و بەخششی خودابوو، ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر تۆ مولکی هەموو زەویت لەدەست بایاو سەرفت بکردایەو بت کردایە خەرجی لەپێناو ئەوەی دڵیانت بکردبا بەیەك نەتدەوانی بەڵام خودای گەورە دڵیانی کرد بەیەك، بەڵێ بەیەك رێباز یەك هەڵوێست و یەك ئاوات و یەك مەبەست کەلەدونیای ئیماندا کۆی کردنەوە ، ئەمەش تەنها کاری خوایەو هەر بەخودا دەکرێ ، چونکە هەر ئەو عەزیزو حەکیمەو تواناداروکاربەجێیە شکۆمەندو دانایە ، خاوەن عیززەت و کارزانە . ئەگەر لەم ئایەتەش ووردبینەوە چەند لایەنە عەزیزایەتیەکی تری خوای گەورەمان بۆ روون دەکاتەوە وەکو تێمان دەگەیەنێ و حاڵیمان دەکا کەتەنها عەزیزایەتی خوای گەورەیە بەخواستی پڕ حیکمەت و دانایی خۆی مامەڵە لەگەڵ دڵەکان دەکاو یەکیان دەخا یا لێکیان دەکا گەورەترین پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر هەموو مولکی دونیاشی لەدەست بێ ئەم کارەی پێ ناکرێ ، چونکە ئەم کارە کاری عەزیزە کەسیفەتی خودای کار جوان و بەجێیە .

٥ – بەرێزان هەروەها خوای گەورە لەسورەتی ال عمران دا لەئایەتی (١٢٣ – ١٢٦)دا دەفەرموێ : ﴿ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَنْ يَكْفِيَكُمْ أَنْ يُمِدَّكُمْ رَبُّكُمْ بِثَلاَثَةِ آلاَفٍ مِنْ الْمَلاَئِكَةِ مُنْزَلِينَ(١٢٤)بَلَى إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلاَفٍ مِنْ الْمَلاَئِكَةِ مُسَوِّمِينَ(١٢٥)وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُمْ بِهِ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ .

واتە ئەی پێغەمبەری خودا کاتێ کەدەتفەرمووە خاوەن باوەڕان ئایا کافیتان نیە یان اکتفاتان ناکات بەوەی کەپەروەردگارتان باربووتان و کۆمەکتان بکات وەیارمەتیتان بدات بەدابەزاندنی سێ هەزار فریشتەو مەلائیکە ، بەڵێ ئەگەر ئارام و صەبرتان هەبێ و تەقوای خوداش بکەن پێتان دەگات کۆمەك و یارمەتی یەکسەر لەکاتی پێویستیتان ئاوا یارمەتیتان دەدات بەپێنج هەزار مەلائیکەو فریشتانێ کەفێرکراوی شەڕو جەنگاوەرین ، وەخودای گەورە ئەم جۆرە کۆمەك و یارمەتیەی ئیماندارانی دانەناوە تەنها بۆ مزگێنی و بەشارەت نەبێ بۆتان ، وە بۆ ئەوەی دڵنیابن و دڵتان موتمەئین بێ لەسەر ئەم راستیەو سەرکەوتن ، وەسەرکەوتن نیە ئیللا لەلای خودای گەورەوە نەبێ ئەو خودایەی عەزیزو حەکیمە تواناداروکارلەجێیە خاوەن عیززەت و کارزانە .

ئازیزان ئەگەر لەم ئایەتانــەش ووردبینــەوە چــەند لایەنــە عــەزیزایەتیــەکی خودامــان بــۆ دەردەخات ، کەکۆمەکی ماددی و مەعنەوی بیّ ویّنــە هــەر لای خۆیــەتی هــەر بەخواستــی خۆیەتی بیدا بەهەر تاقم و کۆمەڵیّ دەیدا ، وەئەگەر نەشی دات کەسـیّ نیـە ئـەم توانایـەی هەبیّ و ئەم دەورەو کارەی پیّ مایەسەر ببیّ ، هەروەها کلیلی سەرکەوتن و سـەرفرازی هـەر لەلای خۆیەتی هەر عیززەت و دانایی بیّ ویّنەی ئەو دەورە بینی ..

٦ – هەروەها خودای گەورە لەسورەتی (ابراهیم) لەئایەتی یەکەمدا دەفەرمویّ : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * الر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّــورِ بِــإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾ واتە ئەلیف ، لام ، را ، کیتابیّکە دامانبەزانـدووە بـەلای تۆ ئەی پیّغەمبەری خودا بـۆ ئـەوەی خـەڵك و مــەردووم رزگـار بکـەیت و دەریـان بهـیّنی لەگومڕایی و تاریکاییان بۆ لای ریّگەی نورو هیدایەت بەخواست و ئیزنی پەروەردگاریان بـۆ سەر راستە شەقامی خودای عیززەت و حەمید .

٧ – هەروەها خودای گەورە لەسورەتی (صف) دا لەئایەتی یەکەمدا دەفـەرمویّ : ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيــزُ الْحَكِــيمُ ﴾ الصف/١ .

واتە پاکیو بیّگەردی خودای گەورە دەنویّنیّ و تەسبیحاتی دەکات هەرچی لەئاسمانــەکان دا هەیە وەهەرچی لەزەویــدا هەیــە ، ئـەو خودایـەی کـەخۆی عــەزیزو حەکیمــە ، خـاوەن دەسەڵات وکارجوانیيە شکۆمەندو دانایە ..

لەم ئایەتانەشدا ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کـەعیززەتی خـودای گـەورە هیّنـدە بـەهیّزە هەرچی لەکەون دا هەیە گشتی موشتاق و اشتیاقی تەســبیحات و کرنـوش بردنــە بـۆ ئـەو، گشتیان لەبەر عیزەت و شکۆمەندی ئەوا خۆیان بەزەلیل و ملکەچ دەزانن ، وەئـەوەشمان بـۆ روون دەبیّتەوە پرشنگی عیززەت و بەرەکەتی ئەوە بۆتە مایــەی نـاردنی کیتـاب بـۆ ئـەوەی خەڵکان و مەردووم لەویّلی و گومڕایی دەربیّنیّ و بیان خاتە سەر راستە شەقامی عیــززەت و سوپاس گوزاری .

ئازیزان عـەزیزایەتی خودای گەورە لەپاڵ دانایی بیّوێنەو زانیاری بیّ سنوریەتی، هەروەها لەپاڵ حەق پەروەری و رەحم و کەرەمیـەتی هەروەها لەپاڵ لیّبوردەییو سـوپاس گوزاریــەتی ،

خودای گەورەو میهرەبان لەسورەتی (ال عمران) لەئایەتی (١٨)دا دەفـەرموێ ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُوا الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ واتە خودای گەورە شاهێدی داوە کەهیچ پەرستراوێ نیە تەنها خۆی نەبێ ، هەروەها فریـشتەکان هـەمان شاهێدییان داوە، وەئەوان کەسانەی کەخاوەن زانیارین کەدادپـەروەری کـارو هەڵوێـستیانە ، هیچ پەرسـتراوێ نیـە تـەنها خـۆی نـەبێ کەعـەزیزو حەکیمـە خـاوەن عیـززەت و کارزانـە شکۆمەندو دانایە ..

پرشنگی عەزیزایەتی خودای گەورە ئاسمانەکان و زەوی پڕکـردووە هێنـدە ئاشـکراو زۆرو بەهێزە تەنانەت شـەیتانی لـەعینیش بـەو نەفـسە پـیس و پۆخڵەیـەوە نـەیتوانیوە حاشـا لەعەزیزایەتی خودای گەورە بکات ، بگرە بەخۆی نەوەستاوەو قەسەمی بـەعیززەتی خـودای گەورە خواردووە ، وەکو خـودای گـەورە بۆمـان دەگێڕێتـەوە لـەقورئان کەشـەیتان سـوێندی بەعیززەتی ئەو خواردووە بۆ گومڕاکردنی خەڵکان .. وەك کەدەفەرموێ : ﴿ قَـالَ فَبِعِزَّتِـكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ ص/ ٨٢ ، هەروەها خودای گەورە بەشێ لـەم سـیفەتەی کـەعیززەت و عەزیزێتیـیە داوە بەقورئانی پیرۆز وەکو خـۆی دەفـەرموێ : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّـا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ(٤١)لاَ يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلاَ مِنْ خَلْفِهِ تَنْـزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فصلت / ٤١ – ٤٢ .

واتە : بەڕاستی ئەوانەی کافرو بێ باوەڕن بەقورئانی پـڕ یـادو زیکـر لـەو کاتـەی بۆیـان هاتووە وێڵ و گومڕان چونکە بەڕاستی ئەم کیتابە عەزیزەو لەلای خودای عەزیزەوە هاتووە.

چۆن ئازیز نەبێ ئەم کیتابـە سـیفاتی کـەلامی خۆیـەتی و هـەر خۆشـی دایبەزانـدووەو پارێزگاریێ لێ دەکا[1] هەروەها خوای گەورە پرشنگی عەزیزایـەتی بەخـشیوە بەپێغەمبـەری خۆشەویستمان و ناوی بەعەزیز دێنێ وەکو لەسورەتی تەوبەدا لەئایەتی (١٢٨) دا دەفەرموێ

[1] وەئەو کیتابە پیرۆزە ووتاری پووچەڵ و درۆینەو بەتاڵ و بـاتڵی تیـا نیـەو تیـا ناکـەوێ نەلەسـەرەتای و نەلەکۆتایی ، چونکە کەلام و ووتاری بەشەر نیەو بەڵکو دابەزێندراوە لەلایەن خـودای حـەکیم و دانـاو سوپاس گوزارو حەمیدەوە .

: ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ توبه / ١٢٨

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی فاطردا لەئایەتی (١٠)دا دەفەرموێ : ﴿ مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ..﴾ واتە ئەوەی داواكاری شكۆمەندی و عیززەتە ئەوە باڕوو لەخودا بكات چونكە دونیای عیززەت ئی خودایەو هەر لای خۆیەتی ، وەئەوەی عیززەتی دەوێ بالەپاڵ بیروباوەڕی خوا بەیەك ناسین و ووتارو كاری پاك و چاك ئەنجام بدات ، چونكە ووتارو كرداری چاك و پاك بەلای خوا سەردەكەوێ و بەرز دەبێتەوە جێگەی رەزامەندی ئەوە ، هەروەها لەسورەتی النساء لەئایەتی (١٣٩)دا خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمْ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ واتە : ئەوانەی بێ باوەڕان بەدۆست و پشتیوان دەگرن بێجگە لەئیماندارانی خاوەن بڕوا ، ئایا داواكاری عیززەتن بەلایانەوە جەنگیان كەوێ ، نەخێر لای ئەوان نیە بێگومان سەرتاپاو تەواوی عیززەت هەرلای خوای گەورە خۆیەتی ..

ئازیزان خوای گەورە وەكو چۆن پێغەمبەرەكەی لەپرشنگی عیززەت بێبەش نەكردووەو پێی بەخشیوە ئیماندارانیشی ئاوا لەو سیفەت و كەرەمە بەهرەمەند كردووە وەكو دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ المنافقون / ٨ . ئەو رێزو هەیبەتەی ئیماندار هەیەتی لەناو كۆڕو كۆمەڵدا كەمێ لەپرشنگی عیززەتەكەیەتی رەونەق دەداتەوە .

جا لەكۆتاییدا دەڵێین : اللهم إنّك العزيز أعزّنا وإنك الرحمان فارحمنا لاإله إلا انت العزيز الحكيم ..

## ٩ ـ الجبــــار

الجبّار : ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای دەسەڵات بێسنوور ، ئەم نـاوە یـەك جـار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە کەلەئایەتی (٢٣)ی سورەتی حەشرە ، بنچینەی ئەم نـاوە (جـبر)ە واتە ڕێك خستن .

الجبار : واتە خوای گەورە بـەرزو فـەرمان ڕەوایـە لەهـەموو ڕوو لایەنێکـەوە ، وەکـەس بەسەریا زاڵ نابێ ، خوا دەفەرموێ : ﴿ ..وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ ابراهيم / ١٥ .

واتە نائومێد و دۆڕاو بوو هەر زۆردارێکی نەسـەلمێنەری ڕاسـتەقینە .. دەسـەڵات و زۆر هەر شایەستەی خوایە — جل جلاله — ئەو دەسەڵاتەی گشت گەردوونی لەسەر پشتی ئەثیردا ڕاگرتووە .. دەسەڵات تایبەت نی‌یە بەهیچ لایەنێکەوە، نەبێ بڕوایان کەسـەرەنجام نائومێـدو تێشکاو دەبن ، وەنەبڕواداران و چاکەکاران ، بەڵکو دەسەڵاتی تەواو تـەنیا تایبەتـە بـەخوای گەورەوە ، وەدەسەڵاتی دونیای چاکەکاران تـەنها بـۆ ڕاگـرتنی دادگـەرێتی خوایـەو بـەس ، ئەمیش هێزو ڕەحمەتەو بەزەیی خوایە بۆ ئیمانداران ، ئەم ناوە جوانـەی پـەروەردگار مایـەی چەسپاندنی دادگەری‌یە لەناو جیهانەکانداو لەڕۆژی دواییشدا حوکم و فەرمان ڕەوایـی نی‌یـە تەنها بۆ خوا نەبێ وەکو دەفەرموێ : ﴿ إن الحكم الا لله ﴾ يوسف .

ئادەمیزاد کە گەورەیی بەدیهێنراوەکانە واتە بەرزترین پلـەی هەیـە لەبـەدیهێنراوەکان ، کاتێ کەتوڕە دەبێ ، هێزێکی دەروونی وای لێدەکا شێوەی ئاسـایی دڵـی بگـۆڕێ و پاشـان خوێنیشی لەسوڕانیدا نائاسایی دەبێ ، بەهۆی ڕق هەڵستانیەوە سەرەنجام جۆرێك جەبـەرووت وەبەر ئادەمیزاد ئەنێ بۆ ئەوەی ئەو ڕقەی جێبەجێ بکات ، بۆیـە دەبیـنین ، مـرۆڤ ئەگـەر لەکاتی توڕەییدا هەر بڕیارو هـەر کارێـك ئـەنجام بـدا پەشـیمانی خەجاڵـەتباری‌و نـاڕەوایی لەدوایەوە دەبێ ، ئەمەش چونکە جەبەروت لایەق و شایستەی خوایە — سـبحانه وتعـالی — وەهەر ئەو دەسەڵات و زۆریی بەسـەر ئادەمیزادو بەدیهێنراوەکانی تر ڕادەبرێ ، ئەمـەش پـڕ

بەحیکمەت و زانایی‌یەوە بۆیە پەشیمانی بەسەر خودا دانایێ ، وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴾ الانعام /١٨.

واتە ئەو بەدەسەلات و خاوەن زۆرە بەسەر بەندەكانیداو وەكارزان و زۆر زانایە لەهەموو روێكەوە وەشتێ نیە لەزانینی خودا دەرچوویێت وەیا دەربچێت : ﴿ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ المجادله .

بێگومان دەسەلات و قەهری خوایە ، یاسای هەموو بەشەكانی بونەوەری راگرتووەو پارێزگاری لێدەكات ، واتە تورەیی و زالی دەسەلاتی خوا بەزەیی‌و پارێزگاری‌یە لەبونەوەر..

هەروەها (جبار) واتاو مانای ئازایەتی دەگەیەنێ بەشێوەیەكی وا كەخەلكانی تر ناچاری خواستو ویستی خۆی بكات ، یا بەمانایێتر ئەوەی مەردووم یا چەند كەسانێ لەمەردووم بخاتە ژێر ركێفی دەسەلات و خواست و هەلوێستی‌یەوە ، جائەم سیفەتە بەحەق لەخودای گەورەدا هەیە كەخواست و ویستی خۆی بەسەر هەموو مەخلوقاتا دادێنێ بەوپەری حەق پەروەری و دانایی‌و حەكیمیەوە، وەعیلم و زانیاریان پێیانەوە هەیە ، وەبەسەریانەوە زال و دەسەلاتدارە ، ئەگەر خودای گەورە ئازادی داوە بەئادەمیزاد وەبەشێ لە (جزء)ی اختیاری پێداوە مانای وانیە ئێدی جلەوی لێبەردابێ و هەرچی بیكا بیكات نەخێر، بەلكو ئەو بەشە ئازادیەی كەبەئادەمیزادو جنۆكە دراوە لەو بازنەیە دەرناچێ كەدونیاو حیكمەتی خوای گەورە گرتۆتی‌یە ئەستۆی خۆی ، یا بەمانایێ تر هەرچی ئادەمیزادو جنۆكە دەیكات لەكارو كردەوە ، جا بڕواداربن یا بێ بڕوا، ستەمكاربن یا ستەم لێكراو، زانابن یاخود نەزان، دەسەلاتداربن یاخود بێدەسەلات، گشتی لەدونیاو بازنەی حیكمەت و دانایی خودای گەورەدان ، هیچ كەسێ یا هیچ مەخلوقێ نەیتوانیوەو ناتوانێ كارێكی وائەنجام بدات كەبكەوێتە دەرەوەی سنوری حیكمەت و دانایی خودای گەورەوە ، جا كەواتە خوای گەورە (جبار)ە گشت مەخلوقاتی ناچاری بازنەی حیكمەت و دانایی خۆی كردووە ، جابیەوێ یا نەیەوێ چاری نیەو ناتوانێ لەم بازنەی حیكمەت و دانایی خوای گەورە دەربچێ ..

جا ئەو کەسانەی ئەم سیفەتە بۆ هەواو ئارەزووی خۆیان بەکار دێنن وەئازادی لەخەڵك و مەردووم زەوت دەکەن و ناچاری خواست و ویستی وێڵی و گومڕایی خۆیانیان دەکەن بەڕاستی ئەمانە داوای سیفەتێ دەکەن کەشایستەیان نی‌یەو ، خودای گەورە لێیان قەڵسەو ، رق و قینی لێیانە ، چونکە ئەم سیفەتە هەر شایستەی خودای گەورەیە هەر خۆی (ارحم الراحمین)ە بەمەخلوقاتی خۆی وەهەر خۆی حەقی سەرپەرشتیکاری و بەڕێوەبەرایەتی هەیە بەسەریانەوە وەهەرخۆی زانیاری تەواوی پێیانەوە هەیە وەهەر خۆی حەکیم و دانایی بێ وێنەیە، ئەوانەی گیانی سەربازێتی‌یان بۆ خوای گەورە تیا دروست نابێ ، بەڵکو لەبیری ئەوەدان خۆیان بکەن بەکوێخواو ئاغای مەردووم و مەزڵومان بکەن بەسەرباز بۆ خۆیان و بەزمانی حاڵ ئالای پەرستراوێتی بۆ خۆیان هەڵکەن وەلەسەر حیسابی ئەم و ئەوا ئاغای شەیتانیان رازی کەن، بێ ئەوەی بیزانن و یا ئاگایان لێ بێ یا هەستی پێ بکەن خۆیان ئارایشدەن بەسیفەتی (جبار) بەڕاستی ئەوانە خۆیان و دواکەوتوانی دوای خۆیان بەرەو هەلاك و خەسارەتمەندی دەبەن وەکو خودای گەورە دەفەرموێ ﴿ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴾ ابراهیم / ١٥ . هەروەها مۆری بەدبەختی و نەفرەت دەدرێ لەدڵیانا وەکو خودای گەورە لەسورەتی (غافر) ئایەتی (٣٥) دا دەفەرموێ : ﴿ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ وَعِنْدَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾

بەڕاستی ئەم سیفەتە هەر شایستەی خوای گەورەیە و هەر لەوا دێت هەر بۆ ئەو جوانەو لەجێگای خۆیەتی ، لەئادەمیزادو جنۆکەو ئەوەی بەم سیفەتە خۆی ئارایش بدەو ئیدیعاو داوای بۆ بکات بەڕاستی ئەمە نەخۆشی‌و نەفامی‌یە، وەبێ‌ئاگایی‌یە لەناسینی حەقیانەتی خودای میهرەبان وەبێ باوەڕی‌یە بەرۆژی قیامەت ، جابەڕاستی ئەم نەخۆشی و نەفامی‌یە بکەوێتە ناو هەر کۆڕو کۆمەڵێ بەفەناو خەسارەت مەندیان دەبات .

خوای گەورە ئێمەو گشت موسڵمانانی لێ بپارێزێ

وەگیانی سەربازێتی و جوندێتی‌مان بۆ خوای گەورە پێ ببەخشێ .

## ١٠ـ المتكبر

المتكبر : ناوێکه لەناوه پیرۆزەکانی خوای گەوره ، یەك جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووه کەلەئایەتی (٢٣) سورەتی حەشره ، بنچینەی ئەم ناوه (کبر)ه واته گەورەییو بەرزی .

المتکبر : واته خوای تاك و تەنها خاوەنی هەموو گەورەیی و بەرزییەکه ، هەموو شتێ و هەموو بەرزێ لەئاست ئەوا نزمه ، کەموکوڕی و بێ دەسەڵاتی و ناتەواوی بەسەریا نابێت وەکو خوای گەوره دەفەرموێ :

﴿ وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ الجاثية / ٣٧ .

واته گەورەیی و دەسەڵاتی بێ پایانی هەر بۆ خوایه لەئاسمانەکان و لەزەویدا ، ئەو خوایه خۆی بەعیززەت و زاڵ و دانایه لەکارو فەرمانەکانیدا .. خۆ بەگەوره زانین لەدەسەڵات و دانایی هەر شایانی خوایه و بەس ، کەسێ بۆی نیه لووت بەرزی بکات ، لەحەدیسی قودسیدا هاتووه کەپێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ خوای گەوره دەفەرموێ } العظمة إزاري والكبرياء ردائي فمن نازعني بواحد منهما عذّبته { رواه مسلم .

واته : هەرکەسێ کێ بەرکێ بکات و خۆی بنوێنێ لاسایی ئەو بکاتەوه خوای گەوره ئازارو ئەشکەنجەی دەدات و ریسوای دەکات لەدونیاو قیامەتدا .. بۆیه ئەم نازناوه تەنها تایبەتی و شایستەی خوای گەورەیه چونکه بەتەواوەتی لەدروست کراوەکانی تەواوترو بەرزترو بڵندتره .

جابابزانین هەر خوای گەوره شایستەی تەکەببوره ، چونکه هەر خۆی دووره لەهەموو کەم و کوڕیەك وەخاوەن هەموو زانیاریەکەو دەسەڵاتی بێ سنورەو حەق پەروەررەو زوڵم و ستەمی لەسەر نەفسی خۆی حەرام کردووه ، شەیتان یا نەفسێ تر ناتوانێ پەنجە بخاتە کارو هەڵوێستی ، هیچ کارێکی بێ حەکیمی و دانایی ئەنجام نادات ، وەهەر خۆی مەلیکەو قووددوس و سەلام و موئمین و موهەیمین و عەزیزو جەببارو موتەکەببیره وەکو دەفەرموێ ﴿ هُوَ

اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ الحشر / ٢٣.

جا لەمانای (سبحان الله عما يشركون)دا دەردەكەوێ ئـەوەی سـيفەتێكی خـوای گـەورە كەهەر شايستەی ئەوبێ بۆ خۆی يا بۆ مەخلوقێ تر بانگەواوزی بۆ بكـات كـە تەكـەببوريش يەكێ لەم سيفەتانەيە، وەكو ئەوە وایە كەخۆی كردبێتە شەريك و هاوبەش بـۆ خـودا ، هـەر لەبەر ئەمەشە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی } الا اخبركم بأهل النار ، كـل عتـل جـواظ مستكبر {متفق عليه .

واتە : ئايا هەواڵتان بدەمێ كێ ئەهلی ئاگرە ؟! هەموو لـوت بـەرزو موتـەكبيرو ووشـك تەبيعاتێ ..

ئەوەی شايانی باس بێ هەموو شتێ يا هەموو مـەخلوقێ هـەر يەكـەی يـا هـەر جـۆری بەپێی ماهيەت و ناوەڕۆكی خۆی قيمەت و پلەو نرخی خۆی پێدراوە لەلايـەنی بـەديهێنراوو خاليقەيەوە ، لەم بەديهێنراو مەخلوقانەش وەكو جن و ئادەميزادو فريشتەو باقی مـەخلوق و بەديهێنراوەكانی تريش ، جا ئەوەی ئێمە كارمان پێيەتی و پێويـستە بيـزانين پلـە و پايـەی ئادەميزادە .

بەڵێ خوای گەورە ئادەميزادی كردووە بەخەليفەو جێنەشين لەسەر ئـەم زەويـيـەدا بـەڵام ئەنجامی پايـەو پلـەی بەسـتۆتەوە بەسـەرەنجامی ئـەو تاقيكردنـەوەی لـەژيانی دونيایـدا ، وەبەپێی ماهيەتی خۆی لەپلەو پايەی سەردەكەوێ يا دادەبـەزێ، جـا چـارەنووس و مايـەی بەختەوەريشی داوەتەوە دەستی خۆی وەبەشێ لەئازاديشی پێ بەخشيوە وەكـو خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿ وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ كِتَابًـا يَلْقَـاهُ مَنشُورًا(١٣) اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾ اسراء / ١٣ – ١٤ .

واتە : هەريـەكێ لـەئادەميزادەكان مايـەی شـوم و بەختـەوەری خـۆی هاويـشتومانەتە ئەستۆی خۆی ، جالەرۆژی قيامەتدا ئەو كيتابەی دەردەكەين كەلەژيانی دونيایدا تۆمارمان كردووە لەكارو كردەوەو هەڵوێستی خۆی پێی دەگاتەوە پێی دەوترێ بخوێنەوە كيتابی خـۆت

ئەمڕۆ نەفس و کارکردەوەی خۆت کافیەو بەسە لەسەر بەدەرخستنی ماهیەتت ، وە ئـەنجام و پلەی ماهیەتی خۆت چارەنووست بۆ دیار دەکات.

لەحەقیقەتدا خوای گەورە فەزڵی زۆر کەسی داوە بەسەر کەسانێ تر، ئەمەش حیکمەت و دانایی پڕ لەزانیاری و حەق پەروەری خۆی وا دەخوازێ ، بۆ نمونە خوای گەورە گەورەیی پلـەو پایەی بـەرزی و فـەزڵی ئیمانـدارانی داوە بەسـەر بێبـاوەڕان، لـەناو ئیمانـدارانیش فـەزڵی پێغەمبـەرانی داوەو پلـەو پایـەی بەرزکردنـەوە بەسـەر بـاقی ئیمانـدارانی تـر ، لـەناو پێغەمبـەرانیش (علـیهم الـصلاة والـسلام) فـەزڵی زیـادی داوە بەهەنـدێکیان کـە (اولـو العزم)ەکانن بریتین لەحەزرەتی (نوح و ابراهیم و عیسی و موسـی و محمـد ) (علـیهم الـصلاة والـسلام) و فـەزڵی پێغەمبـەری ئێمـەی (محمـد)ی داوە بەسـەریانا ، جـا ئادەمیزادەکـان هەریەکەیان ئەو پلەو پایەیان لەبۆ هەیە کەخۆی کاری بۆ کردووەو بۆی تێکۆشاوە وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ وَهُـمْ لاَ يُظْلَمُـونَ ﴾ الاحقاف / ١٩ .

هەروەها خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلْآخِـرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً ﴾ الاسراء / ٢١ .

واتە بڕوانەو سەیرکە چۆن لەئادەمیزادەکان هەندێکیانمان پلەو پایەو فـەزڵ و بەخشـشمان زیاد پێداون بەسەر هەندێکی تریانەوە لـەرۆژی دواییـشدا پلـەو پایـەی گـەورەتر فـەضـل و کەرەمی زۆرتر لەئاڵادا دەبێ و شایستەی هەندێکیان دەبێ بەسەر هەندێکی ترا .

هەروەها خوای گەورە لەناو مەلائیکەو فریشتەکاندا فـەضـل و پلـەو پایـەی زیـاتر داوە بەمەلائیکە موقەرەبینەکان بەسەر ئەوانی تردا کەبریتین لەجوبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل و عیزرائیل کەمەبەست لەفریشتەی مردنە ..

هەروەها خوای گەورە لـەناو کـانزاو مـەعدەنـەکانیش فـەزڵی هەنـدێکیانی داوە بەسـەر هەندێکی‌تردا ، هەروەها خوای گەورە لەناو مانگەکاندا فەزڵی داوە بەمانگی رەمەزان بەسەر مانگەکانی ترداو لەناو رۆژەکانی حەفتەدا فەزڵی داوە بەرۆژی هەینی بەسەر رۆژەکانی‌دا .

هەروەها خوای گەورە لەناو کاتژمێری رۆژێکا فە زڵی داوە بەسـێ یـەکی دوای شـەو بـۆ عیبادەت بەسەر کاتژمێرەکانی تری ئەو رۆژو شەوەدا .

هەروەها خوای گەورە فەزڵی داوە لەناو کتێبەکانا هەندێکیان بەسەر هەنـدێکی تریـان ، وەکو فەزڵی داوە بەقورئان بەسەر تەورات و ئینجیل و زەبوردا وەئەمانەش بەسـەر کیتابـانی تری ئادەمیدا .

جا بەڕاستی خوای گەورە بەحیکمەت و دانایی خۆی فەزڵ و کەرەم دەبەخشێتەوە بەسـەر هەر جۆرە مەخلوقێ کەخواستی لێ بێ تەنانەت هەندێ گوڵی بۆن خۆشتر داناوە لەهەنـدێکی تر .. جا ئەم هەموو تەفاوت و جیاجیاییە لەفەزڵ و کەرەمدا گەورەیی و دەسەڵاتی بێ‌پایانی خوای گەورە دەنوێنێ، وەکو بەخشش و فەزڵ و کەرەمی خوای گـەورەش دەخاتـە ڕوو کـەبێ وێنەیە لەم ڕووەوە .

جا ئادەمیزاد ئەگەر خوای گەورە ئازادی پێداوە پێویـستە مـەقام و پلـە وپایـەی خـۆی بزانێ و تەجاوز نەکات لەریزو قەدری خۆی ، ڕێزو پلـەو پایـەی وی لـەدونیای ئادەمێتی‌یـە، بۆی نیە تەکەببور بکات چونکە تەکەبور شایستەی خوایەو بەس، تەکەبوور لەحەقیقەتدا پلەو پایەی ئادەمیزاد تێك دەشکێنێ و نزم و ریسوای دەکات چونکە ئادەمیزاد ئـادەمیزادە نـابێ کاڵاو باڵایێ شایانی نەبێ خۆی پێ ئارایش بدا.. ئـەوەی ئـادەمیزاد بـەرز دەکاتـەوە بـەلای خوای گەورە (تواضع)ە کەپێچەوانەی تەکـەببورە وەکـو فەرمویانـە مـن تکبّـر تکسّر ومـن تواضع رفعـه الله ، ئەوەی لوت بەرزی بکات تێ دەکەوێ و تێ دەشکێ وەئـەوەی تـەوازوعی هەبێ خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە، لەفەرمودەیەکی قودسی هاتووە لەکیتابی (تاج) بـەرگی پێنجەمدا باس دەکات خوای گەورە دەفەرموێت من تەماشای دڵی خەلایق و مـەخلوقاتم کرد کەسم لەحەزرەتی موسا و بەتەوازوعتر نەدیت بۆیە هەڵمبژاردو کردمە پێغەمبەر ، هـەروەها

وەیسی قەرەنی رەحمەتی خوای لیّ بیّ فەرمویەتی زۆر لەدوو گەورەیی گەڕام هیچ گەورەییەکم لەوە باشتر نەدیتەوە کە ئادەمیزاد تەوازوعی هەبیّت .. لوت بەرزی نەخۆشیەکی نەفسی و دەروونی کوشندەیە بیّجگە لەوەی خاوەنەکەی ریسوا دەکات بەلای خوای گەورە، باری کۆمەلاّیەتی تیّك دەشیّویّنیّ و کۆمەلّ پارچە پارچە دەکات و یەکیّتی و تەباییان لەنیّوان هەلّدەگریّ و بزیّوی و نارەحەتی بەناو گەل و نیشتمان بلاّو دەکاتەوە ، هەروەها پیّغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمویّ } لایدخل الجنة من کان في قلبه ذرة من الکبر { واتە ئەوەی هەندیّ تۆزقالّە زەرڕەیەك تەکەبوور و لوت بەرزی لەدلّیابیّ ئەوە ناچیّتە بەهەشت . رواه مسلم .

## ١١ ـ الخالق

الخالق : ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای شایان بەهەموو گەورەیی و بەرزییەك ، ئەم ناوه (٨) جار لەقورئانا هاتووه ، بنچینەی ئەم ناوه (خلق)ه واته بەدیهێنانی هەر شتیٚ بەرێك و پێکترین شێوه ..

الخالق : واته خوای گەوره بەدیهێنەری بەدیهێنراوەکانه لەنەبوونەوه بۆ بوون ، بیٚ ئەوەی کەپێشتر هیچ جۆره بونێکیان بوویٚ ، بەجوانترین و رێکو پێکترین شێوەو ئەندازه هێناویەته گۆڕەپانی بوونەوه .. لەزۆر ئایەتا خوای گەورەی باسی خالقێتی خۆی دەکات وەك : ﴿..اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ.. ﴾ ابراهيم / ٣٢ .

واته : زاتی (الله)یه ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوه لەنەبووەنەوه بۆ بوون ، بیٚ ئەوەی کەرەستەی خاو لەئالآدابیٚ .. هەروەها دەفەرمویٚ : ﴿..مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى.. ﴾ الروم / ٨ .

واته : خوا ئاسمانەکان و زەوی بەدی نەهێناوه تەنها بەحەق نەبیٚ ، وه بۆ کاتێکی دیاری کراو .. خالقێتی سیفەتی خوایه وەلەسەر خوایه بەجێگەیاندنی سیفەتەکانی ، چونکه گشت سیفەتەکانی حیکمەو زانایی دادپەروەرێتیو راست پەروەرییه هەروەها دەفەرمویٚ : ﴿ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ ﴾ الجاثية / ٢٢ .

واته : خوا ئاسمانەکان و زەوی بەحەق بەدیهێناوه ، وەبۆ پاداش دانەوەی هەموو کەسیٚ بەوەی کاری بۆ کردووه .. ئەم سیفەته تایبەته بەس بۆ خوای گەورەو کەسیٚ ناتوانیٚ پێشولەیی بهێنێته کایەوه . هەرچەنده پشتیوانی زۆرین لەجنۆکەو ئادەمی ، وەیا دەسەلآت و هێزی هەبێت، ئەوەشمان لەبیر نەچێت کەبەدیهێنان واته هێنانەرِوی شتیٚ لەنەبونەوه بۆ بوون بەبیٚ کەرەستەی خاو ، بەلآم دروست کردن بریتییه لەئالۆگۆرِ کردنی هەندێك لەدروست کراوبووەکانا ، کەواته هەرچی بونەوەره (جا ئادەمیزادەکان بیٚ یا ئاژەلٚ و بالندەکان بیٚ یا زیندەوەره بچوکەکان بیٚ یا دارو بەردەکان بیٚ یا دەریاو ماسییەکان بیٚ یا چیاو دەشتاییو

بیابانـەکانی بـێ یـا ئاسمـان و ئەسـتێرەکان بـێ .. هتـد، گـشتیان لای خـوا بـەدیهێنراون لەنەبوونەوە بۆ بوون .. وە ئادەمیزادی خواناس هەرگیز بێ ئاگاو غافڵ نابێت لەپەروەردگاری گەورەیی .. وەك چۆن تەشبیهی گەر هۆنراوەی شاعیرێ بخوێنیتەوە شاعیرەکە بەشێکی لـەدڵ و فکریدا گرتووە ، تا شیعرەکانی لەبەردەستی بـێ، یـا بەمانایـەکیتر چـۆن یـەکێ بەسـەیر کردنی هۆنراوە یەکسەر شـاعیرەکە دێتـە بەرچـاوی ژیریـو بـیری ، ئاوەهـاش ئـادەمیزادی خواناس بەدیتنی بەدیهێنراوەکانی خوا دەسەڵاتی گەورەو فراوانی خوای لەبەر دڵ و دەرونیـدا ئەدرەوشێتەوە .. یا وەك تەشبیهی نـەبێ دیـتنی وێنەگایـەك وێنـە کێـشەکە دەخاتـە ڕوو، ئاوەهاش ئەم بوونەوەرە خوا لەبەر بیروهۆش بـزر ناکـات .. هـەموو سـیفاتە بـەرزەکانی لێ ڕەنگ دەداتەوە لەمانەش خالیقێتی ..

ئـازیزان .. خـوای گـەورە وەك چـۆن خـالیقی مەخلوقاتـەو بـەڕێوەیان دەبـات لـەڕووی ماددیاتــەوە، لــەڕووی مەعنەویاتیــشەوە فەرامۆشــی نــەکردوون، ئــەوەی پێداویــستی بەدیهێنراوەکان بێ پێی داون وەکو روح و عەقڵ و هیدایەت و مەعریفەت و هەست و نـست و شعور..هتد ، جا دەستی میهرەبانێتی گرتووە پێیانەوە بەڕێوەیان دەبات بەوپەڕی دانـاییو زاناییەوە ، لەو مەخلوقانەی خوای گەورە بەهرەمەندی کردوون و پلەو پایـەی پێـداون وەك ئادەمیزاد کەخوای گەورە لەخۆرو قوڕ بەدیهێناوە ، پاشان لـەروحی خـۆی فـووی پیـاکردووە هەست و نست و عەقڵ و شعور و گوێچکەو چاوو دڵی پێ بەخـشیوە ، وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿ هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا(١)إِنَّا خَلَقْنَـا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا(٢)إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ الانسان/١ ـ ٣ .

واتــە بێگومــان زۆر ئــان و زەمــانی رابــوردن لــەپێش بــەدیهاتنی ئــادەمیزاد ، کەســێ لەئادەمیزاد نەبوو تاکو باس و یادی بکرێ ، ئێمە خۆمان ئادەمیزادمان بەدیهێنا لەنوطفـەی تێکەڵاو لەعونصری جیا جیا بـۆ ئـەوەی تـاقی بکەینـەوە جـا گوێـچکەو هەسـت و بینـاو شعورمان پێـدا، ئەوسـاش ئێمـە خۆمـان ڕێنومایيمـان کـرد بـەلای دوو ڕێگـا، ئازادیمـان پێبەخشی جا یا ڕێگای سوپاس گوزاری و هیدایەتی راستە شەقامی خوایی، یانیش ڕێگـەی

سفلەیی‌و بیٚ باوەڕیی و حەق پۆشی و شـەیتانی .. هـەروەها لـەو بەدیهیٚنراوانـەی کـەخوای گەورە بەهرەمەندی کردوون و پلەو پایەی پیٚداوون جنۆکەیە وەکو خوای گەورە دەفـەرمویٚ : ﴿ وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ ﴾ رەحمان/١٥ . خوای گەورە ئادەمیزادو جنۆکـەی لەیـەك تای تەرازووی داناون وەبەدیهیٚناون بۆ بەندایەتی وەکو خـوای گـەورە دەفـەرمویٚ : ﴿ وَمَـا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ ﴾ ذاریات / ٥٦ .. لەم ئایەتەدا روون و ئاشکرایە کەخوای گەورە ئادەمیزادی بەدی نەهیٚناوە بـۆ بەندایـەتی نـەبیٚ کەواتـە وەزیفـەو کـاری سەرشـانی ئادەمیزاد بەندایەتی خوای گەورەیە .

ئەوەی شایانی باس کردنە هەنـدیٚ کـەس وا حـاڵی بـوون بەندایـەتی و عیبـادەت بـەس بریتی‌یە لەنوێژوو رۆژی -ئەوەی راستی بیٚ نوێژو رۆژی بەشێکن لەعیبادەت و بەندایەتی نەك هەمووی - بەندایەتی ئاسۆیەکەی گەلیٚ فراوانە وەکـو لـەم ئایەتـەدا دەردەکـەویٚ کـەخوای گەورە دەفـەرمویٚ : ﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَاي وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ(١٦٢)لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴾ انعام / ١٦٢ـ ١٦٣ .

واتە : بفەرموو بێگومان نوێژەکانم و کارە بەندایەتیـەکانی تـرم لەبەندایـەتی و قوربـانی وەگشت ژیانم و مردنم بۆ خودایە کەپەروەردگارو بەڕێوەبەری جیهانەکانە ، وە ئەو زاتە هـیچ شەریك و هاوبەشی نیە ئا بەمەوە فەرمانم پیٚکراوە، وەمن لەیەکەم موسڵمانانم ، جا کەواتە بەندایەتی و عیبادەت هەموو ژیان و مردنیش دەگرێتەوە ئاسۆی خۆی ، وەلەمانای (لاشریك لە) ئەوە هەڵدەگریٚ کەژیان و مردن و نوێژو قوربانی و باقی فەرمانەکانی تری ئاین گـەر بـۆ غەیری خوابن ئەوە مانای شیرك دەگەیەنیٚ — با خاوەنەکەی ئیدیعای تاکو تـەنهایێتی خـوای گەورە بکات ، وەلەفەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستیش (صـلی الله علیـە وسـلم) ئـەم راستیە روون و ئاشکرایە کەهەموو کارو هەڵوێـستێکی ئـادەمیزادی ئیمانـدار عیبـادەت و بەندایەتی‌یە ، بەڵیٚ هەستانی دانیشتنی رۆیشتنی نـان خـواردنی کـارکردنی نوسـتنی هـەر گشتیان عیبادەت و بەندایەتین بۆ خوای گەورە بەمەرجیٚ تێیانـدا نەکەوێتـە عـصیان و بـیٚ شەرعی ، هەروەها بیروباوەڕەکەی تاك پەرستی کەئاینی ئیسلامە وای لیٚ حاڵی ببیٚ کەتەنها

ئەو بەرنامەی خودایەو باشترین رێگەیە بۆ شەق کردن و  بڕینی ژیان، یـا بـەمانایێتر خـوای گەورە ئادەمیزادی بۆ ئـەوە بـەدیهێناوە ببێتـە پیـاوی ئـەو سـەربازی ئـەو لەرێگـەی ئـەو بەرنامەیەی کەبەپێغەمبەران بۆی دەنێرێ ، ئیمانی پێ بـێنێ و پـشتیوانی لێبکـاو هـەوڵی سەرخستنی بدا – جـا ئەمـە ئـەو قەصـدو مەبەسـتەیە کـەخوای گـەورە ئـادەمیزادی بـۆ بەدیهێناوە، لەولاشەوە شەیتان و سـەربازانی خـەلق کـردووە تـاکو ئـادەمیزادی پـێ تـاقی بکاتەوە ئاخۆ ئەم ئادەمیزادە تا چ رادەیەك پاکەو پاکی دەوێ، باکـارو کـردەوەو هەڵوێـستی خۆی دەربخاو پلەو ماهیەتی خۆی دیار بکەو بەئەنجامی بگات.

بەڵێ هەر مەخلوقێ وەزیفەی خۆی هەیەو لێیوە وەدرەوەشاوەو ئاشـکرایە، بـۆ نمونـە وەك مێش هەنگوین ئەوە دیارە بۆچی خـەلق بـووەو وەزیفـەی چـیـیە ، هـەروەها مـەڕومالاَت ، هەروەها وولاَغ و جۆرەکانی ، یا پارەچەکانی و بەشەکانی ئادەمیزاد یاغەیری ئـادەمیزاد بـۆ نمونە ، چاو دیارە وەزیفەکەی چیـیەو بۆچی بەدیهێنراوە هـەروەها گوێـچکەو لـووت و بـاقی ئەندامانیتر، هەریەکەی وەزیفەی خۆی دیارەو کەبۆی خەلق بووە، ئەندامێ ناتوانێ وەزیفـەی غەیری خۆی بەجێ بگەیـەنێ، یـا مـەخلوقێ نـاتوانێ وەزیفـەی مـەخلوقێ تـر کەجنـسیان جیاوازبێ بەجێ بگەیەنێ، جا هەر کاتێ هەر مەخلوقێ یـا ئەنـدامێ لەمـەخلوقێ وەزیفـەی خۆی بەجێ نەگەیەنێ ئەوە لەرێزو قەدرو پلەو پایەی دادەبەزێ ، ژیریش نرخـی بـۆ دانـانێ ، ئەگەر سەگ بێ تۆڕی دەکرێ ، ئەگەر گوێ درێژبێ بەرەلاَی دەکەن ئەگەر لاق و قاچ بـێ دەی بڕنەوە .. هتد وەهەروەها ، جـا وەزیفـەو کـاری ئـادەمیزادیش بـەلای خـواوە بەندایەتیـیـە پێویستە وەزیفەکەی خۆی بەجێ بگەیەنێ دەنـا لـەلای خـوای گـەورە لـەرێزو پلـەو پایـەی دادەبەزێ و کەسێکیش نیە یارمەتی بدات یا رزگاری بکـات لـەو سـەرەنجامە بێقیمەتیـەی کەبەرۆکی دەگرێ ، خوای گەورە یاسایەکی تری هەیە لەبـەدیهاتن و خـەلق کردنـدا ئـەویش بریتییە لەیاسای هاوجووت وەکو دەفەرموێ ﴿ وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ ذاریات / ٤٩ . بەڵێ خوای گەورە هەموو شتێکی هاوجووت بەدیهێناوەو تەنها خۆی تـاك و فەردە ، ئەم هاوجوتیەش بۆ نمونە وەکو نێرو مێ یـا ژن و پیـاو شـەوو رۆژ چـاك و خـراپ

کوفرو ئیمان بەهەشت و جەهەندەم بەرزو نەوی رەش و سپی خۆش و نـاخۆش شـیرین و تـاڵ خاوێن و پیس ، ڕاست و خوار یا چەپ و راست وە هەروەها دیارە ئەم جووتانە وەکو یەك نین لەهیچ روویەکەوە ، وەکـو چـۆن چـاکەو خەراپـە وەکـو یـەك نـین، دەی کەواتـە کەسـێ یـا نادەمیزادێ خاوەن ئیمان بێ و، چاك خوازبێ و روسپیو رەوشت بەرزو پـاك بـێ، روخـۆش و رەفتار شیرین بێ، دەست و دامێن خاوێن و پاك بێ ، لەرێگای راست و دروستا بـێ ، دیـارە ئەم کەسە هەر شایانی بەهەشتەو وەکەسێ تر کەپێچەوانەی ئەوبێ هەر بۆ جەهەندەم باشـە . وەکو خوای گەورە دەفـەرموێ ﴿ وَمَا يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ(١٩)وَلاَ الظُّلُمَاتُ وَلاَ النُّورُ(٢٠) وَلاَ الظِّلُّ وَلاَ الْحَرُورُ(٢١)وَمَا يَسْتَوِي الأَحْيَاءُ وَلاَ الأَمْوَاتُ ﴾ فاطر/١٩ ـ٢٢ . ، هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿ لاَ يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ الْفَائِزُونَ ﴾ الحشر/ ٢٠ .

## ١٢ ـ البــارئ

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای بەدیهێنەر ، ئەم ناوە (٣) جار لەقورئانی پیرۆزدا هـاتووە ، بنچینەی ئەم ناوە (برء)ە واتە هێنانە کایەوەو بەدیهێنان .

الباریٔ : واتە خوای گەورەیە دەیهێنێتــە کایــەوەو بــەدیهێنان بــەرپا ئــەکا بــۆ هەرشــتێ کەخواستی لێبێ ، یا بەمانایــەکی تــر بونــەوەری لەنــەبوون هێناوەتــە کایــەوە ، وەئــەوەی کەویستبێتی بێنێتیە کایەوەو بڕیاری لەسەر داوە ، جابێ چەن و چۆن و ماتوول و سەرپێــچی هاتووەتە گۆڕەپانی بوون ..

هەروەها (البــاریٔ) واتە دور لەهەموو عەیب و کەمو کورپەك جا خالیق و بــاریٔ هــەردوو سیفەتەکە پەیوەندیان پێکەوە روون و ئاشکرایە ، وەجیاوازیان زۆر کەم و وورده هــەردووکیان نزیکە یەك مانا ببەخشن ، خــەلق کــردن و دروســت کــردن یــانی بڕیــاردانی تــەواو لەســەر بەدیهێنان، بەو جۆرەو شێوەیەی کەخوای گەورە خۆی دەیەوێ ، بەرئیش یانی جێبەجێ کردن وئەنجامدانی هێنانە کایەوەی هەرشتێ کەپەروەردگار دەیەوێت ..

﴿ هو الله الخالق الباریٔ المصوّر ﴾

ئەم ناوە واتە (الباریٔ) سێ جار لەقورئانی پیرۆز هاتووە دووجاریان لەئایەتێکــدا هــاتووە کەئایەتی ژمارە (٥٤)ە لەسورەتی (البقرة)دا خوای گەورە تێیــدا دەفــەرموێ : ﴿ وَإِذْ قَــالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَاقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمْ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَى بَــارِئِكُمْ فَــاقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ عِنْدَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ البقره :٥٤.

واتە کاتێ کەحەزرەتی موسی فەرمووی بەگەلەکەی ئەی گەلی من بەڕاستی ئێوە زوڵــم و ستەمتان لەنەفس و گیانی خۆتان کردووە بەوەی کەگۆلك و گوێرەکەتان گرتووە بەپەرســتراوو دەی پەرستن جا بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن بەلای خودای خۆتان کــەخالیق و بارینتانــەو گۆلــك وگوێرەکە پەرستان لەناوەخۆتان بکوژن و چونکە گیانیان پیس و پۆخڵ بــووە ئــەوە بــۆ ئێــوە خێرترو باشترە ، چونکە پاك دەبنەوە لەپیس و پــۆخلان و تێــی دەگــەن کەپیــسی و پــۆخلی

ئەنجامی بەدو فەوتان و ڕیسواییەو ، دیارە هەر پاکیتان و گەڕانەوەتان بەلای پاکی و خۆ دوورخستنەوەتان لەناتەواوی و مەخلوق پەرستی، ئەمە بۆتان باشترو چاکترە لەلای خوای خۆتان کەخالیق و بارئتانە ، جا ئاوا تەوبەو پەشیمانی لێوەرگرتن ، ئەگەر تەوبەی لێ وەرنەگرتبانایە کێ هەبوو تەوبەتان لێ وەرگرێ و دەرگای لێبوردەییو میهرەبانێتیتان لێ بکاتەوە ، دیارە کەسێ نیەو ئەو توانایەو ئەو لێهاتووەی تیابێ تەنها خودای تەوبە وەرگرو میهرەبان نەبێ ، دەی کەواتە ئەو خودایە خالیق و باریئتان لەگەڵتان میهرەبانە ئێوەش مەردی خودابن و رووەو بەرنامەی خوا وەرن و موسڵمان بن واز لەدونیا پەرستی و حەسادەت و نەفامی بێنن ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی حەشردا لەئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ ﴿ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ الحشر / ٢٤ .

لەم ئایەتەش دا ناوی البارئی تیایە کەلەبەینی دوو ناوی تری خوای میهرەبان کە (الخالق و المصور)ن بەڕاستی ئەم سێ ناوە لەماناو ناوەڕۆکا زۆر لەیەك نزیکن و تەواوکەری یەکترن ، جا ئایەتەکەی مانای وایە .. زاتە (الله) واتە خودا ئەو زاتەیە کەتەنها خۆی بەدیهێنەرو خالیقە هێنانەکایەوەو بارئی هەموو بەدیهێنراوەکانەو وێنەکێشیانە، وەخاوەنی ناوە جوانەکانەو، هەر شایەستەی خۆیەتی و هەر لەخۆی دێ ، خاوەن ئەوپەڕی شکۆمەندی پیرۆزی و بەرزییە ، بۆیەش وا هەر گشتیان لەیادو تەسبیحاتی ئەو زاتەن کەخۆی خاوەن عیززەتی بێ سنورو داناو حەکیمی بێ وێنەیە ..

ئەم کەونە فراوانە بەگشت بەش و پارچەکانیەوە بەلایەنە ماددی و غەیری ماددییەکانەوە شاهێدن و نیشانەن بۆ جێگەی دەستی خالیقێتی و بارئێتی ئەو خودایە میهرەبانە .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلاَ تُصَدِّقُونَ ﴾ ﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ(٥٨)أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ(٥٩)نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمْ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ

بِمَسْبُوقِينَ(٦٠)عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٦١)وَلَقَدْ عَلِمْتُمْ النَّشْأَةَ الأُولَى فَلَوْلاَ تَذَكَّرُونَ(٦٢)أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ(٦٣) أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ(٦٤)لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلَلْتُمْ تَتَفَكَّهُونَ(٦٥)إِنَّا لَمُغْرَمُونَ(٦٦)بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ(٦٧)أَفَرَأَيْتُمْ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ(٦٨)أَأَنْتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنْ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ(٦٩)لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلاَ تَشْكُرُونَ(٧٠)أَفَرَأَيْتُمْ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ(٧١)أَأَنْتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ(٧٢)نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعًا لِلْمُقْوِينَ(٧٣) فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴾ الواقعه / ٥٦ — ٧٤ .

لەم ئایەتانەدا خوای گەورە باسی خالیقێتی و بارئێتی و بەڕێوەبەرایەتی و نیعمەتانی زۆری خۆی دەكات لەم كیتابی كەونەدا ، ئەمەش ماناكەیەتی كەدەفەرموێ : ئێمە ئێوەمان خەلق كردووەو بەدیهێناوە ئایا ئێوە دڵنیانین لەو راستیەیە ، سەیركەن و بڕوانن بەچاوی ژیریو بیرتان كاتێ كەئاوی مەنی لەشوێن خۆیدا دادەنێن ، ئایا ئێوە خەلقی دەكەن و بەدی دەهێنن و دەیكەن بەئادەمیزاد یا ئێمەین خالیق و بەدیهێنەری ، ئێمە خۆمان كاتێ ئەجەل و مردنمان بۆتان تەقدیر كردوەو داناوە وەلێشیەوە دەستەوەستان نەبووینەو نابین ، لەسەر ئەوەی ئێوە تەبدیل بكەین و بگۆڕینەوە بەكەسانی تر یانیش لەوێنەو شێوەیەكی وا بەدیتان بێنین كەئێوە سەرتان لێی دەرنەچێ و نەیزانن ، بێگومان زانیوتانە چۆن لەسەرتاوە پێگەیشتوون و بەدیهاتوون كەلەنوتفەو خوێن پارەو پارچە گۆشتێ لەزگی دایكتانا بەرە بەرە پێمان گەیاندوون ئایا ئێوە عیبرەت گر نابن و پەندی لێوەرناگرن كەدووجار لەمەجالی بەول و میز دەرمان هێناون و جارێ بەولی باوكتان و جارێكیتر ئی دایكتان ، ئایا تێنافكرن و بیرناكەنەوە بەچاوی ژیری هەستەوە ناڕوانن بەوەی كەدەی چێنن لەو تۆیانەی كەبەكێڵگەكانتان دای دەكەن ، ئایا ئێوەن شینكەرو روێنەری یا ئێمەین شینی دەكەین و دەیڕوێنین ، ئەگەر خواستمان لێی بێ پان و پوتارو ووشكی دەكەین و بێخێری دێڵێتەوە ئەو كاتە دەمینێنەوە بەسەر سامی و پەشیمانی ، لەناوەخۆتانا دەڵێن خەسارەتمەند بووین و هەوڵ و تەقەلاتان بەفیڕۆچوو، بێ بەش بووین لەو رزق و رۆزیەی چاوەڕوانی بووین ، ئایا ناڕوانن بۆ ئەو ئاوەی كەدەیخۆنەوە ، ئایا ئێوە داتان بەزاندووە لەهەورەوە یا ئێمەین دابەزێنەری ، ئەگەر

خواستمان لێی بابە سوێر سوێرمان دەکرد کەبەکەڵکی خواردنەوە نەبێ و ماتــل بمابانــەوە ، ئایا هێشتا ئێوە بەئاگا نایەن لەغەفڵەت و هەســت ناکــەن بــەنیعمتانی زۆری خــوای گــەورە بەسەر خۆتانەوە تابێ بەمایەی گەڕانەوەتان بۆلای خــوای گــەورە شــوکرانە کردنــی ـ، ئایــا ناڕوانن بەچــاوی ژێــرو بیریتــان بــۆ ئــەو ئــاگرەی کەهــەڵی دەگیرســێنن و جۆرەهــا ســوودی لێوەردەگرن ، ئایا ئێوە بەدیتان هێناوە دارو کەرەستەکانی یا ئێمەین بەدیهێنەرو رێك خەری ، بەڵکو ئێمە خۆمانین گێڕاومانە بەمایەی سوودو مەنفەعەت بۆ ئێوەی موســافیرو رێبــواری دونیا ، جا کەواتە روو لەپەروەردگاری بێ وێنەت بکــەو دوری بگــرە لەهەرچــی ناتەواویــەك هەیە ـ، هەر پەروەردگاری تۆیە خاوەن ناوە جوانــەکان و خــالیق و بــارئی و مــصورە بــەرزو شکۆمەندو عزیمە .

هەر بەش و پارچــەیەك لــەم کــەون و مەخلوقاتــە دیاردەیــەکی رون و ئاشــکرایە لەســەر خالقێتی و بارئێتی خوای گەورە لەمانەش بەتایبەتی ئادەمیزاد ، چونکە خاوەن پلە و پایەی بەرزە لەلایەن خوای گەورە، وەخەلیفەی خوایەو لەژێر تاقیکردنەوەدایە لەژیانی ئەم دونیایەی ، جالەبەر ئەوە هەرکەسێ بەناحەق ئادەمیزادێ لــەنێو بــەرێ خــۆی توشــی غەشــم و قــین و غەزەب و لەعنەتی خودا دەکات ، بەڵکو دەبــێ بــەپێی بەرنامــەی خــودا مامەڵــە لەگــەڵ بەدیهێنراوەکانی خوای گەورە بکات ، لەمانەش بەتایبەتی ئادەمیزاد ، وەکــو خــوای گــەورە دەفەرموێ هەرکەسێ ئادەمیزادێکی خاوەن ئیمان بەعەمدی و بەقەصدی بکوژێ بەناحەق ، پاداشتەکەی جەهەندەمە و تێیدا دەمێنێتەوە وەموســتەحەقی غــەزەب و لەعنــەتی خودایــە وەجەهەندەمی بۆ ئامادە کــراوە کەچــارەنووس و ســەرەنجامێکی خــراپ و نــاخۆش و بــەدە، وەلەفەرمودەشدا هاتووە پیرەژنێ بەر غەزەبی خوا کەوت لەبەرئەوەی پــشیلەیەکی داکــردوەو لەبرسانا کوشتویەتی ، وەیەکێ تر بەر رەحمەتی خوا کەوتووە بەهۆی ئەوەی کەسەگێکی تێــر ئاو کردووەو لەتینوێتی رزگاری کردووە .

## ١٣ ـ المصور

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای بەدیهێنـەر ، ئـەم نـاوه یـەك جـار لـەقورئانا هـاتووه ، بنچینەی ئەم ناوه (صور)ە واته شێوەو وێنه .

المصور : واتـه خـوای گـەوره وێنـەو شـێوەو روخـسار بەخـشه بەهـەر بوێـك لەبـەدی هێنراوەکانی ، بەو شێوەیەی کەنارەزوو خواستی لێیه ، لەکورتی و درێژی و پانی و بـەرینی و گەورەو گچکەیی و رەنگ و روخسار ، وەك لەباسـی شـادەمیزادا دەفـەرموێت ﴿ فِـي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴾ **الانفطار** / ٨ .

واته لەهەر شێوەیەك و وێنەیەك کەویستویەتی دروستی کردوویـت و پێکـی هێناویـت ، یاخود دەفەرمویّ ﴿ .. وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ.. ﴾ غافر / ٦٤ .

واته وێنەی کێشاون بەجوانترین شێوه وێنەتانی بەدیهێناوه .. هەرچی لەبونەوەردا هەیـه دەسـتی نـەخش و نیگـاری خـوای گـەورەی تیـا ئاشـکرایه، هـیچ کەسـیش دەسـتی نیـه لەوێنەکێشانی هـیچ شـتیّ و کەسـیّ ، وەئـەم سیفەتەش پەیوەنـدی هەیـه بەخالیقیـەت و بەدیهێنەریەوه ، چونکه شکل و روخسار دەدات بەمەخلوقاتی هەر بەویست و ئیرادەی خـۆی - جل جلاله - .

خوای گەوره دوو جۆر کیتابی هەیه جۆرێکیـان قورئـانی پـیرۆزه کـەکۆراوەو تەکمیلـەی ئاینەکانی ئاسمانی‌یەو دواهەمین و کۆتایی ترینی کیتابەکانی خوای گەورەیه، وەکو خـەلآت و رەحمەت بەخشیویەتی بەبەرەی ئـادەمیزادو جنۆکـه ، ئـەم کیتابـه راسـتەوخۆ هەڵوێـست و ماناکانی بەشێوەیەکی رون و ئاشکرا دەردەبڕێ ، مانای بەرنامەو ژیان پێشکەش دەکـات .. جۆرەکەی تریان کیتابی بونەوەره یا بەمانایێ تر کیتـابی کەونـه ، ئـەم کیتابـه بونـەوەرەش ئایەتەکانی یەکجار زۆرن لەژماره نایەن ، لەچـەندین روو و لایەنـەوه گـەورەیی و دەسـەلآت بەرفراوانی بەدیهێنەرەکەی دەردەخات ، گەر سەیری چەند لایەنێکی یا لاپەڕێکی ئەم کیتابه کەونه بکەین دەبینین گشتی ئایات و بەڵگەن بەزوبانی حاڵ رێنمونەییمان دەکەن، بەرەو زاتی باری، گەورەیی و ناوه جوانەکانی خوای تاك و تەنهامان بۆ شی دەکەنەوه . گـەر بـڕوانین و

سەیرکەین بەلای ئەم هەموو جۆرە زانیاریەی کەبۆتە کالاو بالای ئەو هەموو بەدیهێنراوانەی دەوروبەرمان بەزومانی حالّ حالێمان دەکاو تێمان دەگەیەنێ کەکۆگاکانی و مەخازینەکانی زانیاری گشتیان هەرلای بەدیهێنەرەکەیەتی، هەر خۆیەتی زاناو عەلیمی بێ وێنە .

وەئەگەر بڕوانین و سەیرکەین بەلای ئادەمیزادەکان و گیانلەبەرەکانی ترو شینایی و دارو بارەکان گشتیان لەنەبوونەوە دێنە دونیای وجودو وەهەریەکەش پاش تەمەنی خۆیان دونیا بەجێ دەهێلن، بەزوبانی حالّ تێمان دەگەیەنێ و حالێمان دەکات بەدیهاتن و هاتنەکایەو بڕیار لەسەردان گشتی لەلای بەدیهێنەرو بەڕێوەبەریەتی، کەتەنها خۆی خالیقەو بەدیهێنەرە سەرەتاو کۆتایی فەرمان و بڕیارەکان هەر لەلای خۆیەتی، کەسێکیتر پەنجەی تیا نیە وەتوانای ئەوەی نیە پەنجەشی تیا بخا، ئەگەر سەیرکەین و بڕوانین بەلای گیانلەبەرەکان کەهەر جۆرو رەگەزیان بەشی خۆیان و رێنوماییان پێدراوە کەبەشی ژیان و پێداویستی خۆیان بکات و رەگەزو رەسەن جۆری خۆیان پێ بپارێزن و مانای بون و وجودی خۆیان وەکو ئایەتێکی خوایی بپارێزن ، بۆمان روون دەبێتەوە وەحالێمان دەکات و تێمان دەگەیەنێ کەکۆگاکانی رێنومایی هەر لەلای خالیق و بەدیهێنەرەکەیەتی بەپێی حیکمەت و دانایی خۆی دەیبەخشێ بەسەر عالەمی وجودا، وەهەر جۆر لەگیان لەبەرەکان بەش و باری خۆی بێ کەم و زیاد پێبەخشیوە، وەئەگەر بڕوانین و سەیرکەین بەلای هەموو بەش و پارچەکانی ئەم کەون و بونەوەرە هەر لەبچوك تا گەورە هەر گشتیان لەجولەو حەرەکەو گۆڕان دان ، لەخانەو خەلیەی زیندووەوە بگرە تا نەهەنگی زلی ناو دەریاکان ، وەلەئەتۆموو زەڕڕەوە بگرە تا کەشکەشانەکان و مەجەرەکان ، دیارە جولەش بەبێ جولێنەر یاحەرەکەش بەبێ محرك یا محول نابێ ، بەمەشەوە حالی دەبین کەبەگەڕهێنەری ئەو کەونە هەر خالیقەکەیەتی هەر خۆی خاوەن هێزو قوەتە، تەنها هێزی ئەو لەگەڕخەری ئەم کەون و بونەوەرەیە هێزێ تر لەئارادا نیە و نەبوەو نابێ ، چونکە هاوشێوەیی لەیاساو نیزام دا وەکو یاسای ئەتۆم و لەگەلّ یاسای مەجموعەی شەمسی و خۆر وە لەگەلّ یاسای کەشکەشان و مەجەرەکان وێك چوو و هاوشێوەن ، وەپەیوەندیەکانی نێوان بەشەکانی بوونەوەر وەکو زەوی و خۆر، یا زەوی و مانگ، یا رۆژ و خۆرو خوشکەکانی، یا مەجموعەکانی یا مەجەرەکان بەیەکەوە گشتی هاوپەیوەندن وەکو

لاشەو بەدەنی ئـادەمیزادیّ وان، گـشتیان بـەزمانی حـالّ تیّمـان دەگەیـەنن کەتـەنها زاتـیّ بەگەڕخەریانەو تەنها زاتیّ بەڕێوەبەریانە، ئەویش خالیق و بەدیهێنەریەتی ، ئەگـەر سـەیری گشت کەون و بونەوەر بکەین بەچاوی ژیری و بیرمان یا سەیری بەش بەشی بکـەین چ گـەورە چ بچوك ، یا سەیری هەر مەخلوقیّ و یا هەر بەدیهێنراویّ بکەین دەبینین بیّ وێنە نیەو رەسم و صورەی خۆی کالاّو بالاّی تی ، وەکو وێنەو رەسم بەبیّ وێنەکێش و مصوّر نابیّ ، دیارە ئەو هەموو کەون و بونەوەرەش کەگشتیان وێنەی تایبەتی خۆیانیان پیّدراوە تەنها تاکێکیش یان نیّیە بیّ رەسم و وێنەبیّ ئەوە دەردەخاو بۆمان روون دەکاتەوەو تیّمان دەگەیـەنیّ کـەخالیقی بیّ وێنە هەر خۆشی بارئی و (مصوّر)ە و هەر خۆی وێنەکێشی گشت مەخلوقێکە .

جا ئەگـەر سـەیری ئاسمـان و ئەسـتێرەکانی دەکـەی کـەجوانی و رازاوەیـی و فراوانـی و گەورەیی دلّ رفێنە ، گەورەیی وێنە کێشێتی خوای گەورەمان بەزوبانی حالّ بۆ بـاس دەکـات .. ئەگەر سەیری زنجیرە جیاو شاخەکان و دۆلّەکان دەکەین لەگەلّ کانیاوو روبارەکان هەزارەها سەیرانگا خۆی تیّدا ئارایش داوە، گشتیان بەزوبانی حالّ باسی وێنەکێشی و مصورێتی خوای گەورەمان بۆ باس دەکەن .. ئەگەر سەیرێکی دەشتەکان و باغ و بێستانەکانی بکەین لەگـەلّ جۆرەها گولّی رەنگاو رەنگ لەحاجیلۆکەو نەرگزو گیاو جۆرەکانی کەیەك پارچـە بـەرگێکیان بۆ دەشـتاییەکان دروسـت کـردووە بـەزومانی حـالّ باسـی وێنەکێـشێتی مـصورێتی خـوای گەورەمان بۆ باس دەکەن، ئەگەر سەیری دەریاو دەریاچەکان بکـەین کـەجۆرەها گیانلەبـەری ئاوی تێیدا ژیان دەبەنە سەر لەمانەش جۆرەها ماسیو نەهەنگ کەهەزارەها وێنەو وێنـەگای جوان جوان و سەیری تێدا کۆبۆتەوە گشتیان بەزومانی حالّ باسـی گـەورەیی وێنەکێـشێتی و مصورێتی خوای گەورە دەکەن، کەتەنها خۆی خالیق و وێنەکێشیانە .

جاچی هەیە لەم کەون و بونەوەرەدا باسـی وێنەکێـشێتی خـوای گـەورەمان بـۆ نـەکات، باخۆشمان کەئادەمیزادین خۆمان لەبیرنەچێتەوە ، سەرەڕای ئایەتانی زۆری خوای گەورە وەکـو خەلق بونمان و روح پێدانمان و عەقلّ و ژیری و رێـك و پێکیمـان و بگـرە چـاوو گـویّ و دلّ و دەست و قاچ و باقی ئەندامانی تری لەشمان هەریەکەی لەشوێن خۆی بەصورەی خـۆی بـریتین لەئایەتانی خوای گەورە، سەرەڕای ئەم هەموو ئایەتەش باشترین و جوانترین وێنەی کێـشاوین

و پێداوین ئەو وێنەیەش دیاردەترین ئایات و نیعمەتی خوای گەورەیە بەسەرمانەوە، .. خۆ زەویش هەر خاوەن وێنەی خۆیەتی کەخوای گەورە پێی بەخشیوە ، بەزمانی حاڵ باسی گەورەیی خوا دەکات، لەو باسانەش باسی وێنەکێشێتی تێدا رەونەق و ئاشکرایە ، بەڵێ ئەو زەوییەی بەسەریەوە دەڕۆین ، هەروەها ئەو ئاسمانەی بۆی دەڕوانین ، هەروەها ئەو هەواو بایەی لەناویاین و پێی دەژین، هەروەها ئەو ئاوەی کەدەیخۆینەوە وەئەو خواردنەی کەدەیخۆین ، کەواتە هەرچی لەدەوروبەرمانە بەخۆشمانەوە نیگاو وێنەی دەستی پەروەردگارین، باشە ئەی چی وای کردووە لەو خوایە گەورەیە بێ ئاگا بین و، لەو خاوەنە خۆشەویست و چاکەخوازو نیعمەت بەخشە ناشنا نەبین ؟؟!، بەڵێ ئەم نەفسی ئەمارەو شەیتانی لەعنەتییە کەوەکو کۆت و پێوەند روح و گیانمانی بەند کردووە لەدونیای غەفڵەت و کەم ئاگاییدا نوقمی کردووین، بەڵێ لەوانەیە ئەگەر لەبەر ئەم نەفس و شەیتانە نەبوایە نیعمەتانی خوای گەورەمان لەبەرچاو وون نەدەبوو، لەبەرامبەریشیەوە دەریای خۆشەویستی خودایی روح و گیانمانی نوقم دەکرد بۆ دونیای سەعادەت و بەرزی و کامەرانی، یا لەوانەیە پلەو دەرەجەی خۆشەویستی خودایی گیانمانی بۆ خۆی دەکێشاو توانای ژیانمان نەدەبوو لەسەر ئەم زەوییە ، دیارە خوای گەورەش بەحیکمەت و دانایی خۆی نەفس و شەیتانی ئابەم شێوەیە بەدیهێناوە ، تاببێ بەمایەی تاقیکردنەوەی ئادەمیەکان و جنەکان ..

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ : ﴿ هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ ال عمران / ٦ .. واتە زاتی (الله) خۆی ئێوەی خەلق کردووە لەزگی دایکتاناو پاشان لەگەڵ خەلق کردنا وێنەی کێشاوون، وەنیگاو صورەتێکی جوانی پێداون بەو شێوەیەی کەحیکمەت و دانایی ئەو خواستبێتی ، وەئەو زاتە تاکە پەرستراوەو هیچ پەرستراوێ تر نیە تەنها خۆی نەبێ کەشکۆمەندو خاوەن عیززەت و داناو حەکیمە .

## ١٤ - الـغـفــار

ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای وێنەبەخش (٥) جار لەقورئانا هـاتووە بنـچینەی ئەم ناوە (غفران)ە واتە چاوپۆشی و لێخۆش بوو .

الغفار : واتە پاراستن و پۆشاندن ، یا بەمانایەکی تر یـانی پـەروەردگار خواێکـە کەلـە گوناهان دەبورێ و لەتاوانەکان چاوپۆشی دەکـاو تەوبـەی تەوبـەکاران وەردەگـرێ پەشـیمانی پەشیمانان قەبوڵ دەکاو پەنای ئەو کەسانە دەدات کەپەنای پێ دەدەن ، لـەگوناهباران خـۆش ئەبێ و ئەیان پارێزێ لەسزای سەختی دۆزەخ .

هەروەها خوای گەورە لەو کەسانەش خۆش دەبـێ کـەداوای لێخـۆش بـوون و لێبـوردن دەکەن ، بۆ ئەوانەو هەموو گوناهبارێك و بەدڕەفتارێك قاپی رەحمەتی خوا کرایەوەو دەرگـای بۆ پەشیمانان هەمیشە لەسەر پشتە بەمەرجێ پەشیمان بێن و رێی هیدایـەت بگرنـە بـەر ، هەروەکو خوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَـالِحًا ثُـمَّ اهْتَدَى ﴾ طه / ٨٢ .

واتە : بەڕاستی خوای پەروەردگار گوناهپۆش و لێخۆش بووە، وەچاوپۆشی دەکا لەبەنـدە لاوازەکان و تاوان کارەکانی مادام ئەوان تەوبە بکەن و رێگەی راست بگرن و چاکەکاری ببێتە ناواتیان . ﴿ ألا هُوَ العَزِيزُ الغَفَّارُ ﴾ زمر / .

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (ص) دا لەئایەتی (٦٥ — ٦٦) دەفەرموێ ﴿ قُلْ إِنَّمَـا أَنَا مُنذِرٌ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ(٦٥)رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَـا بَيْنَهُمَـا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴾ واتە : بفەرموو بڵێ من تەنها بێدار کەرەوەم لەوەی کەحاڵیتان بکەم کـەهیچ پەرستراوێ نیە تەنها زاتی (الله) نەبێ، کەخۆی تاکو دەسەڵاتدارو زاڵـە بەخواسـت و ویـستی خۆی، پەروەردگارو بەڕێوەبەری ئاسمانەکان و زەویـە وەبەهەرچـی لـەنێوانیان دایـە، خـۆی شکۆمەندو خاوەن عیززەت و لێبوردەو غەففارە .

خوای گەورە لەسورەتی زمردا لەئایەتی (٥) دا دەفـەرموێ : ﴿ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْـرِي لأَجَلٍ مُسَمًّى أَلاَ هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴾ واتە: زاتی (الله) ئاسمانەکان و زەوی بەحەق بەدیهێناوە، چونکە خۆی حەققەو هەر کارو کرداری حەقیش ئەنجام دەدا، هەر خۆیـەتی بەگەڕخـەری ئـەم کەون و بونەوەرە، شەو بەسەر رۆژا دێنێ بەخڕی، چـونکە زەوی خـڕو هێلکەییـە هـەروەها رۆژیش بەسەر شەوا دێنێ هەر بەم شێوەیە ، رۆژو مـانگی بۆ ئێوە رام و موسەخخەر کـردووە هەریەکەیان بەوەزیفەو کاری خۆی، بەئیزنی خوای گەورە لەگەڕدا دەبـێ تـا ئەجـەل و کـاتی کۆتایی دیاری کراوی خۆی ، بێدار بنەوە لەوەی کەخوای گەورە نیعمەتی زۆری  بەسەر ئێـوە داباراندووە ، گشت کەون و بوونەوەر هەر لەدەست خۆیـەتی، ئـیتر بترسـن لـەخوای گـەورەو بەدەسـەڵات ئەگـەر لەبـەر لێبـوردەیی و غـوفرانی خـۆی نـەبێ کەسـیفەتیەتی ، تۆڵـە لێسەندنەوەتان لەبەرامبەر گوناە و تاوان دوانەدەکەوت ، لەگەڵ هـەر گونـاه و تاوانێکتانـا رووڕەشی و ئەنجامی خەراپ یەکسەر بەرۆکی دەگرتن، بەڵام خوای گەورە بەرەحمەو لێبوردەیە سەبری زۆرە لەبەرامبەر ئادەمیەکان ، لەبەر بێدەسەڵاتی نیـە تۆڵـەتان لێناسـێنێتەوە دوای دەخات ، بەڵکو لەبەر غوفرانی خۆیەتی دەنا خۆی خاوەن ئەوپەڕی دەسـەڵات و شـکۆمەند و عیززەتە ، لەگەڵ ئـەو دەسـەڵات و عیززەتیـشیەوە خـاوەن لێبـوردەو لێخـۆش بـوونی زۆر بەرفراوانەو خۆی غەففارە ..

هەروەها هەر لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّـهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيرًا ﴾ فاطر / ٤٥ .

واتە : ئەگەر خوای گەورە بەخراپەی خەڵکی بکردایە لێبوردەیی و رەحمی نەبایەو صەبری لەسەر نەگرت بانایە ، بەگوناە و تاوانی وان مامەڵەی لەگەڵ بکردبانایە ئەوە دەبا پێکوتەیێ یا مەخلوقێ لەسەر پشتی ئەم زەوییە نەهێڵێ ، بەڵام خوای گەورە دوایان دەخات تاکو کاتی

دیاری کراوی خۆی ، چونکە هەموو شتێ لەلای خوای گەورە بەئەندازە نەخشەی بۆ کێشراوە نەك هەواو ئارەزووی ئادەمیـیـەکان کـەجێگاو سـەنگەری شـەیتانەکانە .. جاکـاتێ کـاتی کۆتاییان و ئەجەلیان هات ئەوە بێگومان خوای گەورە هەمیشە ئاگـادارەو بەسـەریاندا زاڵ و بینایە..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (غـافر) دا ئامۆژگـاری خواناسـێکمان بـۆ دەگێڕێتـەوە کەلەسەردەمی فیرعەونا بووە کاتێ کە دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَاقَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ(٣٨)يَاقَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ(٣٩)مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُـؤْمِنٌ فَأُوْلَئِـكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ(٤٠)وَيَاقَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ(٤١) تَدْعُونَنِي لأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ(٤٢)لاَ جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلاَ فِي الآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ(٤٣)فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَـى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ(٤٤)فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِـآلِ فِرْعَـوْنَ سُـوءُ الْعَذَابِ ﴾ غافر / (٣٨-٤٥)

کورتەی مانای ئەو ئایەتانە واتە : ئەو کەسەی کەئیمانی هێنابوو ووتیە گەل و قومەکەی خۆ ئەی گەل و قەومی خۆم بەدوای رێگـای مـن بکـەون کەبریتیـیـە لەهیدایـەت و نـووری خودایی ، پێیەوە رێنمونەیتان دەکەم و شارەزای رێگای هیدایەت و بەختـەوەریتان دەکـەم کەمایەی سەربەرزی دونیاو قیامەتتانە، باشـترین و چـاکترین رێگـەی ژیانـە ، ئـەی گـەل و قـەومی خـۆم بەڕاسـتی ئـەم ژیانـەی دونیایـە رابواردنێکـە دێـت و دەڕوات جـا پێیـەوە هەڵمەخەڵەتێن، بەدوای رێگەی نەفس و شەیتان مەکەون چـونکە سـەرەنجام بـەهیلاك دەچـن لەدونیاو قیامەت ، بەڵکو بەدوای ئاین و بەرنامەی خوا بکەون کەهـەم دونیاشـتان دەبـێ و هەم ئاخیرەت و قیامەتیش، کەجێگای تیامانەوەو قەرارگایە بۆ هەتا هەتایی ، ئـەی گـەل و

قەومی من بزانن و تێبگەن ئەوەی خراپەیەك یا تاوانێك ئەنجام بدات پاداش نادرێتەوە تەنها بەوێنەی خۆی نەبێ کەریسوابونە لەبەرامبەر قاپی رەحمەتی خوای گـەورە ئـەوەی کارچـاکیێ ئەنجام بدات جا پیاوبێ یاخود ئافرەت خاوەنی ئیمانی پاك و پوختەبێ، ئا ئەمانە دەبردرێنە بەهەشت و دەچنە ناویەوەو وەرزق و رۆزیشیان، بەبێ حیساب و ژمارە پێدەبەخشرێ .. ئەی گەل و قەومی خۆم لەبەرچی ئەمن ئێوە بانگ دەکەم بۆ رێگای خوداو نـەجات بـوون کەچـی ئێوە من بانگ دەکەن بەلای شەیتان و ئاگرەوە ، بانگم دەکەن بۆ ئـەوەی نیعمـەتانی خـوای گەورە بپۆشم و سفلەو بەدنمەك بم لەڕاست خوای گـەورەو پێـی بـێ بـاوەڕبم و هاوبەشـی بـۆ بڕیاربدەم، کەکارو هەڵوێـستێکە زانیـاریم پێـیـەوە نیـیـە، چـونکە ماهیـەت و نـاوەڕۆك و حەقیقەتی نیە ، وەمنیش ئێوە بانگ دەکەم بەلای خودای خۆشەویـست و خـاوەن دەسـەڵاتی بێسنوورو شکۆمەندو ئازیز لێبوردەوە غەفارەوە .. خۆ شك و گومانی تیا نیە ئەوەی ئێـوە منی بۆ بانگ دەکەن بانگەوازێکی دونیایی نیە کەمایـەی ژیـانێکی کامـەرانیو بـەختیاری دونیابێ ، وەبانگەوازێکی دوارۆژو قیامەتیش نیە کەپێیەوە سەربڵندو روسوری قاپی رەحمەتی خودابم ، وەبشزانن چارەنووس و گەڕانەوەمان بـەلای خـوای گەورەیـە جـا واوەیـلا بـۆ ئـەو کەسەی کەسەربازو پیاوی بەرنامەی خوا نـەبێ ، وەبەڕاسـتی ئەوانـەی زیادەڕەویـان کردبـێ دەبنە هاوەڵانی جەهەندەم و دۆزەخ ودەچنە ناویەوە، ئازارو ئەشکەنجەو عەزابی ئاگر بـەش و باریان دەبێ ، جا بزانن من بۆ خواتان پێدەڵێم ئێوەش لەداهاتوودا بیردەکەنـەوە لـەو قـسەو وتارانەی من پێتان دەڵێم، ئەو کاتە پەشیمانی و ئەمزانی ناخواو چارەتان ناکات ، وەمنـیش ئەمرو فەرمایشتەکانی خۆم حەواڵەی لای خوای گەورەی دەکـەم ، کـەوا حـەقم ووتـووەو رام گەیاندووە، کەس مافی عیتاب و گازاندەو لۆمەی لەسەرم نەما ، بێگومان خودای گەورە ئەو خواناسەی پاراست لەو هەموو فڕوفێڵەو مەکرانەی کەفیرعەون و بۆرە پیاوەکـانی ئـەنجامیان دەدا ، وەفیرعەون و فیرعەونیەکانی تووش کرد بەئەشـکەنجەو ئـازارو عـەزابێکی سـەخت و دژوار .

ئەوەی مێژووی دێرینی ئادەمیزادێتی بخوێنێتەوە لەباسی سەرگوزشتەی پێغەمبەرەکان و گەلەکانیان، لێبوردەیی و غوفرانێتی خوای گەورە بەزەقی و ئاشکرا بەسەریانەوە دیارە، وەکو عەزاب و غەزەبی خوای گەورەش زۆر رون و ئاشکرایە کەخۆی (شدید العقاب)ە ، دیارە لێبوردەیی و غوفرانێتی خوای گەورە تاکە مۆڵەتێکە کەئەجەل تیا وەفایی کردوەو ئەوەی نەیقۆزێتەوەو بەهەلی نەزانێ وەخۆی لێ بەهرەمەند نەکا باچاوەڕوانی عەزابی سەخت و غەزەبی بێوێنەی خوا بکات ..

خوای گەورە لەسەر زمانی حەزرەتی نوح دا دەفەرموێ : ﴿ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا(١٠)يُرْسِلْ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا(١١)وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا ﴾ نوح / ١٠ ـ ١٢ . واتە حەزرەتی نوح بەگەلەکەی خۆی فەرموو : ئەی گەلی من داوای لێخۆشبوون بکەن لەپەروەردگارتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە، بێ هیوا مەبن بەهۆی گوناه و تاوانی زۆرتانەوە، بەڕاستی خوای گەورە لێخۆشبوو غەففارو لێبوردەیە ، جا ئەگەر ئێوە داوای لێخۆشبوون بکەن و بگەڕێنەوە لای خودا ئەوە خوای گەورە لەئاسمانەوە بەرەکەت بەسەرتاندا دادەبارێنێ و، لەخێرو بێری ئاسمانی بەهرەمەندتان دەکات ، وەدەوڵەمەندتان دەکات لەهەژاری و قاتی و قڕی نەجاتتان دەدات و ماڵ و منداڵ و باغ و باغاتی باش و زۆرتان پێدەبەخشێ کانیاوو رووبارتان پڕ ئاو دەکات .. دیارە لەئەنجامدا گەلەکەی نوح هەمان ئالای کەون و بونەوەریان هەڵنەگرت ، چونکە ئەم کەون و بوونەوەرە گشتی ئالای خوا بەیەك ناسی هەڵگرتووەو تەسبیحات و یادی خودای غەففار دەکات وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ جمعە /١ . جا بۆیەش کەون و بونەوەر بەپێی سوونەتی خودایی هەڵسان بەدژایەتی گەلەکەی نووح ، لەئاسمان و لەزەویەوە لەجیاتی بەرەکەت و پیرۆزی قەهرو غەزەبیان بەسەردا باری، لەئەنجامدا گشتیان ژێر ئاو کەوتن و خنکان تەنها نووح و موسڵمانەکانی ئەو سەردەمە نەبێ .. ئەی ئادەمیزادی هەژارو بێ دەسەڵات تۆ دژایەتی

کەون و بونەوەرت پێ ناکرێ لەهەڵوێست و بیرو باوەڕیانەوە لامەدە ، دەنا ئەنجامی گەلەکەی نووح و هاو وێنانی ئەو بەچاوی خۆت دەبینی !!.

خوای گەورە دەرگای ئومێدو هیـواو چارەنووسـی دانەخـستووە لـەئادەمیزادەکان بـەڵکو بەپێچەوانە خستوویەتیە سەر گازی پشت، کەگەڕانەوە لای خوایەو وەسیفەتی لێخۆشـبوون و لێبوردەییشی ڕاگەیانـدووە ، بـەڵێ ئـەو ئومێـدو هیوایـەی کەهـەزاران نەخۆشـی دەروونـی لەئادەمیزاد شیفادێنێ ژیان خۆش و ئاسوودە دەکات و دەستی هەزاران تاوانبارو گوناهکاران دەگرێ و دەیان هێنێتەوە سەر ڕاستە شەقامی خودایی ، گەل و کۆمەڵ لەدەستیانەوە ڕزگاری دەبێ و ئەوجارە پێیانەوەشانازی دەکاو خێروبێریان لێ دەبینێ ،ئـەو هیوایـەی کەخواسـت و ئارەزووی شەیتان و شەیتان سیفەتان تێك دەشکێنێ ، فیرعـەونان و سـتەمکاران بـێ هیـوا دەکـات ، ئـەوا خـوای گـەورە دەرگاکـانی ئـەو هیوایـەو ئومێدانـەی کردۆتـەوە پێـشوازی لەبەندەکانی .. پێویستە بزانین خوای گـەورە کـەدەرگای ئـەو هیـوای خـستۆتە سـەر پـشت دیاریو هەدیەشی تیایە، کەمزگێنی و موژدەیەکی یەکجار گەورەو خۆشە کەئەویش بریتیـیە لە گۆڕینی هەموو گوناه و تاوانەکان بەچاکە ، باشە ئەی ئادەمیزادی گوناهبـار و تاوانکـار ئەی چیت دەوێ کێ لەگەڵت ئاوا بەمەرحەمەتە ، کێ ئاوا تـۆی خـۆش دەوێ و چارەنووسـی باش و بەرزی تۆی دەوێ ، بەڵکو وەکو خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ إلاّ من تـاب وآمـن وعمل عملاً صالحاً فأولئك يبدّل الله سيئاهم حسنات وكان الله غفوراً رحيماً ﴾ سـورەتی فرقان / ٧٠ .. واتە لەتەوانباران و گوناهکاران ئەوەی تەوبە بکات و بگەڕێتەوەو ئیمان بینێ و کارو کردەوەی چاك و باش ئەنجام بدات، ئا ئەوانە خوای گـەورە گونـاه و تاوانـەکانیان بـۆ دەگۆڕێتەوەو تەبدیل دەکات بەچاکەو خێـرو حەسـەنات، بەڕاسـتی خـوای گـەورە لێبـوردەو لێخۆشبوو میهرەبانە .. ئەمە بەرنامەی خوایەو بۆ هەموو کـەس وەکـو یەکـەو دونیایـەکی فراوانەو جێگەی هەموو کەسێکی تیا دەبێتەوەو، پیرۆزی و بـەرزیو هەمووکەسێکی دەوێ لەدونیاو قیامەت ..

## ١٥ ـ القهـــار

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای گوناهپۆش ، (٦) جـار ئـەم نـاوه لـەقورئانا هـاتووه ، بنچینەی ئەم ناوه (قهر)ە واته زاڵ بوون و زەلیل کردن .

القهّار : یانی خوایێکه هەموو شتێکی خستۆته ژێر دەستی خۆیەوه ، هـەموو گـەردنیان لەئاستیا نزم و ملکەچه ، هەموو بیرو هۆشەکان فەرمانبەرداری و گوێ رایـەڵێن ، هـەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کەهەموویان عەبدو بەندەی ئەون و پێویستیان بەو هەیەو چاوەڕێی دەکەن لەئەنجامی هەمووکارو فەرمانێکا ، وەئەو بێنیازه لەغەیری خۆی .

ئەو خوایەی کەشایستەو لایەقی ئەوه کەبپەرستڕێ و پەروەردگارێتی بکـاو فەرمانـەکانی جێبەجێ بکرێ و قەدەغەکراوەکانی دووره پارێزیان لێبکـرێ و شـوێنی بەرنامـەو شـەرعی بکەوین ، هەر ئەم خوایەیه کەهەرچی لەبونەوەردایە لەژێر دەستیایەتی ، چونکه ئەم حاڵەتی قەهرو دەسەڵاتداریه نیشانەی ئەوپەڕی فەرمان ڕەوایی و گەورەییەیه ، لەدوای تێـك چـوون و وێران بوونی ئاسمانەکان و زەوی پرسیار دەکـاو دەفـەرموێ : ﴿ لِمَنْ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴾ غافر / ١٦ .

بۆ کێیه ئەمڕۆ سامان و دارایی ، بۆ خوای تاك و زاڵه بەسەر گشت شتێکا ..

خوای گەوره لەسورەتی (الرعد)دا لەئایەتی (١٦) دەفەرموێ : ﴿ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلْ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُـرَكَاءَ خَلَقُـوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلْ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾ الرعد .

واته : ئەی پێغەمبەری خوا بفەرموو بڵێ کێیه بەڕێوەبەرو هەڵـسوڕێنەری ئاسمانـەکان و زەوییه بفەرموو بڵێ دیاره هەر زاتی (الله)یه ، بفەرموو بڵێ ئایا ئێوه گرتوتانـه بـۆ خۆتـان بێجگه لەزاتی (الله) چەندین دۆست و خۆشەویست و پشتیوانێ کەئەوانه بۆ نـەفس و گیـانی خۆشیانا سوودو زیانێکیان بەدەست نییه ، چونکه هەر خوای گەورەیه سەرچاوەی خێرو بێرو

زەرەرو زیان ، باقی کەسێکی تر نیە بەدیهاتن و مردنی خۆشی بەدەست بێ ، چ جای زەرەرو زیانێکی بەدەست بێ ، بفەرموو بڵێ ئایا یەکێ لەڕاست بەرنامەو هیدایەت و نوری خوا کوێربێ ، یەکسانە لەگەڵ کەسێکیترا کەلەسەر ڕۆشنایی هیدایەت و نوری خوابێ و لێیانەوە بیناو چاو ساغ بێ !؟ دیارە وەڵامەکەی لەناو پرسیارەکەیا کەهەرگیز وەکو یەك یەکسان نین .. یا ئایا ڕێچکانی تاریك و کوێرە ڕێگاو تاریکاییەکان وەك و ڕێگەی رەوشەن و رووناك و نوراویە ، لەم پرسیارەش دیارە هەر وەڵامەکەی لەناو خۆیەتی ..

یا شەریك و هاوبەشیان بۆ خودای گەورە گێڕاوەو بڕیار داوە لەوانەی بەدیهێنراویان خەلق کردووە !! ئەوانیش بەدیهێنراوەکانی خوای گەورەو بەدیهێنراوەکانی ئەوانی لێ تێکەڵ و پێکەڵ بووە پێیان لێك نابێنەوە لایان وایە وەکو یەکن یا بەمانایەکیتر خۆ دەزانن تەنها خوای گەورە خالیق و بەدیهێنەرە هیچ خالیق و .. بەدیهێنەریتر نیە تاکو ببێ بەهۆی لێ تێك چوونیان و سەرلێ شێوانیان، دەی کەواتە خوای گەورە بەتەنها خالیقەو وەخاوەنی گشت مەخلوقەکانەوە کەسێ شەریك و هاوبەشی تیایان دا نیەو نەبووەو نابێ .. بفەرموو بڵێ هەر زاتی (اللە)یە بەدیهێنەرو خالیقی هەر هەموو شتێکە، هەر خۆی شایەستەیە بۆ پەرستراوێتیو دۆستایەتی و خۆشەویستایەتی و پشتیوانێتی، و چونکە هەر خۆیەتی تاك و تەنهایەو لەهەمان کاتدا زاڵ و سەرکەوتووە، وەدەسەڵات دارە بەسەر هەموو شتێکا کەواحیدول قەهھارە ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (ص)دا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ(٦٥)رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴾ ص/ ٦٥ ـ ٦٦ .

واتە ئەی نێرراوی خودا کەمەبەست پێغەمبەری خۆشەویستە (ﷺ) بفەرموو بڵێ منیش وەك ئێوە ئادەمیزادێکم هیچیتر تەنها ئەوە هەیە کەخوای گەورە منی کردووە بەپێغەمبەر تاکو بێدارتان بکەمەوەو بتان ترسێنم، وەئاگادارتان بکەمەوەو حاڵیتان بکەم کەهیچ

پەرستراوێ نیە و کەسێ نیە شایەستەی پەرستراوێتی بێ تەنها زاتی (الله) نەبێ، ئـەو زاتـەی کەتاك و تەنها و زاڵە خاوەن دەسەڵاتی بێسنوورەو، هەر خۆی بەتەنها واحیـدول قـەهھارە ، هەر خۆشیەتی پەروەردگارو بەڕێوەبەری ئاسمانەکان و زەوی و بەوەی هەیە لـەنێوانیـان ، هـەر خۆشیەتی خاوەن عیززەت و شکۆمەندی هەمیشە، لێبـوردەو لێخۆشـبووەو غـەففارە ، دەی کەواتە دۆستایەتی ئەو زاتە دەسەڵاتدارو غەففارە بقۆزنەوەو روی تێبکەن تاکو ئەجەل وەفای کردووە ، وەخت و کاتیەتی بۆ گەڕانەوە ، لەکیس خۆتانی مەدەن و خۆتانی پـێ بەهرەمەنـد بکەن روسپیاتی هەمیشەییش لەدەست خۆتانی مەدەن .. هەروەها خوای گـەورە لەسـورەتی (زمر)دا لەئایەتی (٤) دا دەفەرموێ : ﴿ لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا لَاصْطَفَى مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾

خوای گەورە رووەو ئەو کەسانەی کەزاتی ئەویان نەناسـیوە بەتـەواوی ، واحـاڵی بووینـە کەزاتی ئەو خاوەن رۆڵەیەو کوڕی بۆ خۆی بڕیار داوە ، وەوا حـاڵی بووینـە زاتـی ئـەو وەکـو ئادەمیزاد رووەو بێهێزی و بێدەسەڵاتی دەبێ، بۆیە رۆڵـەی گـەرەکو پێویـستە تاقـەرەبووی پیری و کەنەفتی پێپڕبکاتەوە ، نەخێر هەرگیز وانیەیەو لەزاتی (الله) ناوەشـێتەوە شایەسـتە نیەیە ، چونکە زاتی باری ئەگەر خواستی لەسەلار رۆڵە بڕیاردان بایە بۆ خۆی ، (کەشایستەی ئەو نیەیە کاری واش ناکا) هەڵی دەبژارد لەوەی خەلقی دەکردو بەدی دەهێنا بەخواستی خۆی ، بەڵام پاکی و بێگەردی شایستەی خوایە هەرچی کەم و کوڕیە شایستەی ئەو نیەیەو نابێ ، چونکە ئەو وەکو ئادەمیزاد نیەیەو لەئادەمیزاد ناکا تاکو بێهێزی و سستی رووی تێبکـاو ئارەزوو و خواستی رۆڵەی بۆ دروست بـبێ تاقـەرەبوی کـەم و کوڕیـەکانی پـێ پڕبکاتـەوە نەخێر، خوای گەورە هەمیشە تاکو تەنهایەو بێنیـازە لـەهاوەڵ و رۆڵـەو شـەریك لەهـەمان کاتیشا لەڕووی دەسـەڵاتا هـەردەم دەسـەڵات داری بـێ سـنوورە و زاڵـە بەخواسـتی خـۆی وەواحیدول قەهھارە هەروەها خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْـدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ(٤٧)يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ

الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ(٤٨)وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ(٤٩)سَرَابِيلُهُمْ مِنْ قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ(٥٠)لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ(٥١)هَذَا بَلاَغٌ لِلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ﴾ ابراهيم / ٤٧ ـ ٥٢ .

واته هەرگیز حیساب نەکەن کەخوای گەورە وادەو بەڵێنەکانی پشت گوێی دەخا، لەو وادەو بەڵێنانەی کەبەپێغەمبەرانی داوە، نەخێر بێگومان خوای گەورە وادەو بەڵێنەکانی بەجێ دەگەیەنێ کەبەهەشت و روسپێتی‌یە بۆ پێغەمبەران و هاوەڵانی ، جەهەنەم و روو ڕەشی‌یە بۆ دوژمنانیان و ناحەزانیان ، چونکە بەڕاستی خوای گەورە شکۆمەندو دەسەڵاتدارو تۆڵەسێنەرە لەزاڵمان و ستەمکاران ، رۆژێ زەوی تەبدیل دەکرێ و دەگۆڕدرێتەوە بەزەویی‌تر ، هەروەها ئاسمانەکان دەگۆڕێتەوە بەئاسمانانی‌تر ، ئەمەش لەکۆتایی تەمەنی دونیادا دەست پێدەکات بەهاتنی رۆژی قیامەت ئەم نیزامەی کەونە دەگۆڕدرێ بەنیزامێ تر بەهەشت و جەهەنەم دەکەونە گۆڕێ و هەرچی کارو کردەوەو هەڵوێستێ هەبووە چ لەزەوی چ لەئاسمانەکان گشتی دەردەکەون بۆ خودای گەورەی تاك و بەدەسەڵات و زاڵ،کەهەر خۆی تەنها واحیدول قەهھارە ، لەو رۆژەدا ستەمکارو موجریم و زاڵمان دەبینی کەکۆت و زنجیر کراون لەژێر ئەشکەنجەو ئازاران ، وەجل و بەرگ و پۆشاکیان لەئاگرو قەتیران بۆ ساز دەکرێ و دەبەریان دەکرێ، سەرەڕای ئەوەش ئاگری جەهەنەم گشت دەم و چاویان دادەگرێ و دادەپۆشێ ، ئەمەش گشتی لەبەر ئەوەیە تاکو زاتی (الله) پاداشی هەر نەفس و گیانێ بداتەوە بەپێی ئەو کارو کردەوەیەی کەئەنجامی داوە لەژیانی دونیای ، بەڕاستی و بێگومان خودای گەورەو میهرەبان گشت خەڵك و مەردوومان موحاسەبە دەکات بەووردی و بەتوندی و بەکاتێکی کەم چونکە، هیچ شتێکی لێ‌شاراوە نیەو هەر خۆی سەریع ولحیسابە ، ئەو هەواڵ و حەقائیقانەش کەئێستا پێتان رادەگەیەنین مایەی پەندو ئامۆژگاریەکی تەواوو لەجێیە بۆ خەڵك و مەردوومان ، هەروەها تاکو پێیەوە ئاگادار بکرێنەوە لەبۆ ئەوەی فێرە زانیاری بن

و بزانن و عیلمیان ببێ بەوەی کەبەڕاستی زاتی (الله) تاکە پەرستراوەو هیچ پەرستراوێ تر نیە .. وە تاکو ببێ بەمایەی زیکردو یادو پەندو عیبرەت بـۆ ئـەو کەسـانەی مێـشك و عـەقڵی تێگەیشتنیان هەیە .

ئەوەی سەیرێکی مێژووی دێرینی ئەم کەونو بونەوەرە بکات بەگشت بەش و پارچەکانیەوە تیشکە درەوشاوەکەی دەسەڵاتی بێسنووری خوای گەورە کەمانای زاڵـی و قـەهھاری خـوای گەورە دەگەیەنێ بەئاشکرا بەر ژێرو بیری دەکەوێ ، لەوەش حاڵی دەبێ کیتابەکەی بوونـەوەر هاوڕێك و هاوبڕیارە لەگەڵ کیتابە پیرۆزەکـەی خـوای گـەورە کەقورئانـە کەیـەك سەرچـاوەو دانەری هەیە ئەویش خودای زاڵ و واحیدول قەهھارە ..

## ١٦ ـ الــوهــاب

ناوێکە لەناوە جوانـەکانی خـوای سـەرکەوتوو ، ئـەم نـاوە (٣) جـار لـەقورئانا هـاتووە بنچینەی ئەم ناوە (هب)یە واتە بەخشش و دیاری ..

الوهاب : واتە دیاری و بەخشش دەدات ئەم خوایە گەورەیە بێ ئەوەی چاوەڕوانی پـاداش بێت ، یا بەمانایەکیتر خوایێکە نازو نیعمەتی زۆرەو هەمیشە بەخششی بەردەوامەو هەمووانی منەت بار کردووەو بەشی هەمووان دەدات و کەسێ بێبـەش و فـەرامۆش ناکـا، هەرکـەس مافی خۆی دەداتێ و چاوەڕوانی هیچ بەخشش و پاداشێ نیە لەبەرامبەرەوە ، یاخود بـەهۆی هەزاران حیکمەتەوە کەهەر خۆی دەیزانێ هەرچی بیەوێ بەهەر کەسێ بدا دەیدا ، عیززەت و دەسەڵات دەبەخشێ بەهەر کەسێك کەبیەوێ، هیدایەت و ڕێنمونەیی هەرکەسێ بـدا دەیـدا ، وەهەر بەخشش و بەهرەیەك بدات بەخواست و ویستی خۆیەتی بەرپرسـیارو لێ پرسـراو نیـە لەبەرامبەر کارو فەرمانەکانیەوە ، هەرچی ئەو نەیبەخشێ کەسێ ناتوانێ بەرگری لێبکـاو ، وەهەرچی ئەو نەیبەخشێ کـەس نـاتوانێ ئـازادی بکـاو بینێـرێ ، میـسقالە زەڕڕەیـەکیش بەدەستی هیچ کەس نیەو نابێ لەئاسمانـەکان و لەزەویـدا ، لـەقورئانی پـیرۆزدا داوامـان لێ دەکات کەوا لەبەریا بپاڕێینەوەو دوعا بکەین ، دەفـەرموێ : ﴿ رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْـدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴾ ال عمران / ٨ ..

واتە : پەروەردەگارا دڵەکانمان لامەدە پاش ئەوەی هیدایەتت دایـن و ڕێنمونـەیی ڕێگـەی ڕاستت کردووین ، ڕەحمەت و بەزەییت پێمان ببەخشە لەلایەنی خۆتەوە، بەڕاستی و بێگومان تۆ بەخشندەو وەههابی ، لەم ئایەتەدا لەچەند ڕوو لایەنەوە بەهرەمەندمان دەکات و حاڵیمان دەکات ، لەلایەکەوە تێمان دەگەیەنێ و حاڵیمان دەکات کەدڵەکان شایەستەو قابیلی گۆڕان و وەرگەڕانن، دیارە هەر بۆیەش ناوی لێنـراوە قلـب یاجەمعەکـەی قلـوب، چـونکە هەمیـشە لەوەرگەڕان و تەقەلوب دایەو ئیستیقامەت دامەزراوی نیە، مەگەر بۆ یەکێ ئـەبێ کـەخوای گەورە بەرەحمەتی خۆی ڕاگیری بکات ، دیارە ئیمانی پتەو زیاد لەگەڵ کارو کردەوەی چاك و باشا دڵ زیاتر جێگیر دەکـات لەسـەر ڕێنمونـەییو هیدایـەت، هـەروەها بەپێـچەوانەشەوە

بێئاگایی و غەفڵەت لەئیمان و کارو کردەوەی نالەبارو گوێڕایەڵی شەیتان دڵ لەسەر هیدایەت هەر دەخلیسکێنێو بەرەو گومڕایی و تاریکاییەکان دەیبات ئەو کاتە خوای گەورە ڕێنمونەیی و هیدایەت نابەخشێ بەزاڵمان و ستەمکاران و لەرێ دەرچوان تاکو نەگەڕێنەوە سەر ڕێگەی ڕاستە شەقامی خودایی ، هەروەها ئەوەشمان حاڵی دەکاو تێمان دەگەیەنێ کەسەرچاوەی هیدایەت هەر لەدەست خوای گەورەیە خۆی بەخشێنەری هیدایەت و دڵەکان لەبەینی پەنجەکانی میهرەبانی ئەون، خۆی سەوداو مامەڵەیان پێ دەکات بەو پەڕی حیکمەت و داناییەوە، هەر لەو ئایەتەی خوێندمانەوە ئەوەشمان حاڵی دەکا کەپێویستە لەدەرگای ڕەحمەتی خوای گەورەوە بدەین و لەبەریا بپاڕێینەوە چونکە هەر خۆی خۆشەویستمانەو کەسمانەو وەڵامدەرەوەی دوعاو نزاکانمانەو بەرێوەبەرو پەروەردگارمانە ، هەروەها تێمان دەگەیەنێ بەناوە جوانەکانی خۆیەوە دوعاو نزای لەبەربکەین و لێی بپاڕێینەوەو وەکو دەشفەرموێ ﴿ وَلِلّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا.. ﴾ بۆ خوایە ناوە جوانەکان و دوعاو نزای پێوە بکەن، ئەم شێوە دیاردەترە لەسەر خواناسین و ڕێگەی هیدایەت و دان نان بەناوە جوانەکانی خودای مەزن و ئیمان پێهێنانی .. هەروەها لەو ئایەتەی خوێندمانەوە ئەوەشمان بۆ روون دەبێتەوە کەخوای گەورە سەخی و بەخشندەیە دەرگای بەخشندەیی هەمیشە ئاوەڵایە ، هەرچی هەیە لەم کەون و بونەوەرەدا هەرگشتی بەخشندەیی خوایە لەعالەمی نەبوونەوە هێناویەتە دونیای وجوود، وەڕام و موسەخخەری کردووە بۆ بەرەی ئادەمیزاد، کەواتە هەر مەخلوق و بەدیهێنراوێ دیاردەیەکی روون و ئاشکرایە لەسەر بەخشندەیی و وەهابێتی خوای گەورە، لەزمانی حاڵیان و لەتیشکی درەوشاوەی بونیاندا تێمان دەگەیەنێ و حاڵیمان دەکاو بەچاوی هۆش و بیرەوە دەی بینین کەگشتیان شایەدن لەسەر بەخشندەیی و وەهابێتی خوای گەورە ، وەکو شایەدیشن لەسەر باقیتری ناوە جوانەکانی، هەروەها لەهەمان ئایەت ئەوەشمان حاڵی دەکاو تێمان دەگەیەنێ کەخوای گەورە خۆشی لەوە دێ کەبەندەکانی ڕێگەی هیدایەت و ڕێنمونەیی بگرنەبەرو داواشی لێبکەن کەلەسەریا دامەزراو بن و ئیستیقامەتیان بێ ، هەر لەم بارەشەوە ئەم ئایەتەی ئابەم شێوەی دوعا دارێشتووە تاکو ببێ بەمایەی نزاو دەست پێگرتنیانەوە، لەهەمان کاتیشا مایەی

بەندایەتی و عیبادەتیشەو وەدەرگایەکی رەحمەتی خوای گەورەیەو بۆ دەست پێوەگرتنی و روو تێکردنی، شیفای دڵ پێهێنانی و خوا پێرازی کردن، پاش ئیمان و کارو کردەوەی چاکەوە ، هەروەها ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەشمان حاڵی دەکات کەئێمەی موسڵمان دەبێ لەناو کۆڕو کۆمەڵی موسڵمانان بین و دووره پەرێز نەبین ، چونکە صیغەو زاراوەی ئایەتەکە جەمعەو موفرەد نیە وەچی پێمان خۆشە بۆ خۆمان ئاواشمان پێخۆش بێ بۆ برای ئیماندارمان ، هەروەها ئەوەشمان حاڵی دەکا کەدەبێ موسڵمانان یەکگرتوو تەبابن و هاریکاری و خۆشەویستی و برایەتی زیاد بکەن لەبەینی خۆیانا ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (ص)دا دەفەرموێ : ﴿ أَؤُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِنْ بَيْنِنَا بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِنْ ذِكْرِي بَلْ لَمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ(٨)أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ الْعَزِيزِ الْوَهَّابِ ﴾ ص / ٨ ـ ٩ .

خوای گەورە باسی هەڵوێستی ناهەموارو نابەجێی بێباوەڕەکان دەکات کاتێ کەدەیان ووت ئایا چۆن دەبێ لەناو هەموومان زیکرو کیتاب و وەحی دابەزێ بەسەر (محمد)دا، باشە بۆ بەسەر ئێمە دانەبەزێ یا بۆ بەسەر فلان و فیسار دانەبەزێ کەخاوەن ماڵ و سەروەت و دەسەڵاتن ، ئەم هەڵوێستە نارێکانە هەر ئەو حەقیقەتەی روون دەکاتەوە کەئەوان شك و گومانیان هەیە لەڕاست کیتاب و بەرنامەی خوای گەورە، دەنا نەدەبا هەڵوێستیان ئاوا بایە، یانیش بەدوای هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون و تێیدا نقووم بوون، یا ئەشکەنجەو عەزابی خوای گەورەیان نەچەشتووە تاکو وەئاگایان بێنێ و چڵك و چەپەڵی غەفڵەتی و بەدواکەوتنی هەواو ئارەزوویان لێ داماڵێ و لەکۆڵیان بکاتەوە ، یا بۆیە هەڵوێستیان ئاوایە چونکە خەزێنەکانی رەحمەت و بەزەیی پەروەردگاری تۆیان لەلایە ، ئەو پەروەردگارەی خاوەن عیززەت و شکۆمەندی و بەخشندەیە ، دیارە خەزێنەکانی رەحمەتی پەروەردگار هەر لەدەست خۆیەتی هەر بەخواستی پڕ حیکمەت و دانایی خۆی دەیبەخشێتەوە نەك بەخواست و ویستی بێباوەڕانی بەدواکەوتووی هەواو ئارەزووەوە ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (ص)دا دەفەرموێ :

﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ ﴾ ص / ٣٥ .

خوای گەورە — سبحانە وتعالى — باسی دوعاو نزاکەی حەزرەتی سولەیمانمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێ کەپاڕاوەتەوەو فەرموویەتی ئەی پەروەردگارم لێم ببورەو لێم خۆشبە وەپێم ببەخشە سامان و دارایێ کەشایان و شایەستەی کەسیتر نەبێ لەپاش منەوە بەڕاستی و بێگومان هەر تۆی بەخشندەو وەهھابی ..

لەئەنجاما خوای گەورە دوعاکەی گیراکردوو بوو بەو پیاوەی کەدەیویست ، هەواو بای بۆ موسەخخەرو رام کرد، کەلەژێر فەرمانی ئەوا بەنەرم و نیانی بێ و بچێ، وەجن و شەیاتینەکانی بۆ رام و موسەخخەر کرد، لەوانەی کەدروست کەری خانوو کۆشك و تەلاربوون و لەوانەی دروست کەری کەشتیو پاپۆڕو غەواصەبوون ، وەلەوانەی بەدفەڕو ناهەمواربوون کەشایەستەی کۆت و پێوەند بوون بەئاسن و زنجیرەوە هەروەها خوای گەورە پادشایەتی و دەسەڵاتداری و موڵك و سامانێکی یەکجار زۆری پێبەخشی، ئەوسا پێی فەرموو ئەمەیە عەتاو بەخششی ئێمە جابەخواستی خۆت کارو تەصەروفی پێبکا بەبێ ژمارەو حیساب .. وەبەڕاستی لەبۆ حەزرەتی سولەیمان هەیە پایەبەرزی نەزیکی لای خۆمان، وەشوێن و مەئوایەکی زۆر چاك و باش ، ئەمەی ووتمان تەفسیری ئایەتەکانی (٣٥ — ٤٠) بوو لەسورەتی (ص) دا .

بەخشندەیی خوای گەورە لەو سنورە نەوەستاوەو ناوەستێ کەچلەپۆپەی ژیرو بیری ئێمەی پێگەییوە ، وەسەخاوەت و میهرەبانێتی ئەو هەموو شتێکی داگرتووەو، سەرتاپای کەون و بونەوەر شایەدمانی لەسەر دەدەن ، دەبا ئێمەش فەرامۆشی نەکەین ئەو دۆستە خۆشەویست و بەخشندەو سەخی و میهرەبانە، رووی تێبکەین و پڕ بەدڵ و بەگیان لەبەری بپاڕێینەوەو داوای هەموو پێداویستیەکانی ژیانی دونیاو عالەمی بەرزەخ و قیامەتی لێ بکەین ، دیارە سوننەتی خوای گەورە وادەخوازێ بەخشندەیی و میهرەبانێتی خۆی بەدوعاو نزا زیاتر بەسەرمان دادەبارێنێ، دەرگای رەحمەتی و بەزەیی زیاتر ئاوەڵا دەبێ ، ئیمان بەو زاتە کەوەهھابەو بەخشندەیە راستیەکە لەوپەڕی حەقیقەت و دروستی دایە سەرەڕای ئەوەی

کەون و بونەوەرو قورئان شایەدی بۆ دەدەن  زەروریەتی فیترەو بۆنیشمانە، لەهەمان کاتیشا مایەی شیفایی گەلێك لەنەخۆشیانی دەروونیشمانە، لێرەدا جێگەی خۆیەتی داوای زیاتر هیدایەت رەحمەتی لێ بکەین و، دان بنێین بەپێویستی ئەو بۆ کۆمەکیمان بۆ ئێمەی بێ دەسەلات و زەلیل لەبەرامبەر نەفس و شەیتانا ، بۆ ئێمەی رەزیل و قرچۆك لەکارو هەلۆێستمانا ، بۆ ئێمەی کۆڵەوارو غافلّ و بێئاگا ، بۆ ئێمەی دلّ رەق و رەشی کەم ئاگا ، بۆ ئێمەی هەژارو نەدارو مەجبوور بەپێداویستیانی یەکجار زۆر ، زۆر زۆر پێویستین و زەروری‌یە بەوەی کەڕوو لەو بەخشندەو میهرەبان و وەهھابە بکەین بۆ زیادە رەحمەت و هیدایەت بۆ کاروبارو گشت لایەنانی ژیانمانەوە .. جالە کۆتاییدا پڕ بەدلّ و بەگیان دەلّێین .. اللهمّ ربّنا لاتزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا وهب لنا من لدنك رحمة إنّك أنت الوهّاب ..

## ١٧ ـ الـــرزاق

ناوێکە لەناوە پیرۆزە جوانــەکانی خـوای دیـاری بـەخش ، ئـەم نـاوە (٥) جـار هـاتووە لەقورئانی پیرۆزدا ، بنچینەکەی (رزق)ە واتە رۆزی و ژیواری یا رزق و رۆزی .

الرزاق : واتە خوای گەورە بەدیهێنــەری رزق و رۆزییــە وەهــەر خـۆی ئەسـباب و هـۆی بــەدیهێنانی رزق و رۆزی هێناوەتــە کایــەوە ، هــەروەها لــەرۆژی دواییــشدا رزق و رۆزی بەنارەزووی خۆی دەبەخشێ بەهەر کەسێ کەبیەوێ وەهەرچەن و چۆنێ بێ وەك دەفەرموێ :

﴿ ..اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ .. ﴾ رعد / ٣٦

خواست و نارەزووی کەسێ ناتوانێ تێکەڵ چەندو چۆنایەتی رزق و رۆزی هیچ کەسێ بـبێ لەلای خوای رۆزی دەرەوە ، تەنانەت هیچ کەسێ بۆ خۆشـی نـاتوانێ دەسـتکاری لـەزیادی‌و کەمی رۆزییەکەی بکات ، وەك دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الـــرَّزَّاقُ ذُو الْقُـــوَّةِ الْمَـــتِينُ ﴾ الذاريات / ٥٨ .

هەروەها دەفـەرموێ : ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَـــصِّلُ الآيَـــاتِ لِقَـــوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ الاعراف / ٣٢ .

واتە : بڵێ کێ حەرامی کردووە خۆشی و زینەتی ژیان ، وەیا لەپاك و پاکژی رزق و رۆزی ، بڵێ ئەمە تایبەتە بۆ دەستەی ئیمانداران لەژیانی دونیـا ، چـونکە ئـەی زانـن بەخـشش و دیاری خوایە جابەم بەخششەوە زیادە لەززەت لەخۆشەویستێتی خوای گەورە دەکـەن ، بـەڵام بێ باوەڕان و کافران ئەم جۆرە لەززەتە لەرزق و رۆزی ناکەن چونکە بێ ئاگان لەوەی کەئەمـە بەخشش و دیاری خوایە ، وەلەرۆژی دواییشدا رزق و رۆزی پـاك و بەلـەززەت هـەر تایبەتـە بەئیماندارانەوە، ئاوەها خوای گەورە نیشانەو ئایەتەکانی روون و ئاشکرا دەکات بـۆ گـەلانی هۆشیارو تێگەیشتوو .. هەروەها خوای گەورە دڵنیامان دەکا لەوەی کەفەرامۆشمان ناکا چۆن رزق و رۆزی گیان لەبەران و جانەوەران دەدات کەهیچیان بەکۆڵەوە نیە، ئاواش یـەکی ئێمـە

ناخات کە دەفەرموێ : ﴿ وَكَأَيِّن مِنْ دَابَّةٍ لاَ تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ..﴾ العنکبوت / ٦٠ .

کاتێ کەموسڵمان بۆی ئاشکرایە هەرچی مارو مێروو زیندەوەر هەیە خۆی رزقی خۆی پەیدا ناکاو کۆیناکاتەوەو نایدا بەکۆڵیاو هیچ گوێی پێناداو نازانێ چۆن بەدەستی بێنێ بۆ خۆی وەچۆن پارێزگاری لێبکاو لەگەڵ ئەوەش خوای گەورە رزق و رۆزی پێئەبەخشێ و پەکی ناخاو نایەڵێ بمرێ لەبرسا، ئەوکاتە موسڵمان دڵنیا دەبێ لەوەی کەهەرواش خوا رزق و رۆزی ئادەمیزاد دەداو، هەرچەند وابیر بکاتەوە کەوا خۆیان پەیدای دەکەن و بەرهەمی ئەهێنن ، چونکە هەر خوایە خۆی وەسیلەو هۆی بەرهەم هێنانی رزق و رۆزی دەبەخشێ، وەبەخشینی هۆو وەسیلەی بەدەست هێنانی رزق و رۆزی لەخۆیا جۆرە رزقێکی تری خواییە ، ئادەمیزاد بەبێ یارمەتی و کۆمەکیەکی خوایی ناتوانێ بەدەستی بێنێ . جا کاتێ ئیماندار ئەمە دەزانێ ئارامی روو دەکاتە دڵی، لەبەرامبەر رزق و رۆزییەوە دوو دڵی و دڵە راوکێ ناتوانێ رووی تێ بکاو لەشوێنەواری خۆیدا یا لەشوێنەواری کۆچەکەیدا ، چونکە پەروەردگاری بەخشێنەری رزق و رۆزی ، رزق و رۆزی ئەداو پەکی ناخاو وەك چۆن بەشی ئەم زیندەوەرانە دەدا کەکۆڵیان بەشانەوە نیە ..

ئەگەر سەیرێکی ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر واتە (المجموعة الشمسية) بکەین دەیان بینین کەهیچ کامەیەکیان پێداویستیەکانی ژیانی ئادەمیزادو گیان لەبەرانی تری لەسەر نیەو، ژیان بەهیچ شێوەیێ ناچێتە سەر لەسەریانەوە ، چونکە ئاوو هەواوو نیزامی شەوو رۆژو باقی هۆیەکانی تری ژیانی تیا نیەو لەگەڵ ژیانا ناگونجێ وەکو زەوی ، چونکە خوای گەورە زەوی گونجاندووە لەگەڵ باری ژیانا وەرزق و رۆزی تێدا بەرێژەیەکی دیاری کراو پێبەخشیوە وەکو دەفەرموێ : ﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ(٩)وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ ﴾ فصلت / ٨ ـ ٩ . واتە بفەرموو بلێ ئایا ئێوە بێباوەردەبن بەو زاتەی

کەزە وی لەدوو رۆژا خەلق کردووەو بەدیهێناوە، هاوەڵ و هاوبەش و شەریکانی بۆ دادەنـێن و دەگێڕن کەشایستەی ئەو نیە، خۆی تەنها پەروەردگاری جیهانەکانە ، پـاش ئـەوەی کـەزەوی خەلق کردووەو بەدیهێناوە چیاو شاخەکانیشی بەسەردا گـیراوەو دایمەزرانـدووە ، بەرەکـەت و پیتی پێبەخشیوەو قووەت و رزق و رۆزیشی تێـدا بـەدیهێناوە بەرێژەیـەکی رێـك و پێـك و دروست لەچوار رۆژا، جا بۆ هەریـەکێ پرسـیاری لـەبارەوە بکـا هەروایـەو چـوون یەکـە ..

هەروەها ئەگەر سەیری دانەیەك بکەین لەدانەوێڵەکان جا گـەنم بـێ یـا جـۆ یـا هـەر جـۆرە دانەوێڵەیەکی تربێ بۆ نمونە گەر بڕوانینە یەك دەنکـە گـەنم ، لـەو کاتـەی کەدێتـە بەرهـەم دەبینین چۆن خوای گەورە ئاوو هەوای بۆ موسەخەرو رام کردووە هەروەها زەوی‌ـو کانزاکـانی هەروەها رۆژو مانگ و یا شەوو رۆژو باقی یاساو نیزامەکانی تری ئەو کەونە گـشتیان رام و موسەخخەر کراون بۆ هاتنە کایەوەو بەدیهاتنی ئەو دەنکە گەنمـە، جـا بـاقی دانەوێڵـەکانی تریش هەر ئەوها ، ئەم کەونە گشتی بەبەش و پارچەکانیەوەبەیاسـاو نیزامەکانیـەوە گـشتی وان لەرام و موسەخخەرێتی و خزمەتی گشت دانەوێڵەکان و بـاقی رزق و رۆزییـەکانی تـر ، دیاریشە کێ خالیق و بەدیهێنەری ئەم کەون و بونەوەرەیە هەر ئەو زاتەشە بـەڕێوەیان دەبـاو یاساو نیزامی بۆ داڕشتوون و نیعمەتانی زۆری بەسەردا بارانـدووەو، رزق و رۆزیـش یەکێکـە لەلایەنە نیعمەتەکانی تری خوای رازیق و رۆزی دەر .. ئـەم باسـانە خـۆی لەخۆیـدا ئاسـۆی رازیقایەتی خوای گەورە فراوانتر دەکات لەهۆش و بیری ئادەمیزادانی بێدارو هۆشیار ..

هەروەها ئەگەر سەیرێکی مێژوو بکەین زیاتر رازیقایەتی خوای گەورەمان بۆ باس دەکـاو بۆمان روون دەبێتەوەو، بۆ نمونە گەر سـەیری مێـژووی ژیـانی بـاپیری خوالێخـۆش بوومـان بکەین ، دەبینین تا ئەو کاتەی وەفاتی کردووە شتێ یاخواردەمەنیێ هەر هەبووە بیخوات، یا بەمانایێ تر لەهەموو ژیانیدا کەم و زۆر رزق و رۆزی هەر هەبووە ژیانی خۆی پێگەیاندبێتـە سەر ، جائێمەش ئەو کاتەی کەدەمرین هەر ئەوهایە ، بەلام ئێستاکە لەبەر بێئاگایی یا کەم ئاگاین لەرازیقایەتی خوای گەورە وەشـەیتانیش دەمـان ترسـێنێ لەکـەمی رزق و رۆزی بـەم هۆیەوە دەیەوێ بەلای فسق و زوڵم و فاحیشەمان هەڵنێ وەکو خوای گـەورە ئـەم سیاسـەتەو

فرِوفێڵ و مەکیدەی شەیتانمان بۆ ئاشکرا دەکاو دەفەرمویٚ ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقره / ٢٦٨ .

واتە شەیتان وادەو بەڵێنی هەژاریتان دەداتیٚ لەرێگەی وەسوەسە درۆینەکانیەوە، بەمەوە ئەمرو فەرمانتان پیٚ دەکات بەحەرام و کاری نابەجیٚ و ناهەموارو فاحیشەوە، بەڵام خوای گەورە وادەو بەڵێنی لێخۆشبوون و مەغفیرەت و فەضل و بەخششتان لەلایەنی خۆیەوە پیٚ دەدات ، چونکە بەراستی خوای گەورە زانست و زانیاری گەلیٚ فراوانە ..

بەڵیٚ خوای گەورە بەرێژەیەکی دیاری کراوو گونجاو رزق و رۆزی بەخشیوە بەسەر ئەم زەویەوە، ئەمەش لەبەر چەندین حیکمەت و دانایی کەهەر خۆی دەیزانیٚ وەکو یەکیٚ لەو حیکمەتانەمان بۆ ئاشکرا دەکاو دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الأَرْضِ وَلَكِنْ يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴾ شوری / ٢٧ .

واتە ئەگەر خوای گەورە رزق و رۆزی یەکجار زۆر کردبایە بۆ بەندەکانی ئەوە دەبوە هۆی زیادە رەوی و دەست درێژی کردنیان لەسەر زەوییەوە ،بەڵام خوای گەورە بەرێژەیەکی گونجاو پڕ لەحیکمەت و داناییەوە دای بەزاندووەو دادەبەزێنیٚ ، چونکە خواستی خوای گەورە پڕی رەحمەتە بۆ بەندەکانی، وەرێك و گونجاوی و دانایی و حیکمەتە ، وەخۆی لەهەموو کەسیٚ باشترو شارەزاترە بەعەبدو بەندەکانی وەچاوی بینای هەمیشە لێیانەوەیە .

کەم و زۆری رزق و رۆزی بۆ فلاَن و بۆ فیسکەیا، بۆ فلاَن گەل و فیسکەکەیتر لەو زەمان و لەزەمانەکەیتر، یا لەو شوێن و لەشوێنەکەیتر ، ئەمە گشتی سوونەنی خوای گەورە دەور تێدا دەبینیٚ ،ئەگەر ئەو گەلەی روو لەخوا بێت و بەرنامەو یاسای خوای گەورە پڕ بەدڵ و گیانەوە بەر قەرار بکەن و ئەوە سوننەنی خوای گەورە وایە دەوڵەمەندیان دەکات و ماڵ و منداڵ و باغ و باغات یان پیٚدەبەخشیٚ، بەکورتی بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان بەسەرا دادەبارێنیٚ وەك ئایەتەکانی (١٠ ، ١١، ١٢) لەسورەتی نوح ئامـاژە بۆ ئەم حەقیقەتە

دەکات، وەئێمەش لەناوی (الغفار)دا باسمان کرد .. ئەو گەلەی روو لەخوا نەبێت و وەرە بەرنامەو یاسای خوا بەدڵ و بەگیان پێشوازی لیٚ نەکات و بەرقەراری نەکات ، ئەوە خوای گەورە قات و قڕی بەسەریاندا دادەبارێنیٚ، بەتایبەتی ئەگەر ناوی موسڵمانێتی لەخۆیان بنێن پێغەمبەرو رابەریشیان بۆ هاتبێت ، وەئەگەر ماڵیشیان پیٚبدات ، ئەو ماڵە دەکات بەمایەی دەردو بەڵاو فیتنەو میحنە بەسەریانەوە وەکو ئایەتەکانی (١١٢ ، ١١٣) النحل ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە دەکات ، جالەکۆتاییدا دەڵێین .. اللهم انّك الغفور فاغفر لنا وانك الرحمن فارحمنا وانّك الرزاق فارزقنا من الطيبات في الدنيا والاخرة ..

## ١٨ ـ الفتــاح

ناوێکه لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای رۆزیدەر بنچینەی ئەم ناوە (فتح)ە واتە کردنــەوەو یەکالآ کردن ، یەك جار ئەم ناوە لەقورئاندا هاتوە وەك دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَــا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ ﴾ سبأ / ٢٦ .

الفتاح : واتە بەردەوام کردنەوەی گرێکان و یەکالآ کردنیان (کاری خودای بالآ دەستە) یـا بەمانایــەکی‌تر پــەروەردگار خوایێکــە گرێکــان و داخراوەکــان دەکاتــەوە ، کلیلــی هــەموو گیروگرفت و هەموو شتێکی لەلایــە، گەنجینــەی رەحمــەتی بــۆ بەنــدەکان والآیــە ، هــەروەها لەوەخت و کاتی خۆیدا موسلّمانەکان لــەکافرو بێبڕواکــان جیــا دەکاتــەوەو ســەریان دەخــاو دلّنیایی دەبەخشێ پێیــان، کەپــەروەردگاریان فەرامۆشــیان ناکــاو لــەوەخت و کــاتی خۆیــدا سەرفرازو سەرکەوتویان دەکا .. خوای گەورە دوعای حەزرەتی شــوعەیب پێغەمبــەرمان بــۆ دەگێڕێتەوەو دەفــەرموێ : ﴿..رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْــرُ الْفَــاتِحِينَ ﴾ الاعراف / ٨٩ .

واتە : شوعەیب پێغەمبــەر – علیــە الـصلاة والـسلام – پاڕایــەوە لەبــەر پــەروەردگاری لەبەرامبەر گەلەکەیەوە ، ئەوەبوو فەرمووی : پــەرەوەردگارا یــەکلا بکــەوە لەبــەینی ئێمــەو بەینی گەلەکەمان بەڕاستی و دادپەروەرێتی ، بێگومــان تــۆ باشــترین یەکلاکــەرەوەی نێــوان راستی و ناڕاستیت ..

خوای گەورە کە (فتاح)ە فتح و یەکالا کردن کارو هەلّوێستیەتی لەهەموو روو لایەنێکەوە ، بۆ ئەوەی زیاتر لەمانای ناوی (الفتاح) حالّی ببین فەرموون ئێوەو چەن ئایەتێ ، کــەزیاتر و باشتر لەناوەڕۆکی ئەم ناوە پیرۆزە شارەزامان دەکات خوای گــەورە لەســورەتی (الاعــراف) دا لەئایەتی (٩٦)دا دەفەرموێ : ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَــاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ الاعراف / ٩٦ .

ئەگەر بهاتبایە مەردوومانی دێیەکان ئیمانیـان بهێنابایـەو وەتـەقوای خوایـان بکردایـە بێگومان دەرگاکانی بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ یەکالا دەکردنەوەو بەهرەمەندمان دەکـردن لەناو رەحمەتی خۆمانا دامان دەپۆشین ، بەلام ئیمانیان نەهێناو رێگای خوایان بـەدرۆ زانیـو گوێیان نەدا بەتەقوای خوا کردن، بۆیە گشتیان کەوتنە بەر قارو غەزەبمانەوە لەبەرامبەر ئـەو کارو کردەوەو بیروباوەڕە پوچەیانەوە کەئەنجامیان دەدا، بەڵێ سـونەتی خـوای گـەورە وایـە ، ئیمان پوختەو بەجێ لەگەڵ تەقوایێ جێگـەی رەزامەنـدی خـوابێ بـەرەکاتی ئاسمـان و زەوی مایەسەر دەکـاو بەرقـەرار دەکـاو، ئـادەمیزادانی پێبەهرەمەنـدو خۆشـحاڵ دەکـا ، بـەلام پێچەوانەی ئیمان و تەقوا کەدەکاتە کوفرو عصیان یا بێباوەڕی و گـوێ نـەدان بەبەرنامـەی خوا، یا بێ ئاگایی و خۆگێل کردن لەراست دینی خوا، نەهەر هیچ بـەزیاد ناکـات !! بـەڵکو مـاڵوێرانی و قـەهرو غـەزەبی خواشـی شاسـتە دەبـێ و رووڕەشـی و شـەرمەزاری بـەولاوە هیچیتری بۆ نامێنێتەوە لەسەرەنجاما ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (فاطر)دا لەئایەتی (٢) دا دەفـەرموێ : ﴿ مَا يَفْتَحْ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلاَ مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلاَ مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ فاطر / ٢

واتە : هەر دەرگایێ خوای گەورە بۆ خەڵك و مەردوومان بکاتـەوە لەرەحمـەت و بـەزەیی خۆی ، کەسێ نیە بەری بگرێ یا دوای بخـا یاکـەمی بکاتـەوە ، هـەروەها بەپێـچەوانەشەوە ئەگەر خوای گەورە دەرگایێ لەخەڵك و مەردووم داخا ، رەحم و بـەزەیی پێیانـەوە نەیەتـەوە کەشایستەی نەبن ، ئەوە کەسێ نیە رەحمەت و بـەزەیی بنێـرێ و بەهرەمەنـدو فەرامۆشـیان بێنێتەوە ، بەڕاستی خوای گەورە شـکۆمەندو ئـازیزە دەرگاکـانی رەحمـەت و غـەزەب هـەر لەدەست خۆیەتی و هەر خۆی دەزانێ چ گەل و قەومێ شایەستەی رەحمەتن یا غەزەبن چونکە هەر خۆی حەکیم و دانایە ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (الشعراء)دا لەئایەتانی (١١٦ تا ١٢٠) دا دەفەرموێ :

﴿ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَـا نُوحُ لَتَكُـونَنَّ مِـنَ الْمَرْجُـومِينَ(١١٦)قَـالَ رَبِّ إِنَّ قَـوْمِي كَذَّبُونِي(١١٧)فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَنْ مَعِي مِنَ الْمُؤْمِنِينَ(١١٨)فَأَنْجَيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ(١١٩) ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ ﴾ واتـە پـاش ئـەو هـەمو رەنـج و تەقەلایەی حەزرەتی نوح بەشەوو بـەرۆژ بـۆ ئـەوەی گـەل و قومـەکی بێنێتـە سـەر رێگـای هیدایەت و راستە شەقامی خودایی ، بۆرە پیاوەکانی گەل و قەومەکەی لـەجیاتی پێـشوازی لێـکەن و رێگەی هیدایەت بگرنەبەرو خۆیان پێ بەهرەمەندو بەختیار بکەن ، بـەڵام دونیـاو هەواو شەیتان پەرستنیان وای لێکردن لەو بانگەوازە شـیرینەی حـەزرەتی نـووح قـاڵ بـبن و بێزار بن، بڕیاریان داو وتیا ئەی نوح ئەگەر وازنەهێنی لەو بـاس و خواسـەت ئـەوە شـك و گومانی تیا نی‌یە لەوان کەسانە خۆت دەبینیەوە کەبەر شاڵاوی بەردەبارانی رەجـم کـراوین ، جا حەزرەتی نوح فەرمووی پەروەردگارا گەل و قومی من رێگای بانگـەوازی لای تـۆ بـەدرۆ دەزانن و باوەڕی پێناهێنن ، جا جیایی‌و یەکالاَ بکە لەبەینی مـن و ئـەوان حـەق و ناحـەق لەیەك جیاکەیتەوەو ، حەق سـەرخەیت و ناحـەق مـۆری رەش بەنێوچـاوانا بـێنی وەرزگـارو نەجاتی من و ئەو کەسانەش بدەی کەلەگەڵ مندان و خاوەن ئیمانن ، جا خـوای گـەورە نـزاو دوعاکەی گیرا کردو رزگاریانی کرد، باقی بێباوەڕان و دونیاو شەیتان پەرستانیـشی نـوغرۆ نوقمی ئاوێ کردن بەشێوەیەکی وا تاکی لێ نەهێشتن و تۆوی بڕاندنەوە ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (الاعراف)دا لەئایەتی (٤٠ و ٤١) دا دەفـەرموێ ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ(٤٠)لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِـنْ فَـوْقِهِمْ غَوَاشٍ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴾ واتە ئەوانەی ئایات و بەرنامـەی خـوای گـەورە بـەدرۆی تێدەگەن و بەدرۆی دەخەنەوە وەلوت بەرزی دەکەن لەگوێڕایەڵێتیدا ئەمانـەو هـاو وێنـەیان دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە، وەکاتێ کەگیانیان دەرچـوو سـەرناکەوێ بـەرەو ئاسمـان ،

پیرۆزو بەهرەمەند نابێ بەگەیشتنی لیقای خوای گەورە، وەناشچنە بەهەشتەوە هەتا ئەگەر حوشتریش بەکونە دەرزیدا بڕوات ، ئا ئەوها پاداشتی تاوانبارو موجریمان دەدەینەوە ، شوێن وپالەخانەیان لەجەهەندەم و دۆزەخایە وەلەسەرووشیانەوە چەندین تەبەقاتی ئاگرینی دایان دەپۆشێ، ئا ئاوەها پاداشی ستەمکارو زاڵمان دەدەینەوە..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (الصف)دا لەئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرْ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ .. پاش ئەوەی خوای گەورە رووەو ئیمانداران دەفەرموێ ئایا بازرگانیەکتان نیشان بدەم کەببێ بەمایەی رزگاری و نەجات بونتان لەعەزاب و ئازاری بەئێشی جەهەندەم، ئیمان و باوەڕتان بەخوداو پێغەمبەرەکەی پتەوو بەهێز بکەن، بەبیرکردنەوەو دیراسەکردنی، وەکۆشش و جیهاد بکەن لەپێناوی رێگای خودا بەماڵتان و بەگیانتان، ئەمە بۆ ئێوە خێرترو باشترە ئەگەر ئێوە بیزانن، چونکە مایەی لێخۆشبوونی گوناهەو تاوانەکانتانەو مایەی چوونە بەهەشتانە، کەبەژێریانەوە چەندین روبارو کانیاو جاری دەبێ و شوێن و مەئواو، مەساکینی باش و خۆش بۆتان دەبێ لەبەهەشتانی عەدن بەڕاستی ئەمە فەوزو سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە، وەبەهرەو نیعمەتێکی تر کەزۆر حەزتان لێیەتیو پێتان خۆشە ئەویش بریتیە لەسەرکەوتنی دونیا، کەلەلایەنی خوای گەورەوە پێتان دەبەخشرێ و وەسەرکەوتنی بەرفراوانی زۆرو لەکات و زەمەنێکی نزیک ، ئا بەم نیعمەتانی زۆرەوە لەدونیاو قیامەت مزگێنی و بەشارەت بدە بەخاوەن باوەڕان و ئیمانداران ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی سەجدەدا لەئایەتی (٢٨ — ٢٩)دا دەفەرموێ ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْفَتْحُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ(٢٨)قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لاَ يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ وَلاَ هُمْ يُنْظَرُونَ ﴾ واتە خوای گەورە دەفەرموێ بێ باوەڕو کافرە خوا نەپەرستەکان دەڵێن کەی ئەو سەرکەوتن و پیرۆزی و بەرزیە یەکالا دەبێتەوە بۆ ئێوەو، قیامەت مەحشەر دێتە مەیدانی واقیعەوە ئەگەر ئێوە راست دەکەن ولەڕاست گۆیانن ، ئەی پێغەمبەری خوا بفەرموو بڵێ رۆژێ یەکالابوونەوەو سەرکەوتن (یارۆژی) فەتح و قیامەت دەستەی کارفرو بێ

باوەڕەکان سودیان بۆ نادا وەیارمەتی و مۆڵەتیش نادرێن چارەیەکیشیان بۆ نیەو نابێ ..
هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (النصر)دا دەفەرموێ :

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ
إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ(١)وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا(٢)فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴾

ئەگەر هات و نەصرو سەرکەوتن وەفەتح و یەکالاّ بوونەوەی خوایی هاتە پێشەوەو، کەوتە گۆڕەپانی واقیعەوە وەخەڵك و مەردوومانت بینی دەهاتن بۆ ناو ئاینی خوا پۆل پۆل، ئەوسا بیر لەوادەو بەڵینەکانی خوای گەورە بکەوەو کەهەمووی راست و بەجێن وەتەسبیحاتی بەستایش و حەمدی پەروەردگارت، بکە ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونی لێبکەو تەوبە بکە بەراستی و بێگومان خوای گەورە لێخۆشبووی تەوبە وەرگرە ..

دیاردەی ئەم هەموو کەون و بونەوەرە هەر لەبچوك تا گەورە هەر لەنەوی و بەرزی هەر لەڕەش و سپی هەر لەماددی و مەعەنەوییان هەر لەئێستاو مێژوویەوە گشتیان شاهێدن لەسەر فەتاحێتی خوای گەورە کەچۆن خوای گەورە هەموو گرێ کوێرەکانی کردۆتەوەو دەکاتەوە ، کەچۆن پێغەمبەران و لایەنگرەکانیان لەهەڵگرانی بیروباوەڕی خوابەیەك ناسین بەدرێژایی مێژوو ناوجەرگەی تاریکی و کوفریان شەق کردووەو حەق و ناحەقیان یەکالاّ کردووتەوە، بەئیزن و یارمەتی خوای گەورە ئەم یەکالاّیەش بەردەوام دەبێ تاکو رۆژی قیامەت کەخوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێ ﴿ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ ﴾ پۆل و دەستەیێ بۆ بەهەشت و پۆل و دەستەیێ تریش بۆ جەهەندەم و سەعیر . ئەو راستیەشمان لەبیرنەچێت کەفیترەو بوونی ئادەمیزادیش وەك کەشاهێدە لەسەر بونی خوای گەورە هەر ئەوهاش شاهێدە لەسەر ناوەجوانەکانی لەم ناوانەش ناوی (الفتاح) .

وەك دەی بینین و دەی بیستین و دەی خوێنینەوە کاتێ کەئادەمیزاد لەکارو پیشەیەکا گرێ کوێرەیەکی دێتە رێگا یا لەتەنگ و چەڵەمەیەکدا ، بێ چارە دەمێنێتەوە وەبێ هیواو مەئیوس دەبێ لەدەوروبەری ماددیاتی، یەکسەر هەستی دەڕوا بەرەو سروشتە فیترەکەی خۆی

کەبریتیيە لەئومێدبوون بەو زاتەی کەهیچ شتێ ناتوانێ لەئاستیا وەك گرێ کوێرە بمێنێتەوە، هیواو ئومێدی پێ دەخوازێ و لەبەریا دەپارێتەوە یارمەتی بدات و هیدایەت و رێنموئەیی بکات بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەکە یا حەلی تەنگ و چەڵەمەکەی ، ئەم زاتە ئومێد پێخوازەش خوای گەورەو میهرەبانە ، ئەو زاتە دەسەڵات بێ سنورە خاوەن ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرزەکانە ، ئەو زاتەی فیترە بەرەو لای ئاوڕدەداتەوە لەکاتی وەستانی لەبەرامبەر کارێ کەلێیەوە دەستەوەستانە ، ئەو زاتە پەروەردگاری جیهانە ئەو زاتە بەڕێوەبەری لایەنانی ماددییات و مەعنەویاتە ، بەڕێوەبەری بەدەن و هۆش و بیرو روح و عەقڵەکانە بەڕێوەبەری مێروو نەهەنگ و مەجەرەکانە هەر خۆی رەزاقەو فەتاحەو رەحمانەو پاك و بێ گەردە و شایەستە بە خاوەن ناوە جوانەکانە .

## ١٩ ـ العليم

ناوێکه لەناوه جوانـه پیرۆزەکـانی خـوای سـەر هێخـەرو زاڵ ، ئـەم نـاوه (١٤٠) جـار لەقورئانا هاتووه ، بنچینەکەی (علم)ە واته زانست و زانیاری .

العلیم : واته خوای گەوره زۆر زاناو ئاگاداره بەهەرچـی زانیـاری هەیـه لەئاسمانـەکان و زەویدا ، وەهیچ زانیارییێ لەدەرەوەی زانست و زانیاری ئەودا نیه .. وەزانست و زانیاری خوای گەوره دەوری داوه بەئەزەل هەتا ئەبەد ، وەتاریکیو پێچ و پەناو شاراوەیی و گەورەو بچوکی رێ لەزانست و زانیاری خوا ناگرێت، تەنانەت خوا زانایه بـەو خەیاڵانـەی خۆیـان ئاڵانـدووه بەبیرو هۆشەکانەوەو لەدڵەکانا شاراوەن، وەهەرچی بونەوەرەکان هەیه لەسەر زانست و زانیاری خوای پەروەردگار هاتونەته بوون و رێکخستن و ئەندازه وەرگرتن و رێنمونـەیی کـردن ، بۆیـه خوابەهەواڵیان و زانستیانا دەوری داوه .. وەهەرچی زانست و زانیاری هەیـه جالەهـەرج روو لایەنێك بێ ئەوه سەرچاوەکەی وا لەلای خوای بێ هاوتایه .. وەهەر زینده بونەوەرێ بەشێکی لەزانست و زانیاری پێدراوه بۆ بەرێوەچوونی ژیان و گوزەرانی و پاراسـتنی رەگـەزی خـۆی، ئادەمیزادیش کەمێکی زانـستی پێـدراوه ، وەکـو خـوای پـاك و بێگـەرد دەفـەرموێ : ﴿ وماأوتيتم من العلم الا قليلا ﴾ الاسراء .

وەخوای گەوره بەهەر هەموو شتێ زانایه ، وەکەسێ نیه شان لەشانی بدا لـەزانینا تەنانـەت کەسێ نیه زانیاری بۆبێ تەنها لەلای خوای گەورەوه پێی بەخشراوه ، جا دانی پیابنێ یا نا، وەهۆو وەسیلەو ئەسبابەکانی زانیاری خۆیان جۆره زانیاریەکی تری خوان بەخشراون بەبـەرەی ئادەمیزاد ..

خوای زانا بەخواست و ویستی خۆی هەر چەندێکی لەزانیاری بیەوێ دەیبەخشێ بەهـەر کەسێ و بەهەر زیندەبوێ، کەسێ ناتوانێ دەست خەری تیا بکا لەچـەن و چـۆن و چـۆنایەتی ئەو زانست و زانیارییه ، جا ئەو کەسەی شایانی زانیاری پێدان بێ لەبەرامبەر حیکمـەت و دانایی خوای گەورەوه، ئەوه زانیاری پێدەداو رێزیشی دەگـرێ و بەرزیـشی دەکاتـەوه ، وەك دەفەرموێ : ﴿ يرفع الله الذين آمنوا منكم والذين اوتوا العلم درجات ﴾ المجادله . واته خوای

گەورە ئـەو كەسـانە بـەرز دەكاتـەوە لـەئێوە كەئیمانـدارن ، وەئەوانـەی خـاوەن زانیـاری و تێگەیشتنن بەچەند پلەیێ بەگوێرەی زانیاریەكەیانـەوە بـەرزیان دەكاتـەوە .. خـوای گـەورە دەفەرموێ : ﴿ **وعنده مفاتح الغيب لايعلمها الا هو ويعلم مافي البرّ والبحر وماتسقط من ورقة الا يعلمها ولاحبة في ظلمات الارض ولا رطب ولايابس الا في كتاب مبين** ﴾ الانعـام / ٥٩ .

واتە : كلیلەكانی زانیاری بەنادیار وا لای خوان كەسێ نایان زانـێ تـەنیا خـۆی نـەبێ ، وەدەزانێ بەوەی لەبیابانەكان و دەریاكان دا هەیە ، وەگەلایێ بەر نابێتەوە لەدارا ئـیللا خـوا دەیزانێ ، وەدانەیەكیش نیەلەتاریكایی ژێر زەویدا وەتەڕو هیشكێ نیەیە لەبونەوەردا ئـیللا والای خوای گەورە لەنوسـراوەی روون و ئاشـكرادان ، وەخـوای بەخـشندە داوامـان لێ‌دەكا كەلێی بپاڕێینەوە ، كەزانیاریمان بۆ زیاد بكات وەك دەفەرموێ : ﴿ **وقل ربّي زدني علماً** ﴾ طه / ١١٤ ، واتە بڵێ پەروەردگارم زانست و زانیاریم بۆ زیادكە.. خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿ **يعلم مايلج في الارض ومايخرج منها وماينزل من السماء ومايعرج فيها وهو معكم اين ما كنتم والله بما تعملون بصير** ﴾ الحديد / ٤ . واتە : خوا زانیاری هەیەو دەزانـێ بەهەرچـی دەیهێنێتە رێـزی بوەكانـا لەسـەر زەوی وەهەرچـی لـەرێزی بوەكانـا كۆتـایی پێ‌دەهێنێ ، وەهەرچی لەئاسمانا دادەبەزێ وەهەرچی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمـان ، وەئـەو خوایـە لەگـەڵتانا لەهەر شوێنێ بن ، ئاگادارو بینەرە بەو كارانەی كەدەیكەن ..

لەڕاستیدا زانست و زانیاری خـوای گـەورە گـەلێ لـەو سـنورە بـەدەرترە كەبیروهۆشـی نادەمیزادی پێ‌گەییوە ، وەئادەمیزاد هەرگیز ناتوانێ حاڵی ببێ و تێبگا بەتەواوی لـەو بـێ سنورییە، خوای گەورە لەزۆر روو لایەنەوە باسی زانیاری خۆیمان بـۆ دەكـا كەئـەم ئایەتانـە هەندێكیانن دەفەرموێ : ﴿ **كيف تكفرون بالله وكنتم امواتاً فأحياكم ثمّ يميتكم ثمّ يحييكم ثم اليه ترجعون * هو الذي خلق لكم مافي الارض جميعاً ثم استوى الى السّماء فسوّاهنّ سبع سماوات وهو بكل شيءٍ عليم** ﴾ البقره / ٢٨ — ٢٩ .

واتە چۆن ئێوە بێباوەڕو كافردەبن بەزاتی خودای گـەورە كـە (الله)یـە لـەكاتێكا ئێـوە وجودێكتان نەبوو، ئێوەی بەدیهێناو خستنیە گۆڕەپانی ژیانەوە پاشان دەتـان مـرێنێ بـەرەو

گۆڕو قەبرستان لەعالەمی بەرزەخا دەتان هێڵێتەوەو پاشـان زینـدووتان دەکاتـەوە پاشـانیش بەلای خوای گەورە دەگەڕێندرێنەوە ، وەزاتی (الله) هەر خۆیەتی هەرچی پێداویستی ژیانتانە لەسەر زەوی بۆی خلق کردوون و بـەدیهێناون لەگـشت شـتێ هـەر هـەمووی پاشـان بـەرزی کردۆتەوە بەرەو ئاسمانی دونیا جا حەوت ئاسمانی تری بەسەرەوە بەدیهێناوەو بەهەموو شتێ و زانیارێ زانایە . هەرچی زانیاری زانست هەیە گشتی هەر ئی خودایە خوای گەورە خۆی هۆو ئەسبابەکانی خەلق کردووەو بەدیهێناوە، وەکو کالاَو بالاَ دەبـەریانی کـردووە بەرەحمـەت دای ریشتووە ، هەروەها خوای گەورە بەزمانی فریشتەکانەوە دەفەرموێ : ﴿ قالوا سبحانك لاعلم لنا الاّ ماعلمتنا إنّـك أنـت العلـيم الحكـيم ﴾ فریـشتەکان فـەرموویان پـاکی و بێگـەردی شایەستەی تۆیە ئەی پەروەردگار بەڕاستی ئێمە هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە ئـیللا ئـەوە نەبێ کەتۆ خۆت فێرمانت کردووە ، بێگومان تۆ زانای بەهـەموو شـتێ وەدانـای لەهـەموو کارێ .. لەڕاستیدا نەك هـەر فریـشتەکان بـەڵکو هـەر هـەموو مەخلوقـەکانی تـر لـەپێش هەموانیش ئادەمیزاد هیچ زانست و زانیاریەکی نەبووەو نابێ ئیللا لـەلای خـوای گـەورەوە پێی بەخشراوە ، وەخوای گەورە چۆن ڕۆزیدەرو رازیقە هیچ رۆزی و رزقێ نیە ئیللا ئی ئەمەو بەخواست و ویستی خۆی وەبەئەندازەیەکی پڕ لەحیکمەت و دانایی دەیبەخـشێ ، زانیـاریش ئاوا خۆی لەخۆیدا جۆرە رزق و رۆزییەکی بیرو هۆشەکانە ، دەیبەخشێتەوە بەسەر مەخلوق و بەدیهێنراوەکانی ..

کاتێ کەحـەزرەتی ئیـبراهیم و ئیـسماعیل خـانووی کەعبـەیان دروسـت کـرد ووتیـان پەروەردگارا ئەم کارەو بەندایەتیەکەمان لێقەبووڵ بکە بەڕاستی تۆ بیسەرو زانـای بەهـەموو شتێ ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ وإذ يرفع إبراهيم القواعد من البيت وإسماعيـل ربّنـا تقبل منا إنّك انت السميع العليم ﴾ البقرە / ١٢٧ ، بەڵێ حەزرەتی ئیبراهیم زانای خوانـاس و باپیرەی پێغەمبەران و دۆست و خەلیلی رەحمان، خـوا دەناسـێ و دەزانـێ کـەخوای گـەورە بیسەرە بەهەموو ئاوازو دەنگێ زانایە بەهەموو نیازو رەنگێ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (البقرە)دا لەئایەتی (٢٥٦) دا دەفـەرموێ : ﴿ لاإكـراه في الدين قد تبيّن الرشد من الغي فمن يكفر بالطاغوت ويـؤمن بـالله فقـد استمـسك بـالعروة

الوثقى لاانفصام لها والله سميع عليم ﴾ واته : ئیکراه و زۆری نیه لەئاین و دینا چونکه ئـاین و دین دەبێ بەقەناعەت و باوەڕەوە بێ، وەبێگومـان ڕێگـەی راسـت و پـیرۆزی روون بـووەوه لەگەڵ ڕێگەی زیادەڕەوی و وێڵی و گومڕایی، جا هەرکەسێ کافرو بێ بـاوەڕبێ بـەتاغووت و زاڵم و ستەمکار بەخوا نەویست و بەدکار وەئیمان بینێ بەزاتی (الله) خـودای میهرەبـان ئـا ئەوە بەڕاستی دەستی گرتووە بەدەست بەندێکی زۆر قایم و بـەهێزو پـیرۆز بـەهیچ شـێوەیێ پسان و پچڕانی لەبۆ نیە، چونکه ڕێگەی راستی خودایه بیسەرە بەهەموو خواسـت و ئـاوازێ وەزانایه بەهەموو رازو نیازێ ..

خوای گەورە لەسورەتی آل عمران دا لەئایەتی (٦٢ — ٦٣) دەفەرموێ : ﴿ إنّ هـذا لهـو القصص الحقّ وما من إله الاّ الله وإن الله لهو العزیز الحکیم فإن تولّوا فإنَّ الله علیم بالمفسدین ﴾ واته : بەڕاستی و بێگومان ئەم قورئانەو هەموو باس و خواسەکانی حەقن و راسـتن دوورن لەهەرچی ناتەواویێ هەیە، وەهیچ پەرستراوێ نیه تەنها زاتـی (الله) نـەبێ، وەبەڕاسـتی ئـەم زاته خاوەن عیززەت و دانایی‌یه شـکۆمەندو کـار لەجێیـە ، جـا ئـەوەی پـشت هـەڵ بکـا لەبەرنامەو پـەیامی ئـەو، ئـەوە حـەقی بـەجێ هێـشتووەو بـەکارو کـرداری خراپـەکاری و فەسادی‌دا کەوتووەو، خوای گەورەش لێیەوە بێ ئاگا نیەو پێیانەوە زاناو ئاگادارە ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی الانعام دا لەئایەتی (١١ ـ ١٣) دەفەرموێ : ﴿ قل لمن مافي السموات والارض قل لله کتب علی نفسه الرحمة لیجمعنکم الی یوم القیامة لاریـب فیـه الذین خسروا انفسهم فهم لایؤمنون * وله ماسکن في اللیل والنهـار وهـو الـسمیع العلـیم ﴾ واته ئەی پێغەمبەری خوا بفەرموو بڵێ کێیەو ئی کێیە هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی‌دایـە؟! دیارە هەر ئی خوای گەورەیەو بفەرموو ئی زاتی (الله)یە ئەو زاته رەحمەت و بـەزەیی لەسـەر نەفس و گیانی خۆیا نووسیوە ، چاکەی چاکەخوازان بەفیڕۆ ناچوێنێ و خراپـەی بـەدکارانیش فەرامۆش ناکاو، بێگومان شکێکی تیا نیـە ، وەئەوانەی کەدۆڕاوو خەسارەت مەنـدن هـەر ئەوانەن کەنایەنە ژێر ئاڵای رەحمەتی خودایی‌ـو بەرنامەکـەی ، وەئیمـان بەڕاسـتی دروسـتی بەرنامەو کیتابی خوای گەورە ناهێنن ، وەهەموو کەون و بونەوەر هەر ئی خوایەو وەهەرچـی

دانەکەویٚ بەشەوو بەرۆژ هەر ئی خوایەو ئەو زاتە خۆی بیـسـەری هـەموو ئـاوازو دەنگێکـە وەزانایە بەهەموو نیازو رەنگێکا ..

خوای گەورە لەسورەتی الاعراف دا لەئایـەتی (٢٠٠)دا دەفـەرمویٚ : ﴿ وإمـا ینزغنّـك من الشیطان نزغ فاستعذ بالله انه سمیع علـیم ﴾ واتە ئەگەر شـەیتان هەوڵی‌ـدا بـەوەی دڵـت لابەریٚ یا تێك بدات لەسەر صەبرو ئارامی یا لەسەر لێبوردەیی و فراوانی، ئەو کاتە یەکسەر روو بکە خوداو پەنا بگرە بەخوای میهرەبانەوە، بزانە خوای گەورە ئاگادارە بەهەموو شـتیٚ و بیسەرە بەهەموو ئەو کەسانەی کەپەنای بۆ دەبەن و لەبەریا دەپاڕێنەوەو نزا دەکەن، وە زانـاو بەتوانایە بەهەموو کارو کردەوەییٚ .

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی الانفال لەئایەتی (٥٣)دا دەفەرمویٚ : ﴿ ذلك بـأنّ الله لم یك مغیراً نعمة انعمها علی قوم حتی یغیروا مابأنفسهم وأن الله سمیع علیم ﴾ واتە سونەتی خوای گەورە وانیە کەخێرو بێرو نیعمەتیٚ بدا بەگەل و قەومیٚ پاشان بیگۆڕیٚ و لیٚیـان تێـك بدات هەتا بەخۆیان لەخۆیان تێك نەدەن، بەوەی کەپشت لەبەرنامەی خـوا دەکـەن، دەکەونـە گوێڕایەڵی نەفس و شەیتانەکان، ئەو کاتە خوای گەورە دەرگاکانی رەحمەتیان لەسەر دادەخـاو دەرگاکانی غەزەب و قارو قینیان لەسەر دەکاتەوە، چونکە خوای گەورە بیسـەرە بەخواسـت و ویستی هەموو گەل و قەومیٚ، وەزانایە بەهەمووکارو کردەوەییٚ .

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویٚ : ﴿ الا إنّ اولیاء الله لاخوف علـیهم ولاهـم یحزنـون * الذین آمنوا وکانوا یتقون * لهم البشری في الحیاة الدنیا وفي الاخرة لاتبدیل لکلمات الله ذلـك الفوز العظیم * ولایحزنك قولهم إنّ العزة لله جمیعاً هو السمیع العلیم ﴾ یونس / (٦٣ — ٦٥) . واتە بێدارینەوە بزانن کەدۆستان و ئەولیایانی خوای گەورە هەرگیز ترس و خۆفیـان لەسـەر نیەو وەقەتیش غەمگین و زویرو نارەحەت نابن ، بەڵیٚ ئەوانەن کەئیمانێکی راست و دروسـت و تەواویان هەیەو تەقواو خۆپارێزیەکی راست و بەجیٚ دەکەن مزگێنی و بەشارەت لـەبۆ وانـە هەم لەژیانی دونیایی کەخوای گەورە بەنوری هیدایـەت بەهرەمەنـدیان دەکـات و وەلـەرۆژی دواییشدا هـەر مزگێنـی و بەشـارەت لەبۆیانـە بـەوەی کـەخوای گـەورە لیٚیـان دەبـوریٚ و بەهەشتیان پیٚ دەبەخشیٚ ، وەسونەن و کەلام و وادەی خوای گەورە نەگۆڕەو ناگۆڕیٚ بەڕاستی

ئەوەی ئەمسەرکەوتنە بەدەست بهێنێ ، سەرکەوتن و فەوزێکی زۆر گەورەو عەزیمە، جا باغەمگینت نەکات قسەو قسەلۆك و پڕو پاگەندەیان ، بەڕاستی و بێگومان دونیای عیززەت ئی خوایەو بۆ خوایە هەر گشتیو هەمووی، خۆی بیسەرە بەهەموو دەنگ و باسێ وەزانایە بەهەموو خواست و نیازێ ..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (نور)دا لەئایەتی (٤١)دا دەفەرموێ : ﴿ ألم تر انّ الله یسبح له من في السموات والارض والطیر صافّات کل قد علم صلاته وتسبیحه والله علیم بما یفعلون ﴾ واتە ئایا نابینن و تێناگەن و نازانن بەوەی کەهەرچی لەژێرمەندو عاقڵ و هۆشیارانی ئاسمانەکان و زەویدایە، گشتیان لەتەسبیحات و حەمدی خوای گەورەدان، وەباڵندەو تەیرو مەلەکان کەباڵ لێك دەکەنەوەو لەئاسمانا دەفڕن بەهەمان شێوە لەتەسبیحاتی خوادان ، هەموو جۆرە بابەتە بەدیهێنراوو مەخلوقەکان هەر گشتیان دەزانن چۆنیەتی نوێژو تەسبیحاتی خۆیان، خوای گەورە فێری کردوون زانایە بەو کارو کردەوەی کەدەیکەن .

خوای گەورە لەسورەتی (المجادله)دا لەئایەتی (٧)دا دەفەرموێ : ﴿ ألم تر انّ الله یعلم مافي السموات ومافي الارض مایکون من نجوی ثلاثة الا هو رابعهم ولا خمسة الا هو سادسهم ولا ادنی من ذلك ولا اکثر الا هو معهم این ماکانوا ثم ینبئهم بما عملوا یوم القیامة إنّ الله بکل شيء علیم ﴾ واتە ئایا نابینن و نازانن و تێناگەن بەوەی کەخوای گەورە زانایەو دەزانێ بەهەرچی لەئاسمانەکان و بەهەرچی لەسەر زەویدان ئەوەنیە بەڕێوەیان دەباو دەستی میهرەبانێتیێ پێیانەوە گرتووە .. وەهیچ سێ کەسانێ نیە پستە پست بکەن ئیلا خوای گەورە چوارەمیانە وەهیچ پێنج کەسانێ نیە رازو نیاز دەربڕن یا بەپستە پستیش بێ ئیلا خوای گەورە شەشەمینیانە، چ لەم ژمارەیە کەم ترین وەیا زیاترین ئیلا خوای گەورە لەگەڵیانایەو جا لەهەر شوێنێکا بن ، پاشان لەرۆژی قیامەتا هەواڵیان پێ ئەداتەوە بەو کارو کردەوەی کەکردوویانە، بەڕاستی خوای گەورە بەهەر هەموو شتێ زانایە ..

جا لەکۆتاییدا دەڵێین : ربنا زدنا علما والحقنا بالصالحین ..

## ٢٠ ـ القـابـض

ناوێکە لەناوە جوانە دڵ تەزێنەکانی خوای زانا ، بنچینەی ئەم ناوە (قبض)ە واتە گـرتن و دەست بەسەرداهێنان .

القابض : واتە خوای گەورە پەروەردگارێکی گیان کێشە بۆ گشت خاوەن گیانـان لەهـەر کات و ساتێکا کەخواست و حیمەتی بخوازێ ، وەکەسێ ناتوانێ لەدەستی راکاو لێـی یـاخی بێ، یاخود لەبەر چەندین حیکمەت کەهەر خۆی دەیانزانێ رزق و رۆزی لەسەر مەخلوقەکانی کەم دەکاتەوە ، هـەروەها تەمـەنی بـۆ هـەموو شـتێ دیـاری کـردووە .. چ کەشکەشـان و ئەستێرەکان یا دەریاکان و ماسیەکان یا زەوی و گیان لەبەرەکان .. لەئادەمیزادو ئاژەڵان و باڵندان و دارو درەختەکان .. هتد) وەهەرکەس و هەر شتێ مۆڵەتی کۆتایی هات ئیتر خـوای گەورە ئاگادارەو پێی زانایەو کۆتایی پـێ دەهـێنێ وەك دەفـەرموێ ﴿ والله يقـبض ويبـسط واليه ترجعـون﴾ البقـره / ٢٤٥ .. وەهـەروەها دەفـەرموێ : ﴿ والارض جميعـاً قبـضته يـوم القيامـة ﴾ زمر / ٦٧ .. واتە زەوی بەگشتی لەبەر چنگی قودرەتی خودایە لەرۆژی قیامەتدا

ئەگەر سـەیرێکی مێـژووی دێـرینی ئـەم کەونـەو بونـەوەرە بکـەین بەهـەموو بـەش و پارچـەکانیەوە لەوانـەش بەتایبـەتی زەویـو جێنـشینەکەی کـەئادەمیزادە زۆر بەئاشـکراو دیاردەی روونەوە دەستی میهرەبانێتی پەروەردگارمان بۆ باس دەکاو، دەیخاتە بەرچاوی هۆش و بیرمانەوە ئەم دەستە میهرەبانێتیەی کەهەمیشە (قـابض)بـووە زاڵ بـووە بەسـەر هـەموو بەدیهێنراوەکان ..

مێژووی ئەم بونەوەرە نەهەر قابزێتی خوای گەورەمان بۆ روون دەکاتـەوەو بـاس دەکـا، بەڵکو چەندین ناوە جوانانی تری خوای گەورەمان کەسیفەتان و کاری خواین بۆ دیـار دەخـاو باسیان دەکات، ئەمانە لەلایێ لەلایێتر هەر ئەم مێژووە هەڵوێست و سونەنی خوایمـان بـۆ باس دەکاو روونی دەکاتەوە کەوا خوای گەورە خاوەن هەڵوێـست و سـونەنی نـەگۆڕو خـاوەن

کارو کرداری پـڕ لەحیکمـەت و دانایی‌یـە و درێـژەی ژیـانی پێغەمبـەران (علـیهم الـصلاە والسلام) کەلە قورئانی پیرۆزا باسیان کراوە زیاترو باشتر ئـەم راسـتیانەو سـونەنانە دەخاتـە بەرچاو .. خوای گەورە دەفەرموێ : [ وربّك الغنيّ ذو الرّحمة إن يشأ يذهبكم ويـسـتخلف من بعدكم مايشاء كما أنشأكم من ذرية قوم آخرين * إنّ ماتوعدون لآت ومـا أنـتم بمعجزين ﴾ الانعام / ١٣٣ ـ ١٣٤ .

واتـە وا تـێ نەگـەن کـەخوای گـەورە دەسـتی بەسـەر ئێـوەدا نـاڕوات نـەخێر بـەڵکو پەروەردگاری تۆ زۆر دەوڵەمەندو بێ‌نیازو پێویستە بەئێوەو غەیری ئێوە، لەهـەمان کاتیـشا خاوەن رەحمەت و بەزەیی‌یە خۆ ئەگەر خواستی لێ‌بێ گشتیان بەرێ دەباو لەبەین دەچـوێنێ و شوێنەواریشتان ناهێڵێ، جا لەپاش ئێوەو بەخواست و ویستی خۆی شوێنتان بەبەدیهێنراوانی تر یا بەکەسانی تر ئاوەدان دەکاتەوە ، وەکو چۆن ئێوەی بەدیهێناوەو خەلق کردووەو لەوەچەو نەوەی گەل و قەومانی‌ترا ..

جا حاڵی‌بن و تێ‌بگەن کەوا بێ‌شك و گومان لەهەرچی وادەو بەڵێنەکانی خوای گەورە بەئێوەی داوە هەر هەمووی بەجێ‌یەو دێتـە جـێ، بگـرە هاتووتـە جـێ چـونکە لەزانـست و زانیاری خوای گەورە روون و ئاشکرایە ، وەئێـوە گـشتتان لـەژێر قـەبزەو دەسـەڵاتی خـوای گەورەدان هەرگیز شورەو هۆکاری نیەو نابێ کەخوای گەورە لێتانەوە دەستەوەسـتان بکـات ، وەئێوە لەدەرەوەی دەسەڵاتی خوای گەورە نین، وەئێوە هەموو کاتێ لەهەر شـوێنا بـن لـەژێر دەسەڵاتی خوای گەورەدان و ناتوانن لەژێر دەسەڵاتیەوە دەرچن و ، دەی کەواتـە بـۆ خۆتـان عاقڵ و ژیر بن روو لەخوا بکەن و ئەوا دەرگای لێبوردەیی و لێخۆشبوونی کردۆتەوەو دەستی میهرەبانێتی درێژ کردووە بۆ دۆستایەتیتان ، واز لەکەللـەڕەقی‌و دڵ رەشـی بێـنن ، وەبـزانن ئەمە بۆتان کات و زەمەنێکی دیاری کراوە ئەگەر نەیقۆزنـەوە سـوودی لێ‌وەرنـەگرن ، ئـەوە سونەنی خوا وادەخوازێ ئێوە بـەرێ بکـاو لـەناوتان بـەرێ بەگـەلان و قـەومانی‌تر شـوێنتان پڕبکاتەوە .. هەروەها خوای گەورە سەرنجمان رادەکێشێ کەوا سـوود لەمێـژوو وەربگـرین و

لێیەوە فێر جۆرەها پەندو عیبرەت ببین و شارەزای هەڵس و کەوت و سونەتی خوای گەورە ببین کەچۆن رەفتار دەکات لەگەڵ ئادەمیزادەکانا وەك دەفەرموێ : ﴿ أفلم يسيروا في الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم ولدار الاخرة خير للذين اتقوا افلا تعقلون ﴾ يوسف / ١٠٩

واتە ئایا نارۆن و ناگەڕێن لەسەر زەویدا جا بۆ شوێنەوارو مێژووەکەی بڕوانن !! دە سەیرکەن چۆن بوو عاقیبەت و چارەنووس و سەرەنجامی ئەو کەسانەی پێش ئەوان، ئەی لەژێر قەبزەو دەستی ئێمەیا نەبوون ، ئەی نەڕۆیشتن و نەمردن ، کوا هیچیان ماونەتەوە ، ئەی نازانن ئەوانەی ڕێگایان وێڵ کرد چۆن ماڵ کاول بوون، ئەی نازانن ئەوانەی گوێیان بەبەرنامەی خوا نەدا چیان بەسەرهات ، ئەی نازانن مات و وێڵ و داماو ریسوا بوون، جابزانن ئێوەش هەروا نامێنن کات و ئەجەلی رۆژگار پێتان دەگاو دەستی توانـاداری خوای گەورە دەتان قۆزێتەوەو ماڵئاوایی لەژیان و ژینگە دەکەن و بەرەو ئاسۆو دونیایەکیتر هەڵ دەفڕێن و دەبڕدرێن، بۆ ماڵ و حاڵی مەحشەر دەپێچرێن جاکوێتان هەیە لەدەستی خوای گەورە دەربچێ یا بۆ کوێ دەچێ ، دەی بزانن بەڕاست و بێگومان ماڵ و پایەی دوا رۆژ کەبەهەشتە باشترین و خێرترین شتێکە بۆ خواناسن و خواپەرستان ، ئایا تێناگەن عاقڵ و ژیرنابن نازانن؟! ئێوە مردنتان لەپێشەو خۆڵی چەند ساڵی ترن ، نازانن ئێوە بۆ ئەوە خەلق کراون کەوا خوا بپەرستن ؟! نازانن ژیانتان بۆ تاقیکردنەوەتان پێدراوە ؟؟ نازانن ماهیەت و کارو کردەوەو بیروڕاتان سەرەنجام و مەصیرو دوا رۆژتان بۆ دیار دەکا؟؟ ..

دەسەڵاتی بێپایانی خوای میهرەبان کەهەمیشە (قابض)ە و زاڵە بەسەر هەموو کەون و بونەوەرا هەر خۆشیەتی بەدیهێناون و یاسا و نیزامی بۆ داناون، هەندێ دەمرێنێ و هەندێ دەژێنێ هەندێ شین دەکاو هەندێ دەروێنێ یەکێ لادەداو یەکێتر دێنێ شەوگار درێژدەکاو رۆژگار دەفڕێنێ، گۆڕستانەکان باسی قابزێتی خوامان بۆ دەکەن ، بەرێ کردنی شەوو رۆژمان مووی رەشمان لێ سپی دەکەن و، مووی سپیش تێمان دەگەیەنێ بۆ بەردەستی قابیز دەتبەن..

خوای گەورە لەسورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ : ﴿ ألم تر الى ربك كيف مد الظل ولو شاء لجعله ساكنا ثم جعلنا الشمس عليه دليلا * ثم قبضناه قبضاً يسيرا * وهو الذي جعل لكم الليل لباسا والنوم سباتا وجعل النهار نشورا وهو الذي ارسل الرياح بشرا بين يدي رحمته وانزلنا من السماء ماءً طهوراً * لنحيي به بلدة ميتاً ونسقيه مما خلقنا انعاماً وأناسي كثيراً * ولقد صرفناه بينهم ليذكروا فأبى اكثر الناس الا كفوراً ﴾ الفرقان / ٤٥ – ٥٠ .

ئایا نابینیت و نازانیت لەکارگوزاریەکانی پەروەردگارت لەوەی کەچۆن یاساو نیزامی شەوو رۆژی رێك خستووە سێبەرو تاریکایی درێژە پێدەداو بەخولانەوەی زەوی لەبەرامبەر خۆرا جا ئەگەر خواستی لێبایە زەوی لەخولانەوەو سوڕانەوە دەخست و نیزام و یاسای شەوو رۆژی دادەگرت جا لەتاریکایی دەیهێشتنەوە، یا نعیمەتی شەوو یاساکانی رێکخەری ژیانی لێ تێك دەدان و لێی دەسەندنەوە ، دەی کەواتە لەسەرتانە هەست بەنیعمەتانی پەروەردگارتان بکەن ، لەکاتێکا یاسا بێ یاسادانەر نابێت و وەجولەش بەبێ جولێنەر نابێت ، یاساو جولەش جێگەی دەستی پەروەردگارتانەو پاشان رۆژو خۆری لەسەر ئەو یاساو نیعمەتانە بەدەلیل و بەڵگە گێڕاوە، پاشان پەروەردگار دەستی میهرەبانێتی پێوە گرتووە بەیاسایەکی جوان و رێك و پێك و ووردەوە شەوو رۆژتان بۆ بەدوای یەکا دێنێ ، ئا بەم شێوەیە وورده ووردەو کەم کەمە سێبەری تاریکیتان لەسەر کەم دەکاتەوەو روناکی خۆرتان پێدەبەخشێ و هەروەها بەپێچەوانەشەوە وورده وورده و کەم کەم روناکیتان لەسەر کەم دەکاتەوەو تاریکیتان بەسەرا دێنێ، هەر خۆشیەتی لەئەنجامی سێبەرو تاریکی بەسەر داهێنانا شەوی بۆ بەدیهێناون گێراوە بەمایەی خۆپارێزی رزگاربوون لەدەستی ناحەزانتان کەوەك و کاڵاو باڵاوایە ئەتان گرێتە خۆی و مایەی خێرو بیر لێ دیتنتانە، وەهەروەها نوستن و خەوی بۆتان گێڕاوە بەمایەی پشوودان و ئیسراحەت، لەکاتێکا کەرۆژی بۆتان گێڕاوە بەمایەی رۆزی و ژیوار گەڕان بەدوایا .

زاتی باری (سبحانە وتعالی) هەر خۆیەتی باکانی ناردووەو دەنێرێ کەمزگێنی و بەشارەتێکی بەردەستی رەحمەت ومیهەربانێتی خۆیەتی ، کەبەم یاسایە جوان و قەشەنگە

ئاوی پاك و بێگەرد دائەبەزێنێ و دەبارێنێ لەئاسمانەوە ، ئابەم باران بارینەو ئاو دابەزاندنـە زەویانی بێخێرو بێر کەوەك و مـردوان وان ، زینـدویان دەکاتـەوەو پـڕخێرو بێریـان دەکـات سەرەڕای ئەمەش مایەی خواردنەوەو تینوێتی شکاندنە بۆ گشت گیانداران لەمانـەش مـەڕو مالاَت و خەڵك و مەردومانی زۆرو بێشومار . ئەم هەموو یاسایە لەبەڕێوەبردنی شەوو ڕۆژو باو هەوایەکان و باران بارین و ڕێك خستنی باری جوگرافیاو ئەم هەموو نیعمەتانە نیعمـەتی ئاو مەڕو مالاَت و .. هتد . خوای گەورە بەبەردەوام بەسەرمانا دەیان هێنێ و دەیان بـات ، بەدەستی میهرەبانێتی و قابزێتی خۆی بۆ ڕەوشەن کردنەوەی بیروهۆشـەکان بـۆ ئـەوەی بـبێ بەمایـەی دەرس و عیـبرەت و بیرکردنـەوە لەنیعمـەتانی زۆری بێـژمارەی ، هـەروەها بـبێ بەمایەی یاد کردنیان بۆ ئەو زاتەی خاوەن یاساو نیعمـەتی زۆرە ، هـەروەها بـبێ بەمایـەی خۆشەویستاتی و دۆستایەتی لەنێوانی خۆی و بەندەکانیو، هـەروەها بـبێ بەمایـەی گـومڕا نەبوونیان و رووکردنە بەرنامەی زێڕینی خودایی . بەلاَم لەگەڵ ئەم هەموو دیاردە رەوشـەن و ئاشکرایانە ، وەلەگەڵ ئەم نیعمەتانی زۆرو پڕ یاسایە قەشەنگانە خەوی قوڵ و گـران زۆربـەی زۆری لەباوەش گرت لەو خەڵك و مەردوومانە ، بەڵێ لـەجیاتی رووکردنـە خـوداو شـوکرانە کردنی زۆربەی زۆری خەڵك و مەردووم پـشتیان تـێ کـرد رووەو باوەشـی بێبـاوەڕی بـەرەو سپڵەیی و کوفر چوون .

تائێرە تەفسیری ئایەتانی (٤٥ — ٥٠)ی سورەتی الفرقان بوو .

خوای گەورە لەسورەتی (البقـرە)دا لەئایـەتی (٢٤٥) دا دەفـەرموێ : ﴿ مـن ذا الـذي يقرض الله قرضاً حسنا فيضاعفه له اضعافاً كثيرة والله يقبض ويبسط واليه ترجعون ﴾ لـەو ئایەتەشدا خوای گەورە دەرگایەکی تری میهرەبـانێتی خـۆی بۆمـان والاَ دەکاتـەوە ئـەویش بریتییە لەکردنەوەی باقێکی پڕ خێرو بەرەکەت بۆ خاوەن باوەڕان، جا ئەوەی بـەش و باریـك رەوانەی باقی خوای گەورەو میهرەبان بکات ئەوە وەکو ئەوە وایە بەش و بارێ بـاش بەقـەرز بدا بەخودای بەخشندە، ئەمەش بەیارمەتی دانی هەژارو نەدارو داماوان و کۆمەکی کردنیـان و ژیان و گوزەران بۆ خۆش کردنیان لەپێناو رێگـەی خـوای گـەورەدا ، خـوای گـەورە ئەمـە

بەقەرزو قۆڵە لەسەرە خۆی حیساب دەکا، بەچەندین قاد خوای گەورە بۆی قەرەبوو دەکاتەوە هەم لەدونیا کەلەبەرامبەر هەر خێرێکا بەپێی ڕێژەی خێرەکەی دڵ و دەروونی ئاسودەو بەختیار دەکات و گوناهانی لەسەر رەش دەکاتەوەو سەرەڕای پاداشتی بێ‌شوماری رۆژی قیامەتیشی ، چونکە خوای گەورە هەر خۆیەتی کلیلی خەزێنەکانی بەدەستەو هەر خۆیەتی دابەش کاری رۆزی و رزق و خێراتەکانە، هەر خۆشیەتی ئەگەر کەم کات وەیا زیاد کات قابزی بەروبومانە، واش مەزانن خێرکردنتان بەفیڕۆدانە ، سەرەنجام و دوارۆژتان گەروا نەکەن لەدەست دانە دەگەڕێندرێنەوەو دەبردێنەوە بۆلای زاتی میهرەبانە ، جا نەمزانی یاخود بریا یا نەمتوانی یاخود خۆزیا هیچیان بەهیچیان داد ناخوا .. بەڵێ خۆزیا وەیا بریا بەش و باری رەزیلان و قورچۆکانە بەش و باری حەق نەویست و خۆپەرستانە ..

## ٢١ ـ الباسط

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای دەست رۆیشتوو ، بنچینەی ئەم ناوه _بسط- واته بـڵاو کردنەوەو والآکردن .

الباسـط : واته خوای گەوره رزق و رۆزی دەبەخشیّ بەهەر کەسیّ بیـەویّ ، وەدەسـەڵات دەبەخشیّ بەئەو کەسەی کەخواست و حیکمەتی بخوازیّ ، وەکەسیّ ناتوانیّ خواست و ویستی خۆی تێکەڵی زیادی و کەمی بەخششەکانی خوابکات بەسەر بەندەکانیـەوه ، خـوای گـەوره بەپێی هەزاران حیکمەت و دانایی رزق و رۆزی و دەسـەڵات و زانـست و زانیـاری و مـاڵ و منداڵ و هەرشتێ تر بەئەندازه کەهەر خۆی دەیزانیّ دەیبەخشیّ بەو کەسەی ویست و خواستی لێبیّ ، یەکیّ لەو حیکمەتانە کەخۆی ئاشکرای کردووه وەك دەفـەرمویّ : ﴿ ولـو بـسط الله الرزق لعباده لبغوا في الارض ولكن ينزل بقدر مايشاء إنه بعباده خبير بـصير ﴾ شـوری / ٢٧

واته ئەگەر خوای گەوره زۆری رزق و رۆزی رەوانەی خـوارەوەی کردبـا ئـەوا زۆربـەزۆری بەندەکانی زیاده رەویان دەکرد لەسەر زەوی بەڵام بەئەندازەیـەکی دیـاری کـراوو بەویـست و خواستی خۆی رزق و رۆزی رەوانەی خوارەوه کردووەو دەیکـا ، ئـەو خوایـە خـۆی زۆر زانـاو بینـەره بەبەندەکانی .. الله اکـبر .. الله اکـبر .. لەبەخشـشی زۆری خـوایی ، کـەمی رزق و رۆزیشی هەر بەخشش و رەحمـەت و وبەزەیی‌یـە ، ئـەگینا نەفـسی ئـادەمیزاد کـاتیّ خـۆی بەدەوڵەمەند دیت توغیـان دەکاو ئارەزووی خەراپ کاری لیّ هەڵ دەقوڵیّ ، وەك خوای گـەوره دەفەرمویّ : ﴿ إن الانسان ليطغى أن رآه استغنى ﴾ العلق .

ئێمەش لەم کورته ژیانەی خۆمانا دیومانه کەچەندین کەسـانیّ لەبـەر مـاڵ و سـامانی زۆریان چاویان لەقاروونی هاوەڵیان کرد ، دونیاو قیامەتی خۆیانیـان کـرده ڕووڕەشـی قـوڕو چڕپاو ..

خوشك و برايان گومانى تيا نىيه ئەم شەڕو پێك دادانەى ئەم هەموو شـارو دەوڵـەت و شارۆچكانەى دونياو جيهان بەشى هەرە زۆرى هەرلەبەر ماڵ و سامانە هەر لەبەر كان و زێڕو زيوو هەر لەبۆ دەسەڵات و دەست رۆيشتن و دەوڵەمەندىيە، ئەم شـەڕو پێكدادانـەى جيهـان بۆتە ماڵكاولى چەندين خەڵكان و باسى هـەتيوو بێوەژنـانيش هـەر نـاكرێ ، ئابـەم پێـوەرە ئەگەر بىپێوين ، بۆمان دەردەكەوێ ئەگەر خواى گەورە موڵـك و سـامان و يـا سـەروەت و بەهرەو نيعمـەتانى زۆر بكردايـە لەسـەر زەوى ، ئـەوە بەنـدەكانى زيـاتر دەسـتيان دەنايـە قورقوڕاگەى يەكترو زياتر يەكتريان بەد بـەخت دەكـرد ، بـەڵام خـواى گـەورە رەحمـى زۆرەو بەئەندازەيەكى پڕ حيكمەت و دانـايى دانيـاوە چـونكە خـۆى لەهـەموو كەسێ شـارەزاترە بەخواست و ويست و نـەفس و ئـارەزووى ئادەميزادەكـان . خـواى گـەورە سـبحانه وتعـالى سەرگوزشتەى قارون مان بۆ دەگێڕێتەوە لەسـورەتى القـصص دا و دەفـەرموێ : ﴿ إن قـارون كان من قوم موسى فبغى عليهم ............. والعاقبة للمتقين ﴾ القصص / ٧٦ — ٨٣ .

واتە قارون پياوێ بوو لەگەل و قەومەكەى موسى (على نبينا وعليه الصلاة والسلام) ، بەڵام لەبەر دەوڵەمەندى و غورتى و بێ عەقڵى بەگەل و، دوژمنى گەل و قەومەكەى كەوت و ، دژى قەمەكەى خۆى وەستا ، خواى گەورە ماڵ و سەروەت و خەزێنانى زۆرى پێبەخشيبوو بەشێوەيەكى ئاوا لەبەر زۆرى ماڵ و سامانەكەى كليلى خەزێنەكانى بەكۆمەڵێ پياوى بـەهێز بەزەحمەتەوە هەڵدەگيرا ، وەگەل و قەومەكەى ئامۆژگاريان كردو پێيـان وت كـوڕە مـەغرور مەبەو كەيفت بەخۆت و ماڵەكەتەوە نەيێ نەيكەى بەمايـەى زيـادەڕەوىو لـوت بەرزيتـەوە بەڕاستى خواى گەورە ئەو كەسانەى خۆش نـاوێ كەشـانازى بـەخۆو بـەماڵ و سـامانەكەيان دەكەن، كوڕە پياوى چاك بە لەو بەش و بارەى خواى گەورە بۆ تاقيكردنەوەو امتحانت پێـى بەخشيوى قيامـەت و دوارۆژو بخوازەو لـەبيرت نەچـێت ، وەبـاى بـەش و بـارى دونياشـت فەرامۆش مەكەو پياوى چاك بەو چاكەخوازى بنوێنە وەكو خواى گەورە لەگەڵ تۆيـا چـاكەى كردووەو بەش و بارى باش و زۆرى پێ بەخشيوى، كوڕە پياوى چاك بـەو بـەدواى فەسـادى و

بەدکرداری مەکەوە لەسەر زەویدا، خواست و ئارەزووی کاری خراپ و ناهەموار مەکە، بەڕاستی خوای گەورە پیاوی تێکدەرو وێران کەرو موفسیدی خۆش ناوێ، پاش ئەو هەموو ئامۆژگاری جوانانە ووتی ئەو هەموو ماڵ و سەروەتەم بەزۆرزانی خۆمەوە چنگم کەوتووە من کابرایەکی زاناو خاوەن زانیاریم هەر بەو زانیاریەشەوە ئەو سەروەت و سامانەم کۆکردۆتەوە، جا خوای گەورە دەفەرموێ ئایا ئەوە نازانیت خوای گەورە چەندین کەسانی بەهیلاك داوەو لەپێش ئەواو لەسەدانی رابردوو کەزۆر لەوی بەهێزترو دەوڵەمەندتر بوینە، جا لەرۆژی قیامەت و مەحشەردا زاڵم و ستەمکارو موجریمەکان پێی ناوێ پرسیاریان لێبکرێ چونکە ئەوەندە ئاشکراو دیارە زوڵم و ستەمەکەیان هەر بەخۆیان بەپەلەکاری دان دەنێن و ئیعتراف دەکەن بەجەریمەو تاوانەکانیان .. جا قارون بەوپەڕی کەشخەو لوت بەرزی و رازاوەییەوە خۆی نواندو دەرکەوت و هاتە دەر بەناو قەوم و گەلەکەیا ، جا ئەوانەی دونیا پەرست و ویست بوون ووتیان ئای خۆزیانەکاو بریا ئێمەش هەندەی قارونی ماڵ و سەروەتمان هەبایەو پێدرابایە، بەڕاستی قارون خاوەن بەش و بارێکی زۆر گەورەو عەزیمە ، جا ئەوانەی خاوەن زانیاری و ئیمانداربوون ووتیان بەوان کەسانەی خۆزیاو بریایان بەجێگەی قارون دەخواست کوڕینە خۆتان بەخۆزیاو بریای بێ جێو بێسود بەهیلاك نەدەن و دەرونتانی پێ مەرزێننەوە، قوڕبەسەرینە ئەواب و پاداشتی خوایی و گەلێ باشترو چاکترە بۆ ئەو کەسەی ئیمانی هێناوەو چاکەخوازی کردارو رەفتاریەتی ، بەڵام تەنها خاوەن سەبرو سابیرەکان بەم بەش و بارە دەگەن، کەسانێ بێ سەبرو تەسك بین و دڵ بچوك پێی ناگەن ، جا خوای گەورە قارونی بەماڵ و سەروەتەوە نوغرۆ کرد لەزەویدا، کەسیش نەبو یا چ کۆمەڵ و دەستەیەکیش نەبوو فریای بکەوێ و رزگاری بکاو، لەو موصیبەتە سەری بخا، بێجگە لەخوای گەورە دیارە خوای گەورەش ئادەمیزادی ماڵ پەرست و فاسق رزگار ناکاو سەری نایەخێ ، بەڵێ قارون تێکەوت و ریسوا بوو سەرنەکەوت لەسەرکەوتوان نەبوو ، جا ئەوانەی دوێنێ خۆزگاو بریایان بوو بۆ جێگەو مەکانەتی قارون هۆشیان هاتەوە شوێن خۆیان و پەشیمان بوونەوەو، دەیان ووت ئای کەخوای گەورە گوشادی رزق و رۆزی دەبەخشێ بەکەسێ خواستی لێ بێ لەبەندەکانی وەیان

لەسەری کەم دەکاتەوە، وەئەگەر خوای گەورە رەحمی بەئێمە نەکردبایەو منەت و نیعمەتی نەخرابایەنە سەر ئێمەشی نوغرۆ دەکرد لەزەویدا چونکە ئێمەش نیەت و خۆزیامان بەلای ناهەمواری داکەوت بوو ، ئای خوایگەورە بێ بڕوایان و کافران سەرکەوتوو ناکات ، جا خوای گەورە دەفەرموێ بەهەشتانی پڕ نیعمەت و رازەمان گێڕاوەو دانـاوە لـەرۆژی دوایـیدا کەببێ بەماڵی هەتا هەتایی ئەو کەسانەی کەلووت بەرزی و تەکەبور ناکەن، وەداواشی ناکەن، هەروەها زوڵم و ستەم و وێرانکاری و فەسادیش یان نـاوێ و نایکەن ، وەسەرەنجام و سەرفرازی پیرۆزی بەرزی هەر بۆ خواپەرستان و خواناسانە .

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی عەنکەبووت دا لەئایەتی (٦٢) دا دەفەرموێ : ﴿ الله يبسط الرزق لمن يشاء من عباده ويقدر له ان الله بكل شئ عليم ﴾ خوای گەورە وەك و ئادەمیزادی خەلق کردووەو بەدیهێناوە بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە، ماهیەت و پلەو پایەی خۆی بەکارو کردەوەو بیروباوەڕی خۆی بسەلمێنێ ، جا کەم و زۆریەتی رۆزق و رۆزیش وەك و پرسیارێکەو یا لایەنە تاقیکردنەوەیەکە خوای گەورە ئادەمیزادی پێ تاقیدەکاتەوە، جا بۆ هەندێکان زۆریان پێ دەبەخشێ لەسەر هەندێکان کەمی دەکاتەوە، هەر خۆی سبحانه وتعالى بەهەموو شتێ زانایەو دەزانێ کێ بەچ تاقی بکاتەوە کێش بەچ تاقی نەکاتەوە، جا لەوانەیە ئادەمیزاد لەهەموو تەمەنیا چەند ماوەیێ خوای گەورە ماڵی پێ بەخشیبێ و چەند ماوەیەکیتر لەسەری کەم کردبێتەوە ، خوای گەورە تەنها هەر خۆی شایەستەی تەقسیمی رزق و رۆزییە چونکە هەر خۆی بەتەواوی لەماهیەت و نەفسیاتی ئادەمیزادەکان شارەزایەو دەیان ناسێ و عیلمی پێیان هەیە . هەروەها خوای گەورە لەسورەتی رۆم دا دەفەرموێ : ﴿ الله الذي يرسل الرياح فتثير سحابا فيبسطه في السماء كيف يشاء ويجعله كسفاً فترى الودق يخرج من خلاله فإذا أصاب به من يشاء من عباده إذا هم يستبشرون * وإن كانوا من قبل ان ينزل عليهم من قبله لمبلسين * فانظر الى اثار رحمت الله كيف يحيى الارض بعد موتها ان ذلك لمحيي الموتى وهو على كل شئ قدير ﴾ الروم / ٤٨ — ٥٠ .

زاتی خوای گەورە خۆیەتی بایەکان هەڵدەکاو دەنێرێ یاساو نیزامی بۆ داناون دەیکا بەمایەی کۆکردنەوەو هێنان و بردنی هەورەکان جا بڵاوەی پێدەکات لەئاسمانا بۆ ئەولاو ئەملا بەخواستی پڕحیکمەت و دانایی خۆی، دەیگێڕێ بەچین چین و تەبەق تەبەق هەور جا دەبینی لەنێوانیانا باران دەبارێنێ ، ئەم هەورو باران بارینە پارچە زەوی کێ بگرێتەوە پێ خۆشحاڵ دەبێ روو دەم و چاوی دەگەشێتەوە ، گەرچی پێش ئەوەی ئەو هەورو بارانە دابکەوێ بەسەر زەویدا بێ هیواو مەئیوس بوو ، جابڕوانەو سەیرەکە بەلای شوێنەواری رەحمەت و بەزەیی خوای گەورە، کەچۆن زەوی بێ خێرو بێرو مردوو دەی بوژێنێتەوە پاش ئەوەی وەکو مردوو بێ خێر وابوو، تا ئاوەهاش خوای گەورە مردووەکان زیندوو دەکاتەوە لەکاتێکا کەرۆژی زیندووبونەوەیان بێتە پێشەوە، بەراستی خوای گەورە هەر خۆی بەسەر هەموو شتێکا توانادارە ..

## ٢٢ - الحافظ

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای بەخشش فراوان ، بنچینەی ئەم ناوه - **حفظ** - ە واته نزمی و دابەزین و کەم کردن .

الحافظ : واته خوای گەوره پەروەردگارێکه بەخواستی خۆی ئەو کەسەی یا ئەو شتەی بیەوێ نزمی دەکاتەوه ، جا چ لەڕووی باری دارایی بێ یا هێزو دەسەڵات بێ یا هەرشتێ تر بێ ، وەنزم کردنەوەی هەر کەسێ یا هەر شتێ لەڕوی بەخششەکانی خوای گەورەوه بەستراوه بەحیکمەت و دانایی پەروەردگارەوه ، یەکێ لەمەخلوقەکان بۆی نەبوەو نابێ پەنجە بخاتە کارو فەرمانیەوه لەهیچ لایەن و ڕووێکەوه .. مێژوو ئەم راستیەی گرتۆته باوەش و پێمان نیشان دەدات کەخوای گەوره چەندین پاشاو زۆرداران و دەست ڕۆیشتوانی ، دابەزاندوەو سەرشۆڕی کردون، لەدونیادا خستونیه بەر نەفرەتی هۆشیارانی داهاتوو ، بێجگە لەئازارو ئەشکەنجەی ڕۆژی دواییش .. ئادەمیزادی هۆشیاری خواناس سەری کڕنووش دانەواندنەوه دائەنەوێنێ بۆ حیکمەت و دانایی ئەم میهرەبانە، وەدەزانێت خوای گەوره کاری نابەجێ ناکات ، چونکه خوای پاك و بێگەرد دووره لەهەر هەموو کەم و کوڕیێ و ناتەواویێ ..

سەرچاوەیەك کەجێگەی متمانەو باوەڕی بێ لەگێڕانەوەو باسی مێژوودا تەنها قورئانی پیرۆزه چونکه ووتەو کەلامی خودایەو دووره لەهەموو کەم و کوڕیێ، وەخوای گەوره بەڵێنی پاراستنی داوه وەك دەفەرموێ ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ الحجر : ٩ . وەکەسیش لەخوای گەوره راستگۆ تر نیە وەکو دەفەرموێ ﴿ .. وَمَنْ أَصْدَقُ مِنْ اللَّهِ قِيلاً ﴾ النساء : ١٢٢ . دیاره مێژووش بەئاشکرا روون دەکاتەوەو بۆمان سەلماندویەتی کەهەڵسوکەوت و سونەتی خوای گەوره چۆن بووەو چۆنه لەگەڵ بەدیهێنراوەکانی بەتایبەتی ئادەمیزاد .

ئەم راستیەمان لەبیر نەچێت مێژوویێ بەدەستی ئادەمیزاد نوسرابێتەوه هەرگیز جێگەی متمانە نیە چونکه ئادەمیزاد کەم و کوڕی لەزۆر لایەوه هەیە ، ئەگەر سەیری

رووداوێ بکەین لەزەمان و شوێنێ کەخۆمانی تیاین ، هەر ئەم رووداوەمـان بەبیـست و جۆر یان زیاتریش بۆمان دەیگێڕنەوە ، هەرکەسەی خواست و مـەیلی خـۆی تیـا دەخـاو تابۆی بکرێ وای دەگێڕێتەوە خۆیان و هـاوبیرانی پێـشادومان بکـات ، هەرچـۆنێ بـێ لەهەڵەو غەڵەت خاڵی نیـیە، بگرە زۆرجار وایە هیچی بەسەر راستەوە نیـیە ، خۆ مێژوو نوسانیش هەر ئادەمیزادن هەر ئـەوەیان نوسـیوە کەبیـستویانە ، بۆیـە ئەگـەر سـەیری پەڕاوەکانی مێژوو بکـەین دەبیـنین بـەجۆراو جـۆری زۆر جیـاواز کۆکراونەتـەوە دەیـارە خواست و ویـست و مـەیل و بیروبـاوەڕو هەسـت و نەسـتی مێژوونوسـەکە دەورێکـی سەرەکی دیوە لەمێژوو نوسینەکەدا .

خوای گەورە پاکەو هیچ کاریگەرێکی بەسەرەوە نیەو نابێ وەخۆی حەقەو چـاوی بینای لەهەموو شتێکەو گوێی بیستنی لەهـەمو دەنگێکـە و زانیـاری لەئەزەلـەوە تـا ئەبەد لەلایەو لەهیچ رویەکەوە کەم و کوڕی نیە، وەزۆر لەوانەو بەسـەرهاتی مێژووشـی لەکیتابە پیرۆزەکەی بۆمان تۆمار کـردووە کەمایـەی هیدایـەت و رێنمونـەیین رەحمـەت ویەزەیین ، وەمایەی روون کردنەوەی جۆرەها زانیارین لەگەڵ ئەوەش پڕن لەپەندو عیبرەت و ئامۆژگاری ، هەروەها چۆنیەتی هەڵس و کەوت و کاری خودایی‌و سـونەنەکەی بۆمـان روون دەکاتەوە ..

خوای گەورە بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزادێتی‌یەوە سونەنی وابـووە هـەر گـەل و قەومێ پشتیان کردبێتە خواناسین و پشتیان کردبێتە بەرنامەکەی ئـەو، ئـیللا ریـسوای کردوون و سوکی کردوون و نزمی کردوون و لەپلەو پایەی دابـەزاندوون و، لەرزق و رۆزی لێ کەم کردونەوەو وەیا لێی براندون لەزانیاری علوما بێ بەهرەی کردوون، لەرەحمـەت و بەرەکەتا بێبەشی کردوون ، هەروەها لەهەموو روو لایەنەکانی ژیانەوە تێی شکاندون و کەوتونەتە ناو هەزارەها کەم و کوڕی و، هەزاران گیروگرفـت سـەرو گێلاکـی گرتـوون .. ئەوەتە خوای گەورە سبحانە وتعالی باسی گەلەکەی حەزرەتی نوح مان بۆ دەگێڕێتـەوە ، کەچۆن بوو چارەنووس و سەرەنجامیان لەئەنجامی یاخی بـون و کەللـەرەقی و دڵ رەشـیان

وەکو دەفەرموێ ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلاَّ خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمْ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾ العنكبوت : ١٥ . واتە حەزرەتی نوحمان رەوانەی قەومەکەی کرد (٩٥٠) ساڵ تیایاندا مایەوەو هەوڵی شەوو رۆژی لەگەڵدان بۆ گێرانەوەی سەر رێگەی راستیو دروستی بەڵام بێهودە بوو سەرەنجام گشتیان بەتۆفان کەوتن و غەرق بوون چونکە بەراستی ستەمکاربوون خواو پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستبۆوە، وەخوای گەورە تەنها حەزرەتی نوح و خاوەن باوەڕەکانی رزگار کرد .

هەروەها گەلی سەموود و عادو قەومی لوط زۆر لەگەلانی تر کەخوای گەورە لەپلەو پایەی دایبەزاندون بەرقارو غەزەبی خۆی خستوون لەبەر لاری و لەوێریان وەك دەفەرموێ : ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَى بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴾ الاسراء: ١٧ .

واتە چەندین گەل و نەتەوەمان بەهیلاك دا لەسەدانی رابردوو لەپاش لەناوبردنی گەل و قەومی نوحەوە لەبەر خراپی و عیصیانیان ، جا کافییە کە پەروەردگارت ئاگادارەو شارەزاو خەبیرە بەگوناه و تاوانی بەندەکانیەوە، چاوی هەردەم لەکارو کردەوەی بەندەکانیەتی دەزانێ ئاخۆ شایەستەی رەحمەتن یاخود شایەستەی قاڕو غەزەب و هەلاکن

جا لەبارەی چۆنیەتی لەناو بردنیشیانەوە دەفەرموێ ﴿ فَكُلاًّ أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُمْ مَنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُمْ مَنْ خَسَفْنَا بِهِ الأَرْضَ وَمِنْهُمْ مَنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ العنكبوت : ٤٠ .

واتە لەو گەلانەی کەبەهیلاکمان داون هەریەکەیان بەهۆی گوناح و تاوان و عیصیانی خۆیەوە، کەوتنە بەر قارو غەزەبمانەوە ، جالەوان ئەوەی بەردە بارانمان کردن بەهۆی بایێکی بەهێزو توندەوە، وەلەوان ئەوەی بەهۆی دەنگێکی گەورەوە وەلەوانەی کەزەویمان لەژێر پێیاندا روچواند، وەلەوانەی کەلەناو ئاوا غەرقمان کردن ، وەخوای گەورە زوڵمی وەیان ستەمی لێنەکردوون بەهیچ شێوەیێ، بەڵکو ئەوان گشتیان زوڵم و

ستەمیان لەنەفس و گیانی خۆیان کرد . بەڵێ بەڕاستی گوناه و عیصیان و حەرام دەبێتە مایەی قارو غەزەبی خوای گەورەو، دەبێتـە مایـەی دابـەزینی پلـەو پایـەی ئـادەمیزاد لەهەردوو دونیادا واتە لـەدونیاو قیامەتـدا ، جابـا حـەزرەتی ئادەمـان لـەیاد نەچـێ ، کەخوای گەورە بەمیهرەبانێتی خۆی لەقوڕا دروستی کردوو لەرۆحی خۆیان فووی پیاکردو ڕێزو بەهرەیەکی باشی لێنا پلەو پایەی بەرزکردەوەو فێـرە هۆشـیاری و زانیـاری کـرد، وەزۆری خۆش دەویست و تەنانەت فەرمانیدا بەفریشتەو مەلائیکەتەکان سوجدەی ڕێزی بۆ بەرن، هەر لەبەر ئەوا بوو شەیتان کەوتە بـەر نـەفرەت و لەعنـەتا ، لەگـەڵ ئەوەشـا خوای گەورە لێی رازی نەبوو بەوەی کەبێ ئەمریەکەی خوای گەورە بکات ، بەڵکو لـەو کاتەی کەبێ ئەمریەکەی خوای گەورەی کرد و حەرامی خـوارد بـوو بەمایـەی شـوێن و جێگەی نەبێتەوە لەجیرانێتی خوای گەورەدا، وەلەبەهەشتی پڕنـازو نیعمەتـدا، هـەروەها بوو بەمایەی لەدەست چوونی پلـەو پایـەی بەهەشـتی وەداکـەوتنی بـۆ سـەر زەوی پـڕ ماندووبوون و سەخڵەتیدا، سەرەنجام پاش چەندین گریان و قوڕ پێوانی پەشیمان بوونەوەی ئەوسا خوای گەورە عەفوی کردو لێی بوری بەڵام پاش چی؟! پاش ئەوەی تازە نایەیتەوە بەهەشت تاکو لەدونیا خـۆت تـەواو پـاك نەکەیتـەوە، پاشـی ئـەوەی هـەموو پـشت و نەوەکانی خۆی تووشی دەردو بەڵای ژیانی دونیا کـرد کەزۆربـەی زۆریـان بـەو راسـتیەو پاکیە شادومان نابن و ئەنجامیان ئاگری دۆزەخی هەتا هەتایی دەبـێ ، بـەڵێ ئەوەیـە باری گوناه و تاوان و حەرام ، سەیر ئەوەیـە زۆ لەنـەوەکانی حـەزرەتی ئـادەم بەتـەمای گەڕانەوەن بۆ بەهەشت و شوێنی دێرینی باپیرە گەورەیان کەچی بەتەن وەبەفەردە گوناه و تاوانیان لەپشت خۆیانا بار کردووە لەبیریان چۆتەوە کـەباپیرەیان هـەزار هەنـدی وان لای خوای گەورە خۆشەویست بووەو کەچی لەبەر یەك بێ ئەمری بەڵێ لەبەر یەك جار حـەرام خواردن و گوناه شـوێنی لەبەهەشـت نـەبووەوە کەچـی ئـەوان دەیانـەوێ بەچـەند تـەن گوناهەوە بچنە بەهەشتەوە، دەیانەوێ خۆیان هەڵبخەڵەتێنن و کەچی بەتەمای گەڕانەوەو تەوبەی باش نین وەیا هەوڵی جدی نادەن بۆ خۆ پاك کردنەوەیان ..

هەروەها شەیتان لەبەر یەك جار دەرچوونی لەئـەمری خـوا وەسـوربونی لەسـەر بێئەمری کەوتە بەرنەفرەت و لەعنەتی هەتا هەتایی خـواو فریـشتەکانی و خواناسـان ، کەشەیتانیش جنەو لەیەك تای تـەرازوودان لەگـەڵ ئـادەمیزاد کـەخوای گـەورە خـەڵقی کردوون و بەدیهێناون بۆ بەندایەتی خۆی ، ئەی ئادەمیزادی لەخوا بـێ ئاگـاو هـەڵگری بارانی گوناه و تاوانان ، دڵـت بەچـی خۆشـە ئایـا نازانیـت حـەرام یـانی دەردو بـەڵاو موصیبەت و فیتنە و دزر و خیانەت سپڵەیی پیسی بێ وەفایی بەدبەختی چارەڕەشـی و خەجاڵەت بوون ڕوو ڕەش بوون ئاگر، بـەڵێ ئـاگر ، ئایـا چـیت لەحـەراما دەوێ ئەگـەر بەگەزۆو حەڵوای تێکەیشتووی ئەوە هەلە حاڵی بویت ، با من حاڵیت بکـەم کەحـەرام و گوناه کار لەتەمەنت دەکاو بێ بەرەکەتی دەکات هەروەها کار لـەرزق و ڕۆزیـت دەکـاو پیت و فەڕی تیا نەهێڵێ ، کار لەعەقڵ و ژیریت دەکا ئاسۆی دەوەستێنێ و بەندی دەکا، کار لەزانیاری و عیلمت دەکات بێ خێرو مایە پووچ دەیهێڵێتەوە ، کار لەرەنگ و رووت دەکات قەبیح و ناشیرینی دەکات مانای نوورو هیدایەتی لێ دەسڕێتەوە، کار لەسروشـت و فیترەتت دەکات تووشی دەیان نەخۆشی دەروونیت دەکات، کـار لەپلـەو پایـەو ڕێـزت دەکات هیچت بۆ نایەڵێتەوە ، بەڵێ کار لەهەموو لایەنەکانی ژیانـت دەکـات لەلایـەنی بەدەنیو لاشەیی لەلایەنی روحـی و مەعنـەوی ، بەڕاسـتی زیانـەکانی حـەرام و گونـاه ناژمێردرێن ، هەوەرها الحافظ واتە خوای گەورە ڕێك خەری بـاری ژیـانی ئـادەمیزادە ، رزق و ڕۆزیان لەسەر کەم دەکاتەوەو دادەبەزێنێ بەگوێرەی حیکمەت و دانایی خـۆی، یـا پلەی گەرماو سەرما دادەبەزێنێ و ڕێکی دێخی بەگوێرەی دانایی و حیکمـەتی خـۆی ، هەروەها هەموو لایەن و بارەکانی ژیان هاوسەنگ دەکاو بەهرەو نیعمـەتی خـۆی تـەواو دەکا بۆ وانەی کەشایەستەن وەیا لێیان دەسێنێتەوە ئەگەر ئەهل نەبن و لێیان نەبێ .

## ٢٢ - الــرافــع

ناوێکە لەناوە جوانە دڵخۆشکەرەکانی خوای پــەروەردگار، بنــچینەی ئــەم نــاوە (رفع)ە واتە بەرزی و بڵندی ..

الرافع : واتە خوای میهرەبان بەرزکەرەوەی نزمەکانەو راگیری بەرزەکانــە، وەیــان بەمانایەکیتر بەرزکردنەوەی بونەوەرە لەنەبوونەوە بۆ بوون ، جا ئەم بەرزکردنــەوە جــۆراو جۆرە بەپێی جۆری بونەوەر، بۆ نمونە : خوای گەورە خۆرو ئەستێرەکانی بەرزکردۆتــەوە ، وەیان بەرزکردنەوەی بێ دەسەڵاتان بۆ پلەو پایەی دونیــای وەیــا بــۆ پلــەو پایــەی رۆژی دوایی ، کەزانایی و دانایی خۆی تێیدا فەرمان رەوانەیە .. جــا خــوای گــەورە لــەبارەی بەرزکردنەوەی هەندێ ئادەمیزاد بەسەر هەندێکیترا دەفەرموێ : ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُــمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾ الانعــام : ١٦٥ .

واتە : ئەو خوایەیە ئێــوەی گێــراوە بــەجێ نــشینی ســەرزەوی، وە هەنــدێکیانی بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکتر بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەو بەخششانەی کەپێی داون ، هەروەها دەفەرموێ : ﴿ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا .. ﴾ الرعد : ٢.

واتە زاتی خوایە ئاسمانەکانی بەرزکردۆتەوە بەبێ کۆڵەکە، یا بلــێین (ئەســتوندە) کەئەیان بینن .

وەلەبارەی کارو فەرمانی باشــا دەفــەرموێ : ﴿.. إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِــمُ الطَّيِّـــبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ .. ﴾ فاطر : ١٠ .

واتە : بۆلای خوا سەردەکەوێ ووتاری پاك و کردەوەی باش یــا بەمانایــەکی تــر جێگەی رازی بونی خوایە پاکێتیو دڵسۆزی لەکارو کردارو ووتاردا .

خوای گەورە (سبحانە وتعالی) وەکو لەهەموو شتێکا وەیــا مــەخلوقێکا زیــادە رێزو فەزڵی داوە بەهەندێکیانا لەسەر هەندێکیانا، وەهەندێکی بەرزکردونەتــەوە بەســەر هەندێکی تریانا، وەلەئادەمیزادا هەر بەم شــێوەیە وەلــەرۆژی دوایــشدا هــەمان ســونەن

لەئارادا دەبێ ، خوای گەورە هەر خۆی ماهیەت و فەزڵ و پلەو پایەی هەر مەخلوق و بوێ دەزانێ و، دەزانێ کێ شایەستەی چیەو کێش شایەستەی چیەنیە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَلَلآخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَاتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلاً ﴾ .. الاسراء ، واتە سەیرکەو بڕوانە چۆن هەندێکمان زیادە ڕێزو فەزڵ و بەخشش و بەهرە پێداوە بەسەر هەندێکیترا وەلەرۆژی دواییشدا هەمان سونەن لەئارادا دەبێ گەورەترین و بەهرەمەندترین پلەو پایەو فضل شایەستەی هەندێکیان دەبێ بەسەر هەندێکیتردا .

خوای گەورە (سبحانە وتعالی) لەسورەتی واقعەدا سەرجەمی ئادەمیزادەکانی کردوون بەسێ دەستە، وەتێیدا روون دەکاتەوە کەوا ژیانی ئەم دونیایە مایەی ئیمتحان و تاقیکردنەوەیە وەلەرۆژی دواییدا هەر کەس بەبەش و باری خۆی دەگات بەپێی بیروباوەڕو کارو کردەوەی ، وەك کەدەفەرموێ : ﴿إِذَا وَقَعَتْ الْوَاقِعَةُ(١)لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ(٢)خَافِضَةٌ رَافِعَةٌ(٣)إِذَا رُجَّتْ الأَرْضُ رَجًّا(٤)وَبُسَّتْ الْجِبَالُ بَسًّا(٥)فَكَانَتْ هَبَاءً مُنْبَثًّا(٦)وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلاثَةً ﴾ واتە کاتێ کەرۆژی قیامەت هاتنە رۆژی بەرپابونی و واقیعی خۆی ، هاتە پێشەوەی ئەم رۆژەو واقع بوونی ئەندێشەو خەیاڵ و پڕوپاگەندەو درۆنیە، بەڵکو حەقیقەت و داهاتوویەکی راست و رەوانەو وادەو بەڵێنی خوای میهرەبانە ، جا لەم رۆژەدا هەندێك تێشکاو داماوو زەبوون دەبن وەهەندێکی تر روو سوورو بەرزو شکۆمەند دەبن ، جا سەرەتای دەست پێکردنی ئەم دوا رۆژو قیامەتە بەتەواوبونی تەمەنی ئەم کەون و بونەوەرە دەست پێدەکات، لەو کاتەدا زەوی دێتە هەژان و تەکان و لەرزین بەشێوەیەکی زۆر بەهێزو توند وەچیاکان شیدەبنەوەو دەبن بەتۆزو سەراب و غوباری پەرتو بڵاو ، مەیدانی مەحشەرو قیامەت دێتە ئاراوەو خەڵکان و مەردووم دەبن بەسێ پۆل و چین ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ(٨)وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ(٩)وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ ﴾ هاوەڵانی دەستەڕاست کەکیتابی ئەعمال و کارو کردەوەیان بەدەستە ڕاست پێدەدرێتەوە، وەهاوەڵانی دەستە چەپ کەکیتابی ئەعمال و کارو کردەوەیان بەدەستە

چەپ پێ دەدرێتەوە، وەهاوەڵانی پێشبڕکێ کار لەئیمان و تاعەت و چاکەو خێرو خێـرات ، پێشبڕکێ کاریان دەبێ بۆ چونە بەهەشتیان و شوێن و مەئوای بەرزو باڵایان ، جا خوای گەورە باس و خواس و ئەنجامی هەریەك لەم سێیانە مان بۆ دەکات و لەبارەی پێـشبڕکێ کاران دەفـەرموێ : ﴿ أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ(١١)فِـي جَنَّـاتِ النَّعِـيمِ(١٢)ثُلَّـةٌ مِـنْ الأَوَّلِينَ(١٣) وَقَلِيلٌ مِنْ الآخِرِينَ ﴾ ئەو پێشبڕکێ کارانە زۆر نزیکی لای خودان و پلـەو پایەیان گەلێ بەرزەو دەچنە ناو بەهەشتانی پڕ نیعمەتی جۆراو جۆری بێ وێنەو ، خـەڵك و مەردومانێکی زۆر هـەر لـەزەمانی حـەزرەتی ئادەمـەوە تـاکو زەمـانی پێغەمبـەری خۆشەویـستمان (ﷺ) وەخـەڵك و مـەردومانێکی کـەم هـەر زەمـانی پێغەمبـەری خۆشەویستمانەوە تا کۆتایی هاتنی تەمەنی ئـەم کـەون و بونـەوەرە ، هـەروەها خـوای گەورە هەر لەبارەیانـەوە دەفـەرموێ ﴿ عَلَى سُـرُرٍ مَوْضُـونَةٍ(١٥)مُتَّكِـئِينَ عَلَيْهَـا مُتَقَابِلِينَ(١٦)يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ(١٧)بِأَكْوَابٍ وَأَبَـارِيقَ وَكَـأْسٍ مِـنْ مَعِينٍ(١٨)لاَ يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلاَ يُنـزِفُونَ(١٩)وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ(٢٠)وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ(٢١)وَحُورٌ عِينٌ(٢٢)كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ(٢٣)جَزَاءً بِمَـا كَـانُوا يَعْمَلُونَ(٢٤)لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلاَ تَأْثِيمًا(٢٥)إِلاَّ قِيلاً سَلاَمًا سَلاَمًا ﴾

ئـەو پێـشبڕکێکارانە لـەناو بەهەشـتا لەسـەر قەڵـەوێران و کورسـیاتی بـەهاو بەقیمەت دانیشتوون لەبەرامبەر یەکەوە لەگەڵ دۆستان و ئەحبابانیانەوە ، بەسـەریانەوە دەخولێنەوە غلمان و تازە لاوان بۆ خزمەت کردنیان، بەدۆلکـەو کاسـەو پـەرداخانی پـڕ شەرابی خۆشی جۆراو جۆر ، کەئـەم شـەرابانە مایـەی لـەززەت و خۆشـێ سـەریان پـێ نایەشێ و پێشیەوە سەرخۆش نـابن، وەجۆرەهـا فاکیهـەو میوەجـات لـەوەی ئـارەزووی لێدەکەن وەگۆشتی تەیرو باڵندەی بەلەززەت و خۆش کەشوێن تامەزرۆیان بۆ پڕدەکاتەوە ، وەحۆری و پەریانی جوان و چاو گەورە کەوەکو لوء لوء داپۆشـراون ، ئەمـە پاداشـتی پێشبڕکێ کارانە لەچاکەکاریەو تاعەت و خواپەرستیدا ، وەلەناو ئەو بەهەشـتەدا قـسەو قسەرۆك و لەغوەو تاوان و جنێو ووتاری بێسوودیان گوێ لێ نابێ ، بەڵکو هـەر پێیـان دەوترێ سڵاوی خواتان لێبێ ئەم بەهەشت و بەهرەتان پیرۆزبێ ..

هەروەها خوای گەورە (سبحانە وتعالى) کەچینی دووەمی شادەمیزادانی ناو بردوون بەئەصحاب و یەمین کەلەبارەیانەوە دەفەرموێ : ﴿ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ(٢٧)فِي سِدْرٍ مَخْضُودٍ(٢٨)وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ(٢٩)وَظِلٍّ مَمْدُودٍ(٣٠)وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ(٣١)وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ(٣٢)لاَ مَقْطُوعَةٍ وَلاَ مَمْنُوعَةٍ(٣٣)وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ(٣٤)إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً(٣٥)فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا(٣٦)عُرُبًا أَتْرَابًا(٣٧)لأَصْحَابِ الْيَمِينِ(٣٨)ثُلَّةٌ مِنْ الأَوَّلِينَ(٣٩)وَثُلَّةٌ مِنْ الآخِرِينَ ﴾ واتە ئەوانەی هاوەڵانی دەستەڕاستن چۆن هاوەڵانێکن، ئەوانەن کەخوای گەورە دەیان خاتە بەهەشتەوە ، لەناو سیدرو مورتکی نەرم و نیان و بێ درك و داڵ و وەلەناو مۆزی چرپڕی بەسەریەکا داکەوتوودا دەبن، وەلەژێر سێبەری فێنك و درێژدا کەلەژێریانا شاوی سازگار لەبەر ڕۆیشتووە وەفاکیهەو میوەجاتی زۆری نەبڕاوەو، تێك نەچوو قەدەغە نەکراو لەخزمەت یانایە، وەفەرش و رایەخی بەرزکراوە کەبەرزن لەنرخ و قیمەتا لەم جێگە خۆشەو لەسەر ئەم رایەخە بەرزو نەرمانە لەگەڵ ئەو حۆرییە جوانە دەست بۆنەبراوانەدا رادەبوێرن ، خوای گەورە دەفەرموێ ئێمە ئەو حۆریانەمان دروست کردووە بەدروست کردنێکی تایبەتی و سەربەخۆ ، وەکردوومانن بەهاوتەمەن ، ئەم جۆرە نیعمەتانەو هاو وێنەیان بۆ هاوەڵانی دەستە ڕاستەو کۆمەڵێکی زۆر لەزەمانی حەزرەتی ئادەم هەتا خاتەم (علیهم الصلاة والسلام) وەکۆمەڵێکی زۆریش لەخاتەمەوە (ﷺ) تاکو هاتنی کۆتایی ئەم کەون و بونەوەرە .

هەروەها خوای گەورە لەبارەی چینی سێهەمیشەوە کەناوی بردوون بە اصحاب الشمال دەفەرموێ : ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ(٤١)فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ(٤٢) وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ(٤٣)لاَ بَارِدٍ وَلاَ كَرِيمٍ(٤٤)إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ(٤٥)وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ(٤٦)وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ(٤٧)أَوْ آبَاؤُنَا الأَوَّلُونَ(٤٨)قُلْ إِنَّ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ(٤٩)لَمَجْمُوعُونَ إِلَى مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ(٥٠)ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ(٥١)لآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ(٥٢)فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ(٥٣) فَشَارِبُونَ

عَلَيْهِ مِنْ الْحَمِيمِ(٥٤)فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ(٥٥)هَذَا نُزُلُهُمْ يَـوْمَ الـدِّينِ ﴾ واتـە ئەوانەی کەخاوەن شووم و نەگبەتین و نامەی کردەوەیشیان لەلای دەسـتی چـەپەیەوە بـۆ دێـت و بەدەسـتی چـەپ وەری دەگـرن .. نـازانن چـەنێ بەدبـەختن ! ئەوانـە وان لـەناو گەرمابیەکی ژاراوی وادا کەگەرماکەی کار لەبنی مـووی لەشـی ئـادەمیزاد دەکـا ، وە ئەوانە لەناو ئاوێکی زۆر گەرمی سەخت وان، لەناو سێبەرێکدا کەلەدوو کـەڵێکی گـەرم پەیدا دەبێ ، ئەو سێبەرە ئەسارده وەکـو سـێبەرەکانی دیکـەو ئەقازانجێکیـشی هەیـەو ئەشوێنەکەی شیاوو شایەستەی رێزە ، ئەمەش لەبەرئەوەیە ئـەو ئادەمیزادانـە لـەدنیادا لەکاتی ژیانا خاوەن نیعمەت و خاوەن رابواردن بوون و لەوانەبوون کەبەردەوام بوون لەسەر ئەو تاوانە بێ وێنە گـەورە کـەکوفرو پـشت کردنـە لەبەرنامـەی خـودا ، لەهەڵوێـستی ناحاڵیدابوون و دەیان ووت ئایا ئێمە کاتێ مردین و بووین بەخۆڵ و گڵ و ئێسکی رزیـو .. ئایا تازە ئێمە زیندوو دەکرێینەوە ؟! لەگەڵ باوك و باپیرە پێشووەکانیشمانا ؟ تۆ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست بفەرموو ، نەك تەنها ئێوەو بـاوك و باپیرەکانتـان بـەڵکو هـەر چەن گیانلەبەرو هەرچی ئادەمیزادو پەری بوون لەمەوبـەرو لەمـەولاش هـەموو لـەکاتی رۆژێکی دیاریدا کۆ دەکرێنەوە ، جا پاش ئەو کۆکردنەوەو گردبوونەوە ئەی گومراهەکان و ئەی باوەڕ نـەکردوەکان بـەئاپین و بەرنامـەی خـودا لـەداری زەقـووم دەخـۆن ، واتـە لەبەرەکەی دەخۆن سکی خۆتانی لێ پـڕ دەکـەن ، ئـەوجا ئـاوی گـەرمی زۆری بەسـەرا دەخۆنەوە ، وای دەخۆنەوە لەوێنەی خواردنـەوەی وشـترێ کـەدەردی (هیـام)ی گـرتبێ ، بەهیچ ئاوێ تینوێتی نەشکێو، ئەم خواردەمەنیو خواردنەوەیان بۆ ئامادە کراوە لەرۆژی پاداش و قیامەتدا .

هیچ حەول و گۆڕان و قوەتێ نیەو نابێ تەنها لەخوایەوە نەبێ، وەهـیچ بـەرزیو نزمیێ لەئارادا نابێ مەگەر لەخوای گەورەوە نەبێ .. ئادەمیزاد لەسەرێتی ئـەم سـیفەتە لەخۆی بێنێتـە جێـو هـەوڵ و تەقـەلای ئـەوەبێ خـۆی و کەسـانی ئـادەمیزادی تـری بەرزبکاتەوە بەتەقواو خواناسین ، چونکە بەرزی ئادەمیزاد لەدڵسۆزێتی بەندایەتی خـوای گەورەدایە ، ئیمانی راست و دروست و بەجێ، هەرگیز لەخاوەنەکەی رازی نابێ کـەرازی

بێ بەزەلیلی و سەرشۆڕی و ملکەچی و داماوی‌و زەبونی .. هەروەها خوای گەورە لەقولایی مێژووەوە بەسەرهاتی کەسێکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنْ الْغَاوِينَ(١٧٥) وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَاقْصُصْ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الاعراف : ١٧٥ -١٧٦ .

واتە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بۆیان بخوێنەوە هەواڵی ئەو کەسەی بەهرەو زانیاری ئایاتانی خۆمان پێدابوو ، بەڵام ئەو خۆی لێ داکەلاندو پشت گوێی خست، بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی کەوتوو بوە پێشڕەو پێشەوایی شەیتانەکان سەرەنجام گومڕاو وێڵ بوو لەگەڵ گومڕاو وێڵان ، چەقی لەقولایی نەزانین و نەفامیدا، جا خوای گەورە دەفەرموێ ئەگەر خواستمان لێبایە بەرزمان دەکردەوە بەڵام شایەستە نەبوو چونکە خۆی داگرت بەلای مادديات و زەوییەوە بەخواست و ئارەزووی خۆی بەدوای هەواو هەوەسی خۆی کەوت و لەوەی شەیتان بۆ رازاندبۆوەو بۆی جوان کردبوو ، جاوێنەی ئەو لەبێ رێزی و هیلاکی وەکو وێنەی سەگە ، ئەگەر بۆی بچیت و تەنگاوی بکەیت هەر ناڕەحەتە، هەناسە بەو پەڕی توندی و هێزەوە دەدات وەزمان دەردێنێ بەوپەڕی هیلاکی و تێنوێتییەوە، وەئەگەر وازیشی لێ بێنی هەر لەهەمان حاڵیدایە ، ئا ئەمە وێنەی ئەو گەل و قەومەیە کەئایات و بەرنامەی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە .. بۆیان بگێڕەوە ئەو بەسەرهاتانە ،بەڵکو رەجایان وابێ بۆ خۆیان بیربکەنەوە..

لەکۆتاییدا روو لەخوای گەورەو میهرەبان دەکەین کەگەل و قەومەکەمان بەرز بکاتەوە لەدونیاو قیامەتدا ، بەفەزڵ و کەرەمی خۆی رەحمەت و هیدایەت برژێنێ بەسەرمانا ..

## ٢٤ - المُعِزّ

ناوێکه لەناوه جوانه پیرۆزەکانی خوای بەرزو بڵند ، بنچینەی ئەم ناوە (عزّ)ە یە واتە شێوەیەکە کەنایەڵێ بونەوەرەکانی بەتایبەتی نادەمیزاد - شەکەست بخوا - ئەم ناوە (١٠) جار لەقورئانا هاتوە تەنها (٥) جار مەبەست سیفەتی خوای ئازیزە ..

المعز : واتە خوای پەروەردگار عیززەت بەخشە وەهێز بەدیهێنەرە بۆ هەر کەسی و هەر شتێ بیەوێ ، خوای ئازیز دەفەرموێ : ﴿ .. أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ فاطر : ١٠ . واتە ئایا ئەمانە عیززەت و سەربڵندییان دەوێ ، خۆ عیززەت و سەربڵندی گشتی بۆ خوای میهرەبانە .. جا خوای گەورە بەپێی حیکمەت و دانایی‌یەکەی عیززەت و سەربڵندی دەبەخشێ بۆ ئەو کەسەی کەشایانی بێ جا لەدونیابێ یا لەرۆژی دوایی بێ ، وەعیززەت و شکۆمەندی خوای گەورە شایانی پێغەمبەران و شوێن کەوتوانی کردووە ، وەك دەفەرموێ : ﴿.. وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ المنافقون : ٨ . واتە : هەرچی عیززەت هەیە بۆ خوایەو بۆ پێغەمبەرەکەیەتی و بۆ ئیماندارانە بەڵام دووڕوان و مونافیقان نایزانن و تێی ناگەن ، وەلەو بارەی عیززەتەوە خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی دەفەرموێ : ﴿ قُلْ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ال عمران : ٢٦ .

واتە ئەی نێراوی خوا بڵێ خوای گەورە خاوەنی مولکە ، مولك و سامان ئەدا بەکەسێ بیەوێ ، یا لێی دائەڕنێ ، وەئازیزی و سەر بڵندی و عیززەت دەبەخشێ بەو کەسەی کەبیەوێ ، وەریسوایی و زەلیلی دەبەخشێ بەو کەسەی کەبیەوێ .. وەخێر بەدەستی تۆیە ئەی پەروەردگار بەڕاستی تۆ لەسەر هەموو شتێ توانادارى .. وەخوای گەورە خۆی بەپەروەردگاری عیززەت ناوبردووە وەك دەفەرموێ : ﴿ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ صافات : ١٨٠ . وەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : } کل عز لیس

لله فهو ذل { واته هەر عیززەت و سەربڵندیەك بەخواوە نەبێ ئەمە ریسوایی و زەلیلیە ، وەعیززەتی پەروەردگار وەك رۆژی روناك بەسەر بونەوەرانەوە بەدی دەکرێ، مێژووش شایەدی عیززەت و گەورەیی خوایە کەبەدرێژایی رۆژگار هەڵگرانی بیروباوەڕی خوا بەیەك ناسین سەرکەوتوون و بەعیززەت بوون بەسەر بێ باوەڕەکانا .

گەر سەیری بەندەیەکی خوای گەورە بکەین ، لەهەیبەت و رەنگ و روخسارو کرداریدا ، عیززەت خۆی شاردۆتەوە، ئەم عیززەتە شاراوەیە دڵانی لەخوا بێ ئاگا دەتاسێنێ ، وەسەنگێکی ئەوتۆی هەیە لەسەر دڵانی دونیا پەرست کەخۆشیان نازانن سڕو نهێنی ئەم نیعمەتەو عیززەتە چیە !؟

خوای گەورە (سبحانە وتعالی) دەرگای عیززەت و شکۆمەندی خستۆتە سەر پشت بۆ بەندەکانی، وەئازادی و سەربەستی بیروڕاشی پێداون و، وەحاڵی کردوون کەبەرزی و شکۆمەندی ئادەمیزاد لەبیروباوەڕی تاك پەرستیو کارو کردەوە چاکیدایە، بەرزی ئادەمیزاد لەبەندایەتی راست و رەوانی خوای گەورەو میهرەبان دایە ، بەرزی ئادەمیزاد لەزاڵ بونیدایە بەسەر هەواو ئارەزوو نەفس و شەیتان و شەیتانەکان وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُوْلَئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴾ فاطر : ١٠ . واتە ئەوەی رێزو حورمەتی دەوێ، ئەوەی عیززەت و شکۆمەندی دەوێ، ئەوەی کەرامەت و بەرزی دەوێ، ئەوەی پایەو فەزڵی دەوێ ئەوەکۆگاو مەخازینەکانیان گشتی وا لەلای خودای گەورەو میهرەبانە، رووکەنە خوداو رووکەنە بەرنامەکەی پێتان دەبەخشێ بەهرەمەندتان دەکات پێیەوە ، رووکەنە گوفتارو وتاری پیرۆزو رەنگین پاك و یەقین حەق و بەتین لەگەڵ کردەوەی چاك و راست و رەوان پاك و بێگەرد بۆ میهرەبان ، لەسەر رێگەی راستی ژیان بەختیار دەکات فیطرەو ویژدان عەقڵ و نەقلیش هەر شاهێدن ( اخلصە و اصوبە) بەرەو ئاسمان، فریشتەکان دەی رفێنن ، ووتار چاکی و کاررەوانی ، هەڵدەفڕێ بۆلای میهرەبانی و، شکۆمەندی و عیززەت

دێنن لەلای خودای خاوەن عیززەت لەبۆیەکێ ئەنجام بدا لەڕێگەی ئەو زۆر بەهیممەت کاری زەحمەت، بەڵام ئەوانەی پیلان و فڕوفێڵی پیس و تاوان ئەنجام دەدەن، بەکاری نارەواو ناهەموار بەدکار لەخۆیانیان رازی دەکەن، نەهەر عیززەت و شکۆمەندیان بەرناکەوێ ، نەهەر پیرۆزی و حورمەتییان ڕێ ناکەوێ ، بەپێچەوانەی ئەمەوە ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆر ئیهانەو ریسواییەکی چاوەڕوان نەکراو سەرەنجام و مەصیریانە ، هەر لەدونیاش پیلانی خراپ وەك و مالی قەرپ بەسەرو گێلاکی خاوەنەکەیدا دەکەوێتەوە، پووچەڵ دەبێ و بەتاڵ دەبێ شەرمەزاری و خەجاڵەت بەدیاری بۆ خاوەنەکەی دەهێنێتەوە .

وا تێ ناگەم کەسێ ببێ بەرزیو شکۆمەندی نەوێ، ئارەزووی بێ عیززەتی بێ حورمەتی بخوازێ، بەڵام رەنگە لەوە بێ ئاگابێ ڕێگاو دەرگای لای عەزیزە، هەر عەزیزە خۆی ئازیزکارە، بەندایەتی و دۆستایەتی ئەو زاتە پاکەیە ئادەمیزاد بەهەموو مەرام و مەقاصیدەکانی دەگەیەنێ ، بەڵام نەزانین و پیسیو پۆخڵی وەفاو خێری نیەو بەندیخانەیەکە ئادەمیزاد بەدبەخت دەکاو سەرەنجامی دەیدا بەئاگری زۆر چڕوپڕ ئاخوئۆفی پەشیمانی خەجاڵەتی و کەمایەتی، وەکو دیاری لەباوەشی جەهەندەما یا دۆزەخدا لەوێ دەبێ بەیەك جاری .

زۆر جار فڕوفێڵەکانی شەیتان هەندێ کۆڵەوار واحالی دەکات دونیای عیززەت و شکۆمەندی ئاوا لەپاڵ ستەمکاران و زاڵمانە ، وەتیغ تیخەیان دەدات خۆی لێ نزیك کەنەوەو لەعیززەتەکەیا خۆیان پێ شکۆمەند بکەن ، وەکو خوای گەورە باسی ساحیرەکانی سەردەمی فیرعەون دەکات و لەبارەیانەوە دەفەرموێ : ﴿..وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾ الشعراء:٤٤ ، واتە ساحیرەکان لەو کاتەی کەلەسەر وێڵی و گومڕایی بوون، لەبەرگری کردن بوون لە فیرعەونەوە، بۆیە ووتیان قەسەم و سوێندمان بەعیززەتی فیرعەون ئێمە بێگومانین لەسەرکەوتنمان و ئێمەین زاڵ دەبین بەسەر کارەکانی حەزرەتی موسادا .. بەڵام پاش ئەوەی عیززەتی پەروەردگاریان بۆ دەرکەوت

زانیان و حاڵی بوون لەوەی کەپێشوو گـومڕاو سەرلێـشێواو بـوون، حـاڵی بـوون لـەوەی کەفیرعەون عیززەتی لەلا نیە، بۆیە یەکسەر بەبێ سێو دوو کڕنووشیان بۆ خودای گەورە بردووەو ئەوپەڕی پەشیمانیان خستەڕوو، تەوبەیان کردو ئیمانیان هێنا وەکو خوای گەورە دەفـەرموێ : ﴿فَأَلْقَى مُوسَى عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ(٤٥)فَـأُلْقِيَ الـسَّحَرَةُ سَاجِدِينَ(٤٦)قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ(٤٧)رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ(٤٨) قَالَ آمَنْتُمْ لَـهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمْ الَّذِي عَلَّمَكُمْ السِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلاَفٍ وَلأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ(٤٩)قَـالُوا لاَ ضَـيْرَ إِنَّـا إِلَـى رَبِّنَـا مُنْقَلِبُونَ(٥٠)إِنَّا نَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَنْ كُنَّا أَوَّلَ الْمُـؤْمِنِينَ﴾ ٤٥- ٥٠ : الشعراء .

ئەگەر ئـادەمیزاد سـەرکەوێ بـۆ لای چـڵەپۆپەی گـومڕایی ولێـی تێـدەگات، کەلەوێندەر بێجگە لەفڕوفێڵ و پووچەڵی هیچیتری دەست ناکەوێ ، ئا ئەوەتە پێـشەوای گومڕایان و سەرلێشێواوان دان دەنێ، کەشەیتانی نـەفرەتیو لەعنەتیـیە، وەکـو خـوای گەورە بەزوبانی شەیتان بۆمان دەگێڕێتەوە کەووتویـەتی ﴿قَـالَ فَبِعِزَّتِـكَ لأُغْـوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ(٨٢)إِلاَّ عِبَادَكَ مِنْهُمْ الْمُخْلَصِينَ﴾ سـورة ص : ٨٣ . واتە شەیتان ووتـی ئـەی خوای گەورە قەسەم بەعیززەت و شکۆمەندی تۆ دەبێ هەموو بەنـدەکان وێـڵ و گـومڕا بکەم مەگەر ئەوانەیان نەبێ کەلەبەر پاکیو راستیان پاکت کردونەتەوەو هەڵتبـژاردوون . بـەڵێ عیـززەت و شـکۆمەندی پـەروەردگار ئەوەنـدە ئاشـکراو پرشـنگدارە تەنانـەت شەیتانیش ناتوانێ خۆی لێ گێل بکات و ناتوانێ قەسەمی پێ نەخوات .

ئەم کەموکوڕیەی لەسروشتی ئادەمیزاددا هەیە تینووی وەناچاری شکۆمەندی و عیززەتی عازیزێکە ، ئەو کاتە ئادەمیزاد بەرەو تەکامول و تەواوی هەڵدەچـێ کـەخاوەن بەش بێ لەپرشنگی نـوری هیدایـەتی عیززەتـی خـودای ئـازیزو شـکۆمەند ، وەئەگـەر ئادەمیزاد بەم بەهرەیە نەگەیشت ئەوە کەموکوڕیـەکانی ئـاژمێردرێن و بـەرەو هەڵـدێرو فـەوتان دەڕوا، ئەوەتـە دەسـتەیێ لـەبێباوەڕان و لـەخوا بێئاگایـان هەسـت دەکـەن

بەکەموکوڕی لەبونیان و سروشت و فیترەیان بۆیەپەنا دەبەنەبەر چەند پەرستراوی ناڕەوا تاکو ئەو کەموکوڕیەیان پڕبکەنەوە ، وەکو خوای گەورە لەبۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا(٨١)كَلاَّ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ مريم : ٨١ - ٨٢ . واتە : بێجگە لەخودای گەورە روویان کردۆتە چەند پەرستراوێ و دەیپەرستن بەئومێدو قەصدی ئەوەی عیززەت و شکۆمەندیان چەنگ بکەوێ ، بەلاّم نەخێر پەرستراوە پووچەلّە نالەجێیەکان خۆیان عیززەت و شکۆمەندیان نیە تاکو بیدەن بەغەیری خۆیان ، لەرۆژی دواییشدا بێ باوەڕ دەبنەوە بەعیبادەت و بەندایەتیەکەیان، دەبنەوە ناحەزو دژی ئەوان وێلّ و گومڕایان ..

بەلّێ نەهەر بۆ تاك بەلّکو بۆ کۆمەلّیش ئەگەر روو لەخودای ئازیزو ئازیزکار بکەن، وەسونەن و رێگای ئەو شارەزا بن، ئەو کاتە تێدەگەن عیززەت، و شکۆمەندی هەروان لەلای خودا، ئەو کاتە حالّیدەبن چۆن بەهرەمەند دەبن لەعیززەت و بەهرەی هەتا هەتایی، ئەو کاتە لەویلّی و سووکی و ژێرچەپۆکی رزگاریان دەبێ ..

ئەم سیفەتەی خوای گەورە کە (معزە) واتە عیززەت و شکۆمەندی دەبەخشێ بەکەسانێ کەڕووی تێبکەن بەکەسانێ ئاین و بەرنامەی ئەو بەرقەرارکەن ، ئێمەی ئادەمیزادو موسلّمانیش پێویستە بەم سیفەتە خۆمان برازێنینەوە ، هەولّ بدەین لەگەلّ خودای ئازیز ئاشنابین داوای عیززەتی لێبکەین و رێگەی عیززەت بگرینەبەر گەل و نەتەوەکەمان بەرەو دونیای شکۆمەندی بێنین و نەفرەت لەزەلیلی و داماوی و زەبوونی بکەین .

جا لەکۆتاییدا روو لەخودای عەزیز دەکەین و دەلّێین :

﴿ اللهم انت العزيز اعزنا وانت المعز اعزنا وانت الرحمن فارحمنا يا ارحم الـراحمين إنّك على كل شئ قدير ﴾

## ٢٥ - المُذِلّ

ناوێکە لەناوە دڵتەزێنەکانی خوای گەورە ، کەهۆشیاران هەموو دەم لەبەریەوە سام گرتوون ، بنچینەی ئەم ناوە - ذلّ -ە واتە زەلیلی و ملکەچی .

المذل : واتە خوای گەورە سەرشۆڕکەرو زەلیل کەری دوژمنانیەتی ، وەدەسەلاتی تەواویشی هەیە لەم کارەدا نەك تەنیا هەر لەدونیادا بەلکو لەرۆژی دواییشدا، وەئەم دەسەلاتەی خوا بەرامبەر بەناحەزانی هیچ کاتێك و ماوەیەك کەموکوڕی تێناکەوێ ، هەرکاتێ هەر کارێ خۆی بیەوێ ئەنجامی دەداو ، هۆیەکانی سایکۆلۆجی کاری لێناکا - وەکو خزمایەتی یا هاو نەتەوایەتی یا هاونیشتمانێتی ، .. هتد . - چونکە خوای پاك و بێگەرد دوورە لەمانە ، وەبەخواست و ویستی خۆی کەپڕە لەدانایی و زانایی ، هەرکەسێکی بیەوێ زەلیل و سوك و ریسوای دەکا .. وەخوای گەورە هەرچی لەسەر زەوی هەیە - وەك نیعمەتانێك - زەلیلی بەردەستی بەرەی ئادەمیزادی کردوە وەك دەفەرموێ : ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴾ الملك : ١٥ . واتە هەر خوای گەورەیە زەوی بۆ مایەسەرو زەلیل کردوون لەپێچ و پەناو رێگاکانیدا بگەڕێن و، لەرزق و رۆزی بخۆن ، وەگەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە ..

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ(٧١) وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴾ يس : ٧١ - ٧٢ . واتە : ئایا نابینن ئێمە بەدیمان هێناوە بۆیان ئەو ئاژەڵانی والەژێر دەستمانەوە خۆیان بوینەتە خاوەنیان ، وە بۆمان زەلیل کردوون هی وایان تیایە سوار دەبن هی وایان هەیە دەیخۆن .. هەروەها لەبارەی بەهەشتیانەوە دەفەرموێ : ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلاَلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلاً ﴾ الانسان : ١٤ . واتە : لق و پۆپی دەرختەکان بوینەتە سێبەروو بەروبومەکانیان شۆڕبۆتەوە تابەبێ ئەرك و زەحمەت بەدەستی بهێنن و لێی بخۆن .. هەروەها خوای بێ هاوتا ئیمانداران ریسواو زەلیل ناکات لەرۆژی دواییدا وەك دەفەرموێ : ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلاَ يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلاَ ذِلَّةٌ

أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُـمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ ﴾ يـونس : ٢٦ . واتـه : بـۆ ئەوانـەی کەچاکەکارن و خاوەن ئیمانن پاداشی چاکە بەزیادەوە ئامادەیە ، وەرویان تاڵی و زەلیلی پێوە دیار نیە ، بەپێچەوانەی بێ باوەڕانەوە کەڕویان تـرش و تـاڵ و مـرج و مۆنـە .. خوای گەورە باسی سیفەتێکی ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ : ﴿ .. أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُـؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ .. ﴾ مائدە : ٥٤ . واتە ئیمانداران لەبەرامبەر یەکەوە گوێ رایـەڵ و مل کەچن ،بەڵام لەبەرامبەر بێباوەڕان و کافرانەوە بـەتواناو بـەعیززەتن .. هـەروەها دەفـەرموێ : ﴿وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ..﴾ یـونس : ٢٧ . واتە ئەوانەی کاری گوناهباری دەنوێنن ئەوە پاداشی خراپکاری بەهاو وێنەی خۆی بۆی دەگەڕێتەوە وەشەکەتی و ماندوێتیو زەلیلیش بەشیانە .

خوای گەورە (جل جلاله) وەکو رێگای عیـززەت و شـکۆمەندی روون کردۆتـەوە کەلەبەرنامەی پێشوو باسمان کـرد رێگـای زەلیلـی و ریسوایـیـشی بـاس کـردووە وەکـو رەحمەتێك تاکو ئادەمیزاد خۆی لێبپارێزێ و لێی دووربکەوێتەوە ..

خوای گەورە ئەو جۆرە کەسانە ریـسوا دەکـات کەپـشت لەبەرنامـەو یاسـاکەی دەکەن و، خۆیان و شـوێن و پلـەیان و سـنوریانیان بیرچـۆتەوەو فەرامۆشـیان کـردووە ، سیفەتێ یا چەند سیفەتێ کەهەر شایەستەی خوایەو بەس، کەچی دەیدەنە پاڵ مەخلوق و بەدیهێنراو، رێزی خوا لای خۆیان ناگرن و دایدەبەزێنن بۆ ئاسـت بـەدیهێنراوو مـەخلوق وەرێزو پلەو پایەی مەخلوق و بەدیهێنراو دەگەیەننە ئاستی پلەو پایەی خوایەتی کەئەمە هەڵوێستانی نادروستن چونکە خوای گەورە لەپلەی خوایـەتی خـۆی روو لەکـەم و کـوڕی ناکات، وەئەوەی دان بەپلەو پایەی خوا نـەنێ ، ئـەوە سـەری لـەخۆی و شـوێنکەوتوانی شێواندووەو، بەرەو دونیای گومڕایی و ریـسوایی و زەلیلـی ملـی نـاوەو دەیـان بـات ، سروشت و خواستەکانی ئادەمیزاد غەریزەی ئولوهێتی و پەرستراوێتی هەڵـدەگرێ کـاتێ کەشەیتان فووی پیسی خۆی تیا بکات، بەرگ و کاڵای بایی بوون و لوت بەرزی دەپۆشێ و، ئاست و پلەی خۆی لێ وون دەبێ و، خـۆی لـێ دەبـێ بەتاکـە فـەرمانڕەوا ، لەسـەر خواسـتی ئـەوە عـەزم و جـەزم دەکـات کەخـەڵك و مـەردوومان ناچـاری گوێڕایـەڵی

فەرمانەکانی هەواو ئارەزووی خۆی بکات ، یا قەناعەتیان پێبکات، یا نەفس و گیانیان بکرێ ، یا مەصلەحەت و کاروباری ئیداریو بەڕێوەبردنیان دەبەستێتەوە بەو فەرمان و حوکمەی کەهەڵقوڵاوی بیرو هۆش و هەواو ئارەزوویەتی لەئاست ئەم راستیە بێئاگایە ، یا خۆی گێل دەکات راستیە بێئاگایە یا خۆی لێگێل دەکات کەفەرمان رەوایی مافێکی خودایەو هەر شایەستەی ئەوە، خوا هەر خۆی حاکمە ، ئەو مافەی بەکەس نەداوە ، چونکە مانای ئولوهیەتی و پەرستراوێتی تەواو دەکات ، وەکو رەحمەت خوای گەورە ئادەمیزادەکانی نەجات داوە یارێگای نەجاتیو رزگاری بۆ وێنەو رەسم کێشاون، لەودەردە کوشندەیە کەمایەی فووی شەیتانیەو سەرئێشەو سنور بەزاندنێکە کەمایەو ئەنجامی بەهیلاك چوون و زەلیل بوونی ئادەمیزادەکانە ، وەئەم هەموو گێچەڵ و شەڕو ناکۆکیانەی کەمایەی کاول بوون و لەدەست چوونی کامەرانیو سەعادەتە لەهەموو دونیادا، گشتی لەئەنجامی داواکردنی فەرمان ڕەوایێتیە، لەلایەنی کەسانێکی نەفس نەخۆش و خوانەناس، کەناڕاستەوخۆ داوای فەرمان رەوایێتی و حاکمێتی دەکەن، کەسیفەت و مافێکی خوداییەو هەر شایەستەی ئەوە کەسێکیتر ئەم دەورەی پێنایێ چونکە دەبێ بەمایەی تێك چوونی سروشتی ژیانی ئادەمیزاد و کاول بوونی ژینگەکەی ، هەروەها دەبێ بەمایەی لەدەست چوونی کامەرانی و بەختیاری ، سەرەڕای زەلیل و ریسواییەکی هەتا هەتایی لەلایەنی خودای گەورەو میهرەبان ، وەکو خوای گەورە شکۆمەندی و عیززەت دەدات بەبەندە دڵسۆزەکانی لەهەمان کاتیشا ریسوایی و زەلیلی دەدا بەسەرو گێلاکی پەرستراوە وێڵ و نالەجێیەکان ، لەگەڵ شوێن کەوتوو بەندەکانیان بەهەموو جۆرو نەوعیانەوە ..

ئەوەی شایانی باس بێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خەلکیان بۆ ژێر رکێفی هەواو ئارەزووی خۆیان بانگ نەکردووە، بەڵکو بانگیان کردوون بۆ ئەوەی خوای گەورەیان پێ بناسێنن و بۆیان روون کەنەوە کەخوای گەورە تەنها حاکمی موتڵەقەو فەرمان رەوایێتی هەر شایەستەی خۆیەتی ، وەئەوەی بەفەرمان ڕەوایێتی خوای گەورە رازی نەبێ ئەوە لێی رازی نابێ و زەلیل و ریسواشی دەکات لەدونیاو قیامەتدا ،وەکو

خوای گەورە ئەم مێژووە دێرینەی ئادەمیزادمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێ کەپێغەمبەرەکانیان بەبەڵگانی روون و ئاشکرا بانگیان کردوون بۆ ڕێگەی خودا جائەوەی پشتی تێکردبێ ئەوە خۆی تووشی زەلیلی و ریسوایی کردووە، وەکو یەکێ لەم گەلانە ، گەلی حەزرەتی نووح بووە کەلەئەنجامی گوێ نەدانیان بەپێغەمبەریان تووشی زەلیلی و ریسوایی و فەوتان هاتوون ، وەخوای گەورە گشتیانی لەناوا نقوم کرد تەنها حەزرەتی نوح و ئیمانداره‌کان نەبێ .. هەروەها گەلی (عاد) کەخوای گەورە حەزرەتی هودی لەناویانا کردە پێغەمبەرو بانگیانی دەکرد بۆلای خودای گەورەو پەیامەکەی ، زۆر ئامۆژگاری جوان و بەجێی کردن بەڵام بێ سوود بوو ، جا لەئەنجامی پشت کردنیان لەپەیامەکەی خودا ، ریسواو زەلیل بوون و بەهیلاك چوون ، خوای گەورە بایەکی زۆر بەهێزو ساردی بەسەردا هێنان ، کەهەشت رۆژو حەوت شەوان بەردەوام دای گرتن کەبوو بەمایەی لەریشە دەرهێنان و فەوتانیان ، وەکو خوای گەورە لەسورەتی هودو سورەتی (الحاقـه)دا بۆمان باس دەکات هەروەها گەلی ثەمود خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ رەوانە کردن کەناوی حەزرەتی (صالح) بوو ، زۆر پێیانەوە ماندووبوو بۆ راست کردنەوەیان ، چەندین ئامۆژگاری جوان و موعجیزەی رەوشەن و پەیامی نورینی کەڵك و سودیان لێ وەرنەگرت ، هەر بەفەرمان رەوایەتی و حاکمێتی خوای گەورە رازی نەبوون ، هەواو ئارەزووی خۆیان لێ زل بووەو شەیتان فووی پیاکردو ئەوانیش بەگێلێتی و نەفامی داکەوتن تابوو بەمایەی فەوتانیان و هاتنی غەزەب و عەزابی خودایی، ئەوەبوو خوای گەورە سێ رۆژ پاش راگەیاندنی تەواو مۆڵەتیدان و لەو سێ رۆژەدا خوای گەورە حەزرەتی (صالح) و موسڵمانەکانی رزگارکردوو ، باقی ئەوانی تری دانە بەر دەنگێکی زۆر گەورە کەهەموویان پێی تۆقین و بەچۆکا داکەوتن و بەر ریسوایی و زەلیل بوون کەوتن و فەوتان .

هەروەها گەلێکیتر کەگەلی حەزرەتی لوط بوون خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ رەوانە کردن کەحەزرەتی لوط بوو پاش چەندین ئامۆژگاری جوان و بەڵگانی رۆشن و ئاشکرا هەر نەگەڕانەوە سەر رێبازو بەرنامەی خودا، وەدەستیان هەڵ نەگرت

لەنێربازی‌یەکەیان تا ئەنجام گەیشتە ئەوەی کەشایەستەی فەوتان و بـەهیلاك چـوون بـن ئەوەبوو خوای گەورە خاکی بەسەردا ژێـراو ژوور کـردن و ئـەوەی لـەولاو ئـەملاش بـوو بەردەبارانی کردن ، کەوتنە بەر ریسوایی و زەلیل بوونــەوە ، هــەروەها چـەندین گـەل و قەومانی‌تر لەوانەی خوای گەورە باسی کردوون لەوانەی خـوای گـەورە باسـی نـەکردوون لەمێژوو تاریخانی دوورو نزیکەوە ئەوە سونەتی خوای گەورەیە ئەوەی پـشت لەبەرنامــەو حاکمیەتی خوای گەورە بکات ئەوە خوای گەورە (مذلي) ئـەوە واتــە سـووك و ریـسوای دەکاو، وەتووشی ئەوپەڕی ئەشکەنجەو ئازاری دەکـات عــەزابی جەهەنــدەم و دۆزەخـیش لەویێ بوەستیێ .. بەڵێ ئەو باسانەی کردمان لەسورەتی (هود)دا بوو جا ئــەوەی جێگـەی سەرنج راکێشان و لێووردبونەوەبێ لەکۆتایی بەسەرهاتەکانا خوای گـەورە دەفـەرمووێ : ﴿ .. وَمَا هِيَ مِنْ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴾ سورەتی هود : ٨٣ .

واتە : ئەو جۆرە بەهیلاك چوونانە لەو جۆرە غەزەب و عەزابانە لەستەمکاران و زالمان دوور نی‌یە، بەلکو ئەنجام و دوا رۆژی ئەوانیش ئـەوها بـەدوو ڕەشـە، هەڵـدەگرێ هەرچین و تاقمێ جۆرە میزان و تـەرازوێکی پـێ بـێ بـۆ جیاکردنـەوەو ناسـینی زالـم و ستەمکار ، لەوانەیە یەکێ بڵێ لەدونیادا فلان چین زالم و ستەمکارن یەکێ‌تر بڵێ نـەخێر ئەوانەی ئەوهاو ئاوانە زالم و ستەمکارن لەوانەیە یەکێ تـریش بڵـێ کاکـە ئێـوە هـیچ کامتان نەیپێکاو نەیزانی من لەئێوە باشتر دەزانم کـەزالم و سـتەمکارەکان کـێن و کـێ نین، ئابەم شێوەیە لەهەموو دنیا هەر کەس و چینە جۆەر پێوەرێکی داناوەو ئـادەمیزادو کارەکانیانی پێ هەڵدەسەنگێنێ زالم و ستەمکارانی پێدەست نیـشان دەکـات .. رێـی دەچێ زالم و ستەمکار خۆی پێ لەهەموو کەس راست ترو باشتر بێ ئاوا شەیتان سەری لێشێواندبێ .. جێگەی خۆیەتی ئەم پرسیارەش لەخودای گەورە بکەین بلێین ئەی خودای گەورە بەتەرازووی و میزانی پڕ حەق و عەدالەتی تۆ کێیـە زالـم و سـتەمکار ، دیـارە خوای گەورەش فەرموویەتی : ﴿ .. وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الظَّالِمُونَ ﴾ المائدة: ٤٥ . واتە : ئـەوەی فـەرمان رەوای نـەکات بـەو بەرنامەیـەی خـوای گـەورە دایـەزاندووە ئەوانە خۆیانن زالم و ستەمکار ، یا بەمانایێ‌تر ئەوەی بەحاکمایەتی خـوای

گەورە رازی نەبیٚ پشت بکات لەپرۆگرام و بەرنامەی خودا ئەوە خـۆی خـستۆتە دونیـای زوڵم و ستەمکاری ئەگەر بەخۆی بزانیٚ یا نەزانیٚ.. دیـارە زوڵـم و سـتەمیش نیـشانەی بەندایەتیەکی بەهیٚزو دڵسۆزییە بۆ شەیتان ، لەهەمان کاتیـشا کەوتنـە بـاری زەلیلی‌ـو ریسوایی بوونە ، چـونکە خـوای گـەورە زەلیـل کـاری شـەیتان و بەندەکانیـەتی - جـا لەکۆتاییدا داوا لەخوای گەورە دەکەین کەگەل و قەومەکـەمان لـەزەلیلی و ریـسوایی و زەبونی دوور بگریٚ و شکۆمەندی و عیززەت و بەختەوەری پیٚ ببەخشیٚ ..

## ٢٦ - السميع

ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای ریسواکاری زالمان و ستەمکاران ، بنچینەی ئەم ناوە - سمع -ە واتە بیستن و گوێ لێبوون ، (٤٧) جار ئەم ناوە لەقورئاندا هاتووە کە (٤٥) جاریان سیفەتە بۆ خوای گەورە واتە بێجگە لەئایەتی (٢٤) سورەتی هودو ئایەتی (٢) لەسورەتی الانسان نەبێ .

السمیع : واتە خوای گەورە بیسەرە بەهەموو ئاوازو دەنگێ یا بەماناییەکی‌تر واتە بیسەری بێسنورە ، بەجۆرێك کەگوێی لەهەموو دەنگێکە ، وەکو ئادەمیزاد نییە سنورێکی هەبێ ، زۆر دەنگ لێیەوە بەدەرێو ، لەیەك کاتدا دوو دەنگ یا زیاتر نەبیستێ و لێك نەکاتەوە ..

خوای گەورە گوێی لەدەنگی بەرز دەبێ و ، وەگوێی لەدەنگی نزم دەبێ هەرچەندە ئادەمیزاد لێی بێخەبەربێ تەنانەت دەنگی پێی میرووله‌یێ لەشەوێکی تاریکا لای خوا ئاشکراو دیارە ، وەخوا گفتوگۆی بەدیهێنراوەکانی ئەبیستێ و لێیان تێئەگات - جا چ باڵندەکان بن یا زیندەوەرە وردەکان بن یا جۆراو جۆری ماسیەکانی بن دەریا بن یا پەریان بن یا دەنگی ئادەمیزادەکان بن جا بەهەر زمانێکەوە بدوێن و یا قسە بکەن .

بەکورتی هەر دەنگێ لەئەزەلەوە تا ئەبەد هەبێت لەبیستن و تێگەیشتنی خوای گەورە بەدەر نییەو بەدەر نابێت ، وەزانیاری هەیە بەچەندو چۆنی ئەو دەنگە لەپێش دەربڕینیدا وەهیچ هێزو دەسەڵاتێ وەیا هیچ زانست و زانیاریێ رێ لەزانست و زانیاری خوای گەورە ناگرێت و قەدەغەی بۆ ناکرێ لەهیچ روو لایەنێکەوە ..

خوای پەروەردگار لەبارەی بیستنی دەنگی ئادەمیزادەوە دەفەرموێ : ﴿ .. مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَى ثَلاثَةٍ إِلاَّ هُوَ رَابِعُهُمْ وَلاَ خَمْسَةٍ إِلاَّ هُوَ سَادِسُهُمْ وَلاَ أَدْنَى مِنْ ذَلِكَ وَلاَ أَكْثَرَ إِلاَّ هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ المجادلة : ٧ .

واتە : روونادا هیچ سێ کەسێ چپە چپ بکەن ئیللا خوا چوارەمیانە وەهیچ پێنج

کەسیٚ نیە چیە بکەن ئیللا خوا شەشەمیانە ، وەئەلەم ژمارەیە کـەمتر وەنـەزیاتر ئـیللا خوا والەگەڵیانا جـا لەهـەر شـوێن و مـەکانیٚ بـن ، پاشـان هـەواڵیان پـیٚ دەداتـەوەو ئاگاداریان دەکـات بـەکردەوەکانی ئەنجامـدراویان لـەرۆژی قیامەتـدا، بیٚگومـان خـوا بەهەموو شتیٚ زاناو ئاگادارە ..

خوای میهرەبان خۆی ئامێری بیستن و تێگەیـشتنی داوە بەمەخلوقـەکانی گـەر ئارەزوو بکا لێیان دەسێنێتەوە چونکە سەرچاوەی بیستن و ئاگاداری لای خۆیـەتی ، وەك دەفـەرمویٚ : ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ .. ﴾ یونس: ٣١.

واتە : پیٚیان بڵیٚ ئەوە کیٚیە رزق و رۆژیتان دەدا لەئاسمان و لەزەویـدا هـەروەها ئەوە کویٚیە کردونی بەخاوەنی بیـستن و بیـنین ؟ واتـە خـوای پـەروەردگارە، هـەروەها دەفەرمویٚ : ﴿..وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرە : ٢٠.

واتە گەر خوای گەورە خواست و ویستی لیٚبیٚ گویٚچکەو چاویان لیٚ دەسێنێتەوە ، بێگومان خوای میهرەبان لەسەر هەموو شتیٚ بەتوانایە .. وەخـوای پـاك و بیٚگـەردو بیسەر فێرمان دەکا کەبەم سیفەتەوە - وەکو سیفەتەکانیتر - لیٚی بپاڕێینـەوە ، وەکـو بەزمانی حەزرەتی ابراهیم (علیە الصلاة والسلام) دەفـەرمویٚ : ﴿..رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ البقرە : ١٢٧ .

واتە کاتیٚ کەئیبراهیم پێغەمبەر لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیـا خـانووی کەعبـەیان نویٚ کردەوەو فەرموویان پەروەردگارا لێمان وەرگرە ، بەجیٚی رازی بوونی خۆت بەڕاستی تۆ بیسەرو زانای..

هەروەها خوای گەورە پاڕانەوەکەی حـەزرەتی زەکـەریامان (علـی نبینـا وعلیـە الصلاة والسلام) دەگێڕێتەوەو دەفەرمویٚ : ﴿ هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾ ال عمران: ٣٨ .

لەو کاتەی کەحەزرەتی زەکەریا سـەردانی حـەزرەتی مەریـەمی کـرد (سـەلام و

رەحمەتی خوای گەورەیان لێبێ) رۆزی و رزقێکی باش و نایابی لەلا دێت، فەرمووی ئەی مەریەمە ئەم رزق و رۆزیەت لەکوێ بوو ؟ ووتی لەلایەنی خوای گەورەوە پێم بەخشراوە بەڕاستی خوای گەورە رزق و رۆزی دەبەخشێ بەبێ ژمارەو حیساب بۆ کەسێ خواستی لێبێ .. لەو کاتە حەزرەتی زەکەریا کەئەو رێزو بەهرەیەی مەریەمی دیت ، زۆرتر ئومێدی بوژایەوەو ئاسۆی ئاواتی فراوانتر بوو رووی کردە خوداو پاڕایەوەو ووتی پەروەردگارا پێم ببەخشە لەلایەنی خۆتی بەخشندەوە وەچەو نەوەیەکی باش و پاك و پیرۆز، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعاو نزاو پاڕانەوانی .. هەروەها خوای گەورە ئەمر بەپێغەمبەری خۆشەویست دەکاو دەفەرموێ : ﴿ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا وَاللَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ المائدة : ٧٦ . واتە ئەی پێغەمبەری خودا پێیان بفەرموو ئایا ئێوە بەندایەتی غەیری خودا دەکەن کەسوودو زیانی بۆ ئێوە لەدەست نییەو، هەر خوای گەورەیە سەرچاوەی خێرو بێرو زەرەرو زیانە هەر خۆی بیسەری هەموو دەنگێکەو زانایە بەهەموو رازو نیازێکا ،هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿خُذْ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنْ الْجَاهِلِينَ(١٩٩)وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنْ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الاعراف : ١٩٩ - ٢٠٠ .

واتە : ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لێبووردەو ئاسان کاربە لەکارو فەرمانەکانت ، وەئەمرو داواکانت بخەڕووی چاکردنی عورف و عاداتەوە لەرێگەی خوورەوشتی جوان و مامەڵەو رێك و پێکی شەریعەتەوە، لەو هۆو هۆکارانەی مایەی یەکترناسینی خەڵك و مەردوومن، وەئەگەر شەیتان تیخ تیخەی دایەو ویستی لەرێگەی راست بترازێنێو لات بەرێ، فریای خۆت کەوەو پەنا بەخوا بگرە، بەڕاستی خوای گەورە ئاگادارەو وەبیسەرو زانایە بەهەموو کارو دەنگی لەگشت دونیایا .. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَأَخَذَهُمْ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ(٥٢)ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الانفال : ٥٣ .

واتە وەکو دەست و پێوەندو بۆرە پیاوانی فیرعەونی ، وەئەوان کەسانەی پێش

ئەوانیش بێباوەڕبوون بەئاین و بەرنامەی خودای،و، پشتیان کرد لەحەق و ڕاستی، بەمەوە کەوتنە دونیای زوڵم و گوناهو تاوانکاری ، جا خوای گەورە قەڵاچۆی کردن و نەژنۆی شکاندن و تەفرو تونایانی کردن ، بەڕاستی خوای گەورە زۆر بەهێزەو تۆڵەی سەختەو عیقاب و عەزابی بەتینە ، ئائەوەیە سونەتی خوای گەورە بەڕاستی و بێگومان خوای گەورە خێرو بێری نیعمەت و بەهرەیێ کەبەخشیبێتی بەگەل و قەومێ لێیان تێك ناداو لێیان ناگۆڕێ تاکو ئەوان بەخۆیان لەخۆیان نەگۆڕن و تێك نەدەن ، بەوەی پشت لەحەق و ڕاستی دەکەن و بەدوای وێڵی و گومڕایی دەکەون و سەرەنجام سەریان لێ دەشێوێ و بەدەستی خۆیان دونیاو قیامەتی خۆیان کاول دەکەن و خاپووری دەکەن ..

وەبزانن بەڕاستی خوای گەورە بیسەری هەموو دەنگ و ئاوازێکە، حاڵی هەموو مەبەست و نیازێکە، زانایە بەهەموو وێڵ و گومڕاییێکە، تێکدەری ماڵی هەموو تاوانبارێکە ، لەقورئانا (٤٧) جار ناوی خودا هاتووە بە (السمیع) هەر ئایەتەی کەدەیخوێنیەوە دونیاییێکی فراوانی مانای ئەو ناوەت بۆ روون دەکاتەوەو سەرەنجام حاڵیت دەکەن کەبیسەری خوای گەورە هیچ سنورو مەوداییێکی بۆ نیە ،وەهیچ هەست و نست و پستە پست و بێنەو بەردەیێ نیە لەدەرەوەی بیستن و بینینی خوای گەورەبێ ..

خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلاَّ تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُنْ مِنْ الْجَاهِلِينَ(٣٣)فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ يوسف : ٣٣ - ٣٤ .

واتە ووتی پەروەردگارا بەپاکێتی و لەژێر ڕەزامەندی تۆ لەبەندیخانەبم لام خۆشترو باشترە لەوەی ئەوان داوام لێدەکەن کەپیسیەو پۆخڵی و بەرەڵاییەوە، ئەگەر فرۆفێڵ و مەکری ئەو خانمانەم لێ لانەدەیت ، وەکۆمەکی و یارمەتیم نەدەیت ، باری پیلان و نۆینیان نابەم و تێی دەکەوم و مەیلم دەکێشن بەلای خۆیانا ، جاسەرەنجام دەکەومە ناو کۆڕو کۆمەڵی مێ بازانی نەفام و جاهیلیەوە، جا پەروەردەگار بەوەڵامی هاتەوەو نزاو پاڕانەوەکەی قەبووڵ کردوو ، هەموو مەکرو پیلانەکانیانی پووچەڵی کردەوەو، حەزرەتی یوسفی بەپاکی پاراست و پلەو پایەو ڕەزامەندێتی خۆی پێبەخشی ، بەڕاستی خوای

گەورە بیسەری دەنگی کەسانێکە کەهانای بۆ دەبەن و پەنای پێدەگرن ، وەزانایە بەحاڵی خواناسان و فڕوفێڵی نەفامان .

لەعەبدوڵلای کوڕی زوبەیر دەگێڕنەوە (خوا لێیان رازی بێ) دەفەرموێ : وەفدێ لەبەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) . جاحەزرەتی ئەبوبەکر عەرزی پێغەمبەری خۆشەویستی کرد کەقەعقاعی کوڕی مەعبەد بکە گەورەو ئەمیریان ، وەئیمامی عومەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەقرەع کوڕی حابیس بکە بەگەورەیان جا حەزرەتی ئەبوبەکر پێی ناخۆش بوو دڵگران بوو ووتی ئەی عومەر تۆ هەر مەبەست و نیەتت بەربەرەکانێتی من بوو لەم قسەیەدا ، ئیمامی عومەریش ووتی : شتی وام مەبەست نەبووە ، جاکەوتنە هاوردو بردی قسەوەو دەنگیان لێ بەرزبووەوە ، لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کەخوای گەورە تێیدا دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُوا لاَ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ الحجرات : ١

واتە : ئەی کەسانێ کەئیمان و باوەڕتان هێناوە هیچ کاری سەربەخۆ مەهاونە پێش حوکم و فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا ، وەیا بەمانایێتر بەبێ وەرگرتنی ئەمرو فەرمانی خوداو پێغەمبەر هیچ حوکم و کارێ مەکەن ، یاخود مەکەونە پێش خوداو پێغەمبەرەوە لەئەمرو فەرمانا سەرپێچی لەفەرمانەکانیان مەکەن ، وەبزانن خودای گەورە خۆی بەحاڵی هەموو گەل و کۆمەڵێ حاڵیەیە، هەر خۆی دەزانێ چیان بۆ باشەو چیان بۆ خەراپەو هەر خۆی شایەستەی داڕێژتنی یاساو قانونە هەر خۆی دانەری بەرنامەو پرۆگرامی ژیانە .. هەروەها خوای گەورە پەروەردگار لەسورەتی (النساء) دا لەئایەتی (٥٨)دا دەفەرموێت : ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَـا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَـانَ سَـمِيعًا بَصِيرًا ﴾ النساء : ٥٨ .

واتە : بێگومان خودای گەورە ئەمرو فەرمانتان پێدەدات ئەمانەت بپارێزین و بیدەین بەخاوەنی شەرعی خۆی، وەکاتێ فەرمان رەواییتان کرد لەبەینی خەڵك و

مـەردووما بـەپێی بەرنامـەی خـوای گـەورە رەفتـار بکـەن کەپڕیـەتی لەعەدالـەت و دادپەروەریتی وەمافی هەموو کەس دەپارێزێ و حەقی کەس ناخورێ تێیـدا ، بەراسـتی خودای گەورە باشترین و جـوانترین ئامۆژگاریتـان دەکـا بەپەیامـە پـیرۆزو بەرزەکـەی، بەراسـتی خـۆی حاڵییـەو تـێ دەگـات و دەبـینێ و دەزانـێ کەباشـترین و چـاکترین ئامۆژگاریتان بکات و بەرنامەو یاساتان بۆ دارێژێ و بەهرەمەندتان بکات پێیەوە ..

لەکۆتاییدا رووەو خوای گەورەو پەروەردگار دەڵـێین : ربنـا تقبـل منـا إنـك انت السميع العليم وتب علينا انك انت التواب الرحيم ..

## ٢٧ – البصير

ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای بیسەر ، ئەم ناوە (٥) جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو (٤٢) جار مەبەست سیفەتی خوای میهرەبانە، بنچینەی ئەم ناوە (بصر)ە واتە دیتن و بینین .

البصير : واتە خوای گەورە پەروەردگارێکە چاوی قودرەتی لەهەموو بەدیهێنراوەکانە لەیەك کات و ساتدا ، ئەم دیتنەش نەك تەنیا لەرواڵەتیاندا بەڵکو لەناوەڕۆك و حەقیقەتیشیانا ،بچوکی و گەورەیی و پەناو پەردە تاریکایی و روناکی رێ لەچاوی قودرەتی خوا ناگرێ ، وەچاوی قودرەتی خواماندوو بون وقوچان و بێهێزی و شل بوونی بۆنییە ، هەموو دەم هەموو شتێ والەبەرچاوی قودرەتییەتی ، بۆ ماوەی کەمتر لەچرکەیەکیش لێیانەوە بێ ئاگا نییەو نابێ ، وەکو دەفەرموێ .. ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ البقرة : ٢٣٣ .

واتە : خۆ پارێزی بکەن و لەخوا بترسن و بزانن بەڕاستی خوا بەکردەوەتان بینەرەو دەبینێ ..

وەهەر بەش و پارچەیێ لەبونەوەرەکان شایەدو گەواهی ئەم راستیەن ، جا کەشکەشان و ئەستێرەکان بن وەیان دەریاو ماسییەکان بن یا کێوو درندەکان بن یا ئاسمان و باڵندەکان بن ، یا ژێر زەوی و زیندەوەرەکان بن ، یا سەر زەوی و گیان لەبەران بن ، گشتیان بۆ ژیرو بیری نادەمیزاد روون دەکەنەوە کەخاوەنەکەیان چاوی لێیانەو فەرامۆشیان ناکاو پێویستی و ئاتەواویان بەجێ دەهێنێ .. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلاَ بَعْثُكُمْ إِلاَّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ لقمان: ٢٨ .

واتە : بەدیهێنانی گشتان و زیندوو کردنەوەتان لای خوا وەك نەفسێ وایە کە بەدیبهێنێ و زیندووی بکاتەوە (واتە یەکجار ئاسانە) ،بەڕاستی خوای گەورە بیسەرو بینەرە بەهەر هەموو شتێ ..

خوای پەروەردگار لەئامۆژگاری عەبدوبەندەکانیدا لەسورەتی فصلت لەئایەتی

(٤٠)دا دەفـەرموێ : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لاَ يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا أَفَمَنْ يُلْقَى فِـي النَّارِ خَيْرٌ أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ فصلت : ٤٠ .

واتە بەڕاستی ئەوان کەسانەی ئایەتـەکان و نیـشانەکانی ئێمـە دەگـۆڕن و لێـلێ دەکەن وەلەشوێنی خۆیانا دەیترازێنن لەئێمە ناشاردرێنەوەو وون نابن ، دەنا یـەکێ فـڕێ بدرێتە ناو ئاگری جەهەندەم و دۆزەخەوە باشترو چاکترە یا بەدڵنیایی‌و ئەمینیـەوە بـەرەو پێشوازی ڕۆژی قیامەتەوە بێ ؟! دیارە ماناکەی و وەڵامەکەی زۆر ئاشـکراو ڕوونـە دەی کەواتە کاربکەن چۆنی دەتانەوێ بەڕاستی خوای گەورەو پەروەردگار بەو کـارو کـردەوەی کەدەیکەن بینایەو چاوی لێیـەتی ، وەهەریەکـەی بەئـەنجامی کـارو کردەوەکـەی خـۆی دەگەیەنێ ..

هەروەها خوای گەورە لەسـورەتی (النسـاء)دا لەئایـەتی ١٣٤ دا دەفـەرموێ : ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ الدُّنْيَا فَعِنْدَ اللَّهِ ثَوَابُ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾ . واتە ئەوەی ثـواب و پاداشتی دونیای دەوێ بـا ڕوونەکاتـە ئـەملاو ئـەولا بـەڵکو ڕوو بکاتە لای خوداو بەرنامەکەی چونکە بەڕاستی پاداش و سەوابی دونیـاو قیامـەت هـەر لەلای خودایە ، هەر یاساو بەرنامەی خوایـە هـەر خواناسـین و خواپەرسـتی ئـادەمیزاد ئاسوودەو بەختیار دەکاو هەموو گرێ کوێرەکانی بۆ دەکاتەوە، بەڕاسـتی خـوای گـەورە بیسەرە بەهەموو خواست و دەنگێ بینایە بەهـەموو کـارو ڕەنگـێ .. هـەروەها خـوای گەورە لەسورەتی الاسراء دا لەئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ : ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُـرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ وَكَفَى بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴾ . لەم ئایەتەشدا خوای گـەورە تێیدا دەفەرموێ چەندین قەوم و گەلانمان بەهیلاك دا بـەهۆی تـاوان و گوناهەکانیانـەوە لەپاش زەمانی حەزرەتی نوح پێغەمبەرەوە ، بەسەو کافیە کەپەروەردگاری تۆ بەگوناه و تاوانەکانی بەندەکانی شارەزاو خەبیرەو بیناو بەصیرە ..

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَـرَكَ عَلَـى ظَهْرِهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ

بَصِيرًا ﴾ فاطر : ٤٥ .

واتــه : ئەگــەر خــوای پــەروەردگارو میهرەبــان بەخەراپــەو تــاوانی خــەڵکان و مەردوومی بکردایە ، ئەوە دەبا یەکوتــەیێ و مــەخلوقێ لەســەر پــشتی ئــەم زەوییــە نەهێڵێ ، بەڵام لەبەر بەزەیی و میهرەبانی خۆی و چەندین حیکمەتێ دوایان دەخا تــاکو کاتی دیاری کراوی خۆی و ئەجەلیان ..

جا کەکاتێ ئەجەل و وادەیان هاتە پێــشەوە ئــەوە بێگومــان خــوای پــەروەردگار بەبەندەکانی بینایەو چاوی قودرەتی لێیانە ..

هەروەها خوای گەورە لــەبارەی چــەند واقیعێکــی رۆژانــی مەحــشەرو قیامــەت دەفەرموێ : ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ(٧)فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا(٨)وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا(٩)وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ(١٠)فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُــورًا(١١) وَيَصْلَى سَعِيرًا(١٢)إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُورًا(١٣)إِنَّهُ ظَنَّ أَنْ لَنْ يَحُورَ(١٤)بَلَى إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيرًا ﴾ الانشقاق : ٧-١٥ .

خــەڵك و مــەردوومان لــەو کاتــەی کەزینــدوو دەکرێنــەوەو وەکــۆ دەکرێنــەوە لەمەیدانی مەحشەرو قیامەتدا جا ئەوان کەســانەی کــەخواناس و خــوا پەرســت بوینــە وەخاوەنی ئیمان و کاروکردەوەی چاك بوینە کیتابی کارو کردەوەو ئــەعمالیان بەدەســتی راستە پێدەدرێتەوە، ئەوسا حیسابێکی سوك و ساکاریان لەگەڵا دەکرێ وەبەئاســوودەیی و بەختیاری دەگەرێنەوە بەلای کەس و کارەکانی خۆیان سەرکەوتن و فەزوی خۆیــان پــێ رادەگەیەنن ، بەڵام هەندێ کەســانی تــر کــەبێ بــاوەرو کــافر بوونــە، بێئیمــان و کــارو کردەوەی چاك بوینە کیتابی کارو کردەوەو ئــەعمالیان لــەلای پــشتیانەوە پــێ دەدرێ و بەدەستی چەپەوە دەیگرن هاواریان لێ بەرزدەبێتەوەو خۆیان بەدونیای پەشــیمانی خۆزیــا هەڵدەواسن و داوای فەوتان و بونەوە خۆڵ و گڵ دەخوازن ، بەڵام بێسوودە بۆیان و دەچنە ناو ئاگری جەهەندەمەوەو روو رەش و خەجاڵــەت دەبــن ، لەبــەر ئــەوەش تووشــی ئــەو ئەنجامە بەدو خراپە هاتوون چونکە لەدونیایێدا بەزوڵم و تاوان و ناحــەق کــەیف خۆشــی بوینە ، پێچەوانەی حەق و راستی هەڵوێستیان گرتــووەو گومــان زەنیــان وابــوو زینــدوو

بونەوە نی‌یەو موحاسەبە و بەهەشت و جەهەندەم نی‌یە، کەمردین تەواو هەموو شتێ دەبڕێتەوە ، نەخێر ئەم کارو کردەوەتان بەزایە ناچێ و هەر کەس بەری رەنجی خۆی دەدورێتەوەو کەسێ زوڵم و ستەمی لێ ناکرێ، وەخوای پەروەردگار بەکارو کردەوەی هەموو کەسێکا بینایەو چاوی قودرەتی لێ‌بووە ، هەروەها خوای پەروەردگار لەسورەتی (البقرة)دا لەئایەتی (١١٠)دا دەفەرموێ : ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَمَا تُقَدِّمُوا لأَنفُسِكُمْ مِنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِنْدَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ البقرة : ١١٠ . واتە : نوێژەکانتان بەتەواوی بەجێ بگەیەنن و زەکاتی ماڵی خۆتان بدەن وەبزانن هەرچی لەبەندایەتی و چاکەو خێر ئەنجامی دەدەن بۆ نەفس و گیانی خۆتان پێشی دێخن ئەوە بەزایە ناچێ هەمووی لەلای خوای گەورە نووسراوەو پاداشتی خۆتان چنگ دەکەوێتەوە، بەڕاستی خوای گەورە لەکارو کردەوەتان بێ‌ئاگا نیە بەڵکو بینایەو چاوی قودرەتی لەو کارو کردەوانەیە کەئەنجامی دەدەن .

هەروەها خوای گەورە لەبارەی خێزان و خێزانداری‌یەوە لەسورەتی (البقرە)دا لەئایەتی ٢٣٧ دا دەفەرموێ : ﴿..وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلاَ تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾

وەئەگەر ئێوە لێبوردەبن و لەکەم و کوڕی یەکتربببورن ئەوە باشترین و نزیکترین شتێکە لەخواپەرستی‌و تەقوای خوادا، لەناست یەکا سپڵەو بەدنمەک مەبن وەلەبیرتان نەچێ و فەرامۆشی نەکەن ئەو هەموو فەضل و چاکەی یەکترتان بەسەر یەکەوە، رێزو حورمەتی یەکتر بپارێزن و بیر لەچاکەو سودی یەکتر بکەنەوەو بەکارانی ناهەموارو بێجێ نەکەون، چونکە بەڕاستی خودای گەورە بەو کارو کردەوەی کەئەنجامی دەدەن لێیەوە بێ‌ئاگا نیەو چاوی قودرەتی لێیەتی و پێیەوە بینایە هەروەها خوای گەورە لەسورەتی ال عمران دا لەئایەتی (١٤ و ١٥)دا دەفەرموێ : ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنْ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ(١٤)قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا

وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾ .

جوان و رازاندراوەتەوە بۆ خەڵك و مەردوم خۆشەویستێتی و خواست و ئارەزووەکان لەئافرەت و منداڵ و ماڵ و سەروەتی زۆر لەزێڕو زیوو سواری چاك و باش و مەڕو ماڵات و کێڵگەو مەزرەعات، ئەمانە گشتی مایەی رابواردنی ژیانی دونیایییەو بەسەردەچێ ، شوێنی پیرۆزو چارەنووسی بەهرەدارو وان لەلای خودای پەروەردگارەوە ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بفەرموو ئایا هەواڵتان پێبدەم بەخێرو بێری باشترو چاکتر لەوەتان بۆ کەسانێ تەقوای خوای گەورە دەکەن و لێی دەترسن و پەیڕەوی لەبەرنامەکەی دەکەن ، باغ و باغات و بەهەشتانی پڕ جۆرەها نیعمەت کەبەژێریانەوە چەندین رووبار جاری دەبێ و تێیدا دەمێنێتەوە بەیەکجاری و، وەهاوجووت و حۆریانی زۆر پاك و بێگەردیانی پێ دەبەخشرێ و رازیبوون و ریزوانی خوای پەروەردگاریش دەبێتە خۆراکی مەعنەویان و، رووح و گیانیان پێشادمان دەبێو پێی بەهرەمەند دەبن ، وەخوای پەروەردگاریش بینایەو چاوی قودرەتی لەبەندەکانیەتی هەروەها خوای پەروەردگار لەئامۆژگاریەکا رووەو ئیمانداران لەسورەتی ال عمران لەئایەتی (١٥٦) دا دەفەرموێ :

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ كَفَرُوا وَقَالُوا لإِخْوَانِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا فِي الأَرْضِ أَوْ كَانُوا غُزًّى لَوْ كَانُوا عِنْدَنَا مَا مَاتُوا وَمَا قُتِلُوا لِيَجْعَلَ اللَّهُ ذَلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَاللَّهُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ .. ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە وەکو کافران و بێ باوەڕان نەبن، وەئەیان ووتە هاوبیرو باوەڕو برایانی خۆیان کاتێ کەبەسەفر دەرنەچوون، وەیا کاتێ کەلەشەڕێکا گیانیان دەردەچوو وەیا دەکوژران دەیان ووت ئەگەر لەلای ئێمە بمابانەوە تووشی مردن نەدەهاتن و نەدەکوژران، ئەو هەڵوێستە چەوتەو نارێکە خوا گێڕاویەتی لەدڵی ئەوانا تاکو بەرهەمی بێباوەڕیەکەیان بنۆشن کەحەسرەت و نەدامەت و وێڵ و گومڕاییە ، بزانن و ئێوە حاڵێبن خوای پەروەردگار خۆیەتی دەژێنێ و دەمرێنێ ، وەخوای گەورە بەتەواوی کارو کردەوەیێ کەئێوە دەیکەن ئاگادارو چاوی قودرەتی لێیەتی و پێیەوە بینایە ..

هەروەها خوای گەورە لەهەمان سورەت واتە ال عمران لەئایەتی (١٦٢ - ١٦٣)

دا دەفەرموێ : ﴿أَفَمَنْ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَنْ بَاءَ بِسَخَطٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ(١٦٢)هُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾ .

ئایا یەکێ بەدوای بەرنامەو ڕێبازی خواناسین و خواپەرستی بکەوێ کەجێگەی ڕەزامەندی خودایە وەکو یەکێ وایە لەبەر گومڕایی و وێلی و نەفامی کەوتبێتە گەڕانەوە بۆ ژێر توڕەیی و قارو غەزەبی خوای گەورەوە وەسەرەنجام دوا شوێنی جەهەنـدەم و دۆزەخ بێ کەخراپترین و بەدترین چارەنووسە ، نەخێر وەکو یەك نین و خواناسـان و خواپەرسـتان چەندین پلەو پایەیان لەبۆ هەیە لەلایەنی خـودای پـەروەردگارا وەخـوای گـەورە بینایـە بەکارو کردەوەی هەموو کەسێ و چاوی قودرەتی لێیانە، چاکەو کارو کردەوەی خواناسان بەزایەو فیڕۆ ناچوێنێ بەباشترین شـێوە پاداشـیان دەداتـەوە .. هـەروەها خـوای گـەورە لەسورەتی شورا لەئایەتی (٢٧)دا دەفـەرموێ : ﴿وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الأَرْضِ وَلَكِنْ يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴾ .. ئەگەر خوای پـەروەردگار ڕزق و ڕۆزی یەکجار زۆر بکردایە بۆ بەندەکانی ئەوە دەستیان دەنایە قوڕقوڕاگەی یەکترو یەکتریان دادەڵۆسی و ڕانی یەکتریان دەهێناو وەپشتیان زیاتر لەحەق و ڕاستی دەکـرد ، بەڵام خوای گەورە ڕەحمەت و بەزەیی زۆرە بەنیسبەیەکی تەقدیرو ئەندازیـەکی گونجـاو پـڕ لەحیکمەت و دانایی داینـاوە، وەخوای گـەورە بەعەبـدو بەنـدەکانی خـەبیرو شـارەزایەو نەفسیات و سروشتیان دەناسێ و دەزانێ و، چـاوی قـودرەتی لێیانـەو دەیـان بـینێ .. هەروەها خوای گەورە لەسورەتی فاطردا لەئایەتی (٣١)دا دەفـەرموێ : ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنْ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴾ .. واتـە ئەوەی کەبەجوبرائیل دا ناردوومانە بۆلای تۆ لەئایاتی قورئان ئەوەیە حـەق و موتـابیقی واقیعە، حاڵی وەهایە ڕاستی ئەو کتێبانە دەسەلمێنێ کەلەپێش خۆیـدا هاتوونەتـە خـوار وەکو ئینجیل و تەورات، بەڕاسـتی خـودای پـەروەردگار بەرامبـەر بەبەنـدەکانی خـۆی ئاگادارو بینایە ..

## ٢٨ - الحكم

ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای بینەر ، ئەم نـاوە بنـچینەی - حکـم -ە واتە فەرمان .

الحکـم : واتـە خـوای گـەورە پەروەردگارێکـە فـەرمان دەکـا بەشـێوەیەکی دادپەروەرانەو ، راستەقینەیی هەموو شتێ لای ئاشـکرایەو رونـی دەکاتـەوە گـەورە یـا بچووك ، ساکار یا ئالۆز ، وەئەم زاتە میهرەبانـە سـتەم و زوڵـم لـەهیچ بـەدیهێنراوانی ناکات ، دادپەروەرێتی خوایە مۆڵەتی ئادەمیزادەکان دەدات لەژیانیاندا تا رون ببێتـەوە ستەمکار لەستەم لێکراو وەباش لەخراپ ..

وەهەر دادپەروەرێتی خوایە رۆژی قیامەت بەرپا دەکا بـۆ دانـەوەی هـەر مـاف خوراوێ وەتۆڵە سەندنەوە لەبەدکاران و زاڵمان .. جالەبەر ئـەوەی خـوا بەهـەموو شـتێ زانایـەو بینایـەو بیـسەرەو ئاگـادارە ، ئـەو پـەری دادگـەرێتی والەفەرمانەکانیـدا دەدرەوشێتەوە ، وەهیچ کەس و شتێ ناتوانێ خۆی لەئاستیا بـدات ، وەفـەرمان رەوایـە لەنێوان مەخلوقانیدا لەدونیاو رۆژی دوایـیدا ، وەخـوای گـەورە لەسـەر زومـانی نـووح پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفـەرموێ : ﴿ .. وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ ﴾ هود : ٤٥ .. واتە : بێگومان وادەی تۆ راسـتەقینەیە ئـەی خـوای گـەورە وەتۆ فەرمان رەواترینی فەرمان رەوایانی.

خوای گەورە دادپـەروەرێتی خـۆش دەوێ و فـەرمان بەئیمانـداران دەکـا ، وەك دەفەرموێ : ﴿..وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ..﴾ .. واتە گەر فـەرمان رەواییتان کرد لەنێوان خەڵکا دادپەروەربن ، وەخوای گەورە پـاش ئـەوەی رێگـەی پیـاو باشانی دانا بەخێرو بەرەکەت و شکۆمەندی، وەبەدبەختی و بێنرخی دانا بـۆ دوژمنـانی دادپەروەری و راستەقینە ،ئەوسا فەرمووی بەفرستادەکەی یا بەهـەر ئیمانـدارێ ، ئـەی چیبە درۆت دەهێختەوە بەرۆژی پاداش ، ئەی خوا فەرمان رەواترینی فەرماندار نییە ﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ﴾ التین : ٨ .. بلی ونحن علی ذلك من الشاهدین ..

خوای گەورە کەئادەمیزادەکانی خەلق کردووەو بەدیهێناوە وازیشی لێنـەهێناون

بەلکو پێغەمبەرانی بۆ ڕەوان کردوون و پەیامی بۆ هەناردوون وەك لەسورەتی (البقـرە)دا لەئایەتی (٢١٣) دا دەفەرموێ : ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ .. ﴾ .

خەلکان و و مەردووم یەك ئوممەت و نەتەوەبوون خوای پەروەردگار پێغەمبـەرانی بۆ ڕەوانە کردوون بەمزگێنی و موژدەدەرو بەبێدارکەرەوەو ترسێنەر، وەلەگـەڵ ناردنیانـە پەیام و نامەی ڕەوان کردووە بەحەق و دادپەروەریتی، بۆ ئەوەی حـوکم بکـات لەبـەینی خەلکان و مەردووم و لەدەردو بەلآی جیاجیای و تەفرەقە نەجاتیان بدات و ڕاستیان بـۆ ڕوون بکاتەوە..

خودای پەروەردگار خۆی حەکیم و کارزانە بـەزەیی و میهرەبانـە ئادەمیزادەکـان بەیەك چاو تەماشا دەکاو خۆشیانی دەوێ، وەخاوەن زانیارییـە بەهـەمـوو شـتێ چـاوی بینای لەگشت بەدیهێنراوانە، لەهەمان کاتیشا حەق پەروەرو حەق ویـستە هـەر خۆشـی پەروەردگارو پەرستراویانە، هەر خۆشی شایەستەو لایەقە بەفەرمان ڕەواییتی، حـەقێکی ڕەوای خۆیەتی، هەر خۆی بەماهیەتی هەموو شتێ دەزانێ هەر خۆشی خـاوەنی هـەموو شتێکە .. زانیاری دیارو نادیاری لەلایە کەم و کوڕی نیـەو ڕووی تێناکـات ، خۆشـی و بەختەوەری ئادەمیزادەکانی دەوێ .. وەکو ئادەمیزاد نیـە کەخۆپەرسـتە گـەل پەرسـتە کەس پەرستە بێ ڕەحمە کۆڵەوارە زانیاری تەواوی لەلا نیە غەیب نازانێ خاك پەرسـتە ، تابیعی هەواو ئارەزووی خۆیەتی ، حەقی وای لەسەر ئادەمیزادەکانی تر نیـە، لەتـەواوی هەست و نست و ماهیەتی زاهیری و باطینـی مرۆڤەکان نازانێ، لەبەر ئەو هەموو کەم و کوڕیانەی بەکەڵکی فەرمان ڕەوایی نایێ ، وەهەر کاتێ بەفرو فێڵ و زەبرو سـتەمەوە یـا بە مەکرو پیلانەوە خۆی داسەپێنێ و خەلکان و مەردووم ناچار بکات بەفەرمان ڕەوایێتی خۆی، ئەوە لەغەیری دەردەسەری و بەلآ هیچی تر زیـاد ناکـات وەلەغـەیری دڵەراوکـەو فەسادی ڕوح و بەدبەختی بەرهەمێکی تری نیە ..

خوای گەورە لەسورەتی (ال عمـران) دا لەئایەتـەکانی (٤٤ ، ٤٥ ، ٤٧) ڕونـی کردۆتەوە کەوا ئەوەی پشت لەبەرنامەی خودا بکات و خوای گەورە بەحەکـەم دانـەنێ،

ئەوەی خوا رەوانی کردووە فەرمانی پێنەکات، ئەوە خۆی خستۆتە دونیای کوفرو زوڵم و فوسقەوە ، چونکە سنوری حەقی ترازاندووە سەری لەخۆی شێواندووەو کەوتۆتە دوای هەواو ئارەزوی خۆیەوە، خەڵکان وسەردوومانی بەدبەخت کردووە ، خوای گەورە لەسورەتی ئەنعامدا لەئایەتی (٥٧)دا دەفەرموێ : ﴿ قُلْ إِنِّي عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَكَذَّبْتُمْ بِهِ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ ﴾ .. واتە بفەرموو بڵێ من لەسەر بەڵگانی رەوشەن و راست و رەوانم کەلەپەروەردەگارمەوە بۆم هاتووەو، وەمن تەنها ئادەمیزادێکی وەك ئێوەم بەس ئەوەیە خوای گەورە کردوومی بەپێغەمبەرو وەحیم بۆ دەنێرێ، وەهەرچی ئێوە پەلەی لێدەکەن و داوای دەکەن لەوەی من نیە، خوای گەورە هەر خۆی تاکە بەرێوەبەرو پەروەردگارە هەرچی بوێ دەیکا، کارەکانی پڕحیکمەت و دانایین، وەفەرمان رەوایی و حوکم بۆ کەس نیەو بۆ کەس نابێ تەنها بۆ خوای گەورە نەبێ ، خۆی باس و خواسەکانی حەق و راستیان بۆ روون دەکاتەوە هەر خۆی باشترین و خێرترین فەرمان رەوایێکە، وەلێککەرەوەی راستیو ناڕاستیو حەق و ناحەقەکانە .

خەڵکانی سەر زەوی بەتێکڕا ئەمڕۆ کەتالآوی دەستی حاکمێتی ئادەمیزادن، بەختیاریو ئاسوودەییان بەفەنا چووەو ستەم لێکراوو مەزڵومانیان زۆر کردووە.

هەروەها خوای پەروەردگار لەسورەتی یونس لەئایەتی (١٠٩) دەفەرموێ : ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ ﴾.. بەدوای وەحی و بەرنامەی خوا بکەوە وەئارام و صەبرت هەبێ هەتاکو پەروەردگارت حوکم دەکات کەخۆی باشترین فەرمان رەوایێکە .

حوکم و فەرمان رەوایی لەدونیاشدا هەر هی خودایە هەر سونەنانی خوای گەورەن لەئارادان لەم کەون و بونەوەرە ئەگەر زاڵمان و ستەمکاران و لەخوا بێئاگایان دەسەلآتێکی کەم و کاتی یان پێدراوە ئەوەش لەدەرەوەی بازنەی حوکمی خوا دەرناچێ و هەر لەناو ئەو حوکمە سونەنانەی خوای گەورەدان کەپڕیەتی لەحیکمەت و دانایی، وەسەرەنجامیش لەرۆژی دواییدا حوکم و فەرمان رەوایی هەر بۆ خوایەو کەسێکیتر نیە

هیچی بەدەست بێ بۆ کاتێکی کەمیش بێ ، وەکو خوای گەورە لەسورەتی (الحج)دا لەئاتی (٥٦-٥٧) دا دەفەرموێ : ﴿ الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ(٥٦)وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ ﴾ .. لەرۆژی دواییدا موڵك و سامان هەر هی خوایە هەر خۆی تاکە فەرمان رەوایەو هەرخۆی حوکم دەکا لەبەینی ئادەمیزادەکان جا ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکیان ئەنجام داوە خوایان کردۆتە فەرمان رەوای خۆیان لەژیانی دونیایاندا ئەوە دەچنە ناو بەهەشتانی پڕ بەهرەو نیعمەت ، وە ئەوانەی بێباوەڕبوینە وەئایات و نیشانانی خوای گەورەیان بەدرۆ داناوە، وەبەدوای هەواو ئارەزووی خۆیان کەوتوون و رازی نەبوینە بەفەرمان رەوایێتی خوای گەورە ئا ئەوانەن دەچنە ناو ئاگری جەهەندەم و دۆزەخەوە کەتێیدا ئازارو عەزاب دەدرێن سوك و ریسوا دەبن تێیدا ..

سروشتی ئادمیزاد وایە چۆن لەرەنگ و روخسارا کەسێ لەکەسێ ناکاو وەك کەسیتر نیە ئاوەهاش لەئاراو بیروباوەڕدا کەسێ سەد لەسەدی وەکو ئەوی تر نیە جالەئەنجامی ئەو هەموو جیاجیاییەدا ، ئەگەر ئادەمیزاد لەئارائو رەئیەکەی خۆی تەسلیم بەخوای گەورە نەکات وەبۆ خوای گەورەی نەهێڵێتەوە نەهەر برایەتی و خۆشەویستی و تەبایی دروست نابێ بەڵکو ئەوپەڕی نیزاع و ململانێ و کێبەرکێ دێتە کایەوە، کەبەدبەختی و ماڵکاولی نەبێ هیچیتر ئەنجامەکەی نیە .

خوای گەورە لەسورەتی (المائدة) دا لەئایەتانی (٤٩ - ٥٠)دا دەفەرموێ : ﴿وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنْ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ(٤٩)أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنْ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ .

کاتێ ئەو ئایەتانە دابەزین کەهەندێ لەئەحبارەکانی یەهود ویستیان بەمەکرو حیلە پێغەمبەر (ﷺ) بترازێنن لەئاین و بەرنامەی خودا، جاخوای گەورە فەرمووی حوکم و فەرمان رەوای بکا لەبەینیانا بەوەی خوای پەروەردگار دایبەزاندووە ، وەبەدوای

هەواو ئارەزووی بێباوەڕان مەکەوە بێداربەو حەزەری خۆت وەرگرە لەوەی کەتووشی فیتنەت نەکەن، لەوەی کەپشت بکەیتە هەندێ لەفەرمانەکانی خوای گەورە کەبەلاتی دابەزاندووە ، جائەگەر بەحوکمی خودا رازی نەبوون و پشتیان تێی کرد ئەوە بزانە خوای پەروەردگار دەیەوێ توشی تۆڵەیان بکات و تۆڵەیان لێ بسەنێ و بەهرەمەندیان نەکات بەهیدایەت لەبەرئەنجامی هەندێ گوناه و تاوانیان ، بەڕاستی زۆر لەخەڵکان و مەردووم سنوری یاسای خودا نازانن و سنوریان بەزاندووە بەدونیای فوسق دەرچوون دا کەوتوون ، ئایا حوکم و فەرمان ڕەوایێتی نەزانین و جەهالەت دەخوازن و خواستیان لێیە ، باشە کێ هەیە حوکم و فەرمانی لەخوای پەروەردگار باشتربێ بۆ گەلێ کەتێی بگات و بەڕاستی قەناعەت بێنێ ..

بەڵێ ئەگەر هەندێ لەفەرمانەکانی خوای گەورە گوێڕایەڵی بکەیت و هەندێکی تریش پشت گوێ خەی ئەوە دیسان تووشی فیتنەو فوسق هاتنەو فەوتانەو کەوتنە دوای نەفس و هەواو شەیتانە، بەڵکو دەبێ لەهەموو بوارەکانی ژیان خوای پەروەردگار بکەیت بەفەرمان ڕەوای خۆت و، هەموو فەرمانەکانی وەکو یەك سەیرکەیت ، ئەمە لەلایێ لەلایێ تر دەبێ بەبیروباوەڕو قەناعەت و سینەی فراوانەوە پێشوازی لێبکەیت و لەقوڵایی دڵەوە پێی رازی بیت ..

وەك خوای گەورە لەسورەتی (نساء)دا لەئایەتی (٦٥)دا دەفەرموێ : ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ .

واتە نەخێر قەسەم بەپەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ئیمان و باوەڕ ناهێنن تاکو نەتکەن بەفەرمان ڕەواو، حوکم و فەرمان نەدەنە دەست تۆ لەهەموو کێشەو گیروگرفتێ پاشانیش دەبێ دڵ و دەرونیان پێوە ئاسودەبێ و، نارەحەتی و نارەزایی نەبێ لەدڵ و دەرونیانا لەو حوکمەی کەکردووتەوە، بەدڵ و بەگیان و سینەی فراوانەوە پێشوازی لێبکەن و ملی بۆ کەچ بکەن و تەسلیمی ببن .

## ٢٩ – العــدل

ناوێکە لەناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای فەرمان ڕەوا .

العدل : واتە خوای گەورە دادپـەروەری بێسنوورو هاوتایـە لەهـەموو کاروبـارو فەرمانێکەوە ، وەلەچارەنووسدا هەموو کێشەیێ بەدەستی خوای میهرەبانەوە دەبـێ جـا ئەو پەڕی عەدالەت و دادپەروەری تیا ئەنجام دەدرێ و ، وەهیچ شتێ نیـە دادپـەروەرێتی خوای تیا ماتڵ بێ ، بۆ دادپەروەرێتی خوا ئەمەندە بەسە کەدەفەرموێ : ﴿فَمَنْ يَعْمَـــلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه(٧)وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه ﴾ الزلزال : ٧ – ٨ .

واتە : ئەنجامی کاری سوودو زیان وون نابن و دەبینرێن گەر بەئەندازەی میسقاڵە زەڕەڕەیەکیش بێ – کەکەمتر لەوەیە بەچاو ببینرێ – جا هەریەکێ پێی هەڵسێ بـەبێ هیچ جیاوازیەك لەئادەمیزادێکەوە بۆ یەکێتر ، یـا لـە پەرییەکـەوە بـۆ پەریـەکێتر .. وەئەو یاسایەی کە بۆ ئـادەمیزادی ڕەوانـە کـردووە وەك بەخشـشێکی پـڕ عەدالـەت و دادپەروەرییە ، کەئەو پەڕی بەزەیی‌و ڕەحمەت و کۆمەکییە بەکۆمەڵێ ئادەمیزاد .. جا خوای گەورە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزەیەو فـەرمان دەکـا بەئیمانـداران کەئـەم سـیفەتە لەخۆیانا بهێننە دی، کەدەفـەرموێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْـــسَانِ وَإِيتَـــاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ النحل : ٩٠ .

لەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان بەسێ شت کراوەو ، وەقەدەغـەو یاسـاغی سـێ شـت کراوە ، ئەو شتانەی خوا فەرمانی پێ کردوون :

١ – (العدل) ە یانی دادپەروەری و میانەکاری لەهەموو شتێکدا نەزیادە ڕەوی و نەکەم کردنەوەی شت ، جا بۆ بیروبـاوەڕیێ یـا بـۆ کـارو کـردەوە ، لەگـشتیانا ئـەرك و فەرمان و واجبە، کە پەیڕەوی بکرێ و ئەنجام بدرێ بۆ نمونە ، عەدل لەبیروباوەڕا بریتییە لەیەکتایی خوای گەورە بە (لا الـە الا الله ) وە ئەم تاك پەرستییە دادپەروەری‌و میانەیە ، چونکە لای ئینکاری خواوەند – پـەنا بـەخوا – پـەك کەوتنـەو پێـچەوانەی ڕواڵـەتی بونەوەرەو شەرمەزاری بەڵگەو دەلیلـی عـەقلی و نـەقلی و عیلمییـە ، لەلایـەکێترەوە

نیسبەتدانی پەروەردگار بەلای زۆر کردنی عیبارەتە لەبتپەرستی و کەوتنە شوێنی خۆرو گاو ئاگرو ئادەمیزاد پەرستیو .. هتد . وەئەنجامی ئەمانە شوێنەواری نەبڕاوەی بوونەوەر بۆلای ئەم هەموو پەرستراوە دروست کراوە بێ نرخانە دەبات، ئەمەش کوفرو هاوبەشدانانی لۆمەکراوی نابەجێیەو پێچەوانەی بەڵگەکانی عەقڵی و نەقڵیو عیلمینە ، کەوابێ ئیمان بەو خوایە کەتاك و تەنیایە دەبێ بەئەوپەڕی عەدل و ڕەوایی لەدادپەروەریدا .. یا بەمانایەکیتر بڵێین : بڕیار بەوە کەخوا نیە گومڕاهی و نەزانینە وەبڕیار بەوە کەبڵێین خوا هەیە بەڵام لەشەو لاشەییەیە - واتە جیسمانییە - ئەمەش بۆ خوای بونەوەر نوقسانیەو نابەجێیە ، بەڵام گەر بڵێین خوا زاتێکە مەوجودە (واجب الوجود)و بێ هاوتاو وێنەیەو ، ناوە جوانەکانی لەباوەش گرتووە وەك لەبونەوەرەکەی ئەدرەوشێتەوە ئەمە دەبێ بەعەدل و داد پەروەری و ڕاستی ..

وەلەباسی بەندەکانی خوادا گەر بڕیار بدەین کەهیچ پەیوندیان بەکردەوەی خۆیانەوە نییە ، ئەوە دەبێ بە (جەبر) کەپێچەوانەی و ژیرو بیرە ، وەئەگەر بشڵێین بەندەکانی خوا خالیق و دروستکەری کردارو (افعال) فەرمانی خۆیانن ، ئەمەیش بەئاشکرا راست نییەو درۆیە ، چونکە ئادەمیزاد گەر خۆی کردەوەی خۆی دروست بکردایەو ئەنجامی دابایە وای دەکرد کەلەهەموو کارو کردەوەی لەو پەڕی باش و چاکی بایەو بێ وێنەبایە، یا هەر نەبێ کەم وێنەبایە لەباشی و چاکی و جوانی و ڕێکی .. بەڵام بڕیار بەوە کەبەندە پەیوەندی بەکردەوەی خۆیەوەهەیە بەئیعتباری تێکۆشان و جوزئی - بەشی - ئیختیاری ئەمە راستەو دەبێ بەعەدل و دادپەروەری ، وەژیرو بیرو فیترەت پێیەوە ئاسوودەن .. وەلەباسی تاوانەوە گەر بڵێین خوای گەورە لەبەندەی خۆی ناپێچێتەوەو ناپرسێتەوە لەسەر گوناە و تاوانباری ئەمە مانای دەرچوونە لەرژێم و یاسای حەق و دادپەروەری ، وەئەگەر بڕیاریش بدەین بەوە کەبەتاکە گوناهێ بەندەکەی ئەشکەنجە ئەداو ئەیسوتێنێ هەتا هەتایە ئەمەیش دوور لەراستییەوە وەئەمە کەبڵێین ئەگەر خوا بەندەی تاوانبار عەفو بکا ئەیکا وەئەگەر سزای بدا دەیدا ،بەگوێرەی ئەو

تاوانە ، کەئەنجامی داوە ، وەپاشان دەیخاتە بەهەشتەوە ئەمە عەدل و راست و دروست و دادپەروەرییە ..

وەلەبابەتی بنچینەی ئاینە پێشوەوکانەوە بار قورس کردن لەدینی موسادا - علیه الصلاة والسلام - زۆر بووە ، وەئاسانکاری لەدینی عیسا - علیه الصلاة والسلام - زۆر بووە ، بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەوەك یەکەم توندی تێدایە ، نەوەك دووەم ئاسانکاری زۆر تێدایە ،بەڵکو ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەگشتی ئایینی ئەوپەڕی رەفتاری عەدل و دادپەروەری تێدایە ..

٢ - لەوانەی خوا ئەمری پێکردووە (ئیحسان)ە کەزیادە چاکەیە لەدادپەروەریتیدا ، وەزیادە لەعەدالەت لەبارەی تۆڵە سەندنەوە - القصاص - کەبریتییە لەلێخۆش بوونی تاوانبار ، وەلەبابەتی بەندایەتی بریتیە لەکردنی مەندوبات وەکو نوێژو رۆژی سوننەت و خێر کردن (بێجگە لەزەکات کەشەرك و واجبە) وەدەستگرۆیی هەژارو گەدە .. هتد .

ئەمانە شتی سیفاتی جوان و پەسەندن ،هەتا لەبارەی چاودێری خوای گەورەوە دەگاتە ئەو پایە کەوەها بەندەیی بکا ، وەك ئەوە چاوی وا لەخودایە ، ئەگەر چی ئەم خواوەند نەبینێ ، وا خوا چاوی لەوایە ، وەك فەرموودەی پێغەمبەر - ﷺ - کەدەفەرموێت : } أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك { رواه مسلم .

وەبەجێ گەیاندنی ئەم ئیحسانە لەهەموو کارو فەرمانێکدا دەبێ بەهۆی ئەوەکە ئادەمیزاد هەر کارێ ئەنجام دەدا بەو پەڕی دڵسۆزی و پاکی جێبەجێی بکا ..

٣ - لەوانەی کەخوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمانی پێکردووە ( إيتاء ذي القربى) واتە چاکەکردن لەگەڵ خزم و کەس و کار ، وەلەڕاستی و رواڵەتدا ئادەمیزاد لەسەر زەوی وەکو دارێکی سەوز وایەو ، وەداریش مەبەست و ئاواتی سودی لێ دەخوازرێ جا بەرەکەی بێت یان سێبەر یا لقەکانی ، یاخود هەموو دارەکە ببڕێت و بەکار بێت بۆ خێرێ وەکو خانوویەك یا پردێ یا تەختەیێ ، گیان فیدا کردنی ئادەمیزاد

لەجیهاندا نموونەیە بۆ برینی دارەکـە بـۆ بینایـەکی بەسـوود ، وەئەگـەر خـۆی مایـەوە سوودەکەی بریتیە لەگەیاندنی خێر بەمەردووم ، وەلەگشت خەڵکی دونیا خزم و کـەس و کار لایەق ترن، بۆ ئەوەیە کەیارمەتی بدریّ بۆیــە خـوای گـەورە فـەرمانی کردبەسـەریا وەئەو شتانەیش لەم ئایەتەدا خوای گەورە قەدەغەو یاساغی لیّ کردوون سیّ شتن :

١ / فەحشایە ، پێویستە بزانین کەچوار هێز هەیە لەگەڵ بوونی ئادەمیزادا وەکو ئاردوو ئاوو خویّ بەیەکەوە شێلراون کەبریتین لەمانە :

أ - هێزی خاوەنێتی ژیری (العقلیة الملكیة) کەهەمووی هەر خێرەو چاکەکاری و رەوشتی جوان لیّیەوە هەڵ دەقوڵیّ .

ب - هێزی ئارەزووی ئاژەڵێتیی - الشهوة الحیوانیة - جۆرەهـا شـت لەچـاکەو خراپە لیّیەوە بەدی دیّ .

جـ — هێزی توڕەیییەو هەڵچونی دڕندەیی (قوة الغضب)، کەئەمـە زیـانی زۆرە

د — خەیاڵاتی شەیتانی (الوهمیة الشیطانیة) .

جا لەهێزی شەهوەتەوە کەجڵەوگیری نەکرا کردەوەی بەدو ناشیرین پەیدا دەبـیّ ، وەکو زیناکردن و دەست بـردن بـۆ ناموسـی خـەڵکی، کـەدەبیّ بـەهۆی گـەلیّ دەردی کۆمەڵایەتی وەکو ئاشوب و فیتنەو کوشتارو تێکدانی پشت و رەسەن و، رەگـەزو لـەناو بردن و کەم کردنی خزمایەتیو، هەروەها تێکچوونی باری تەندروستی ئەمـە خـوا نـاوی بردووە بە (فحشاء) .. وەلەهێزی توڕەیی و قارەوە هەر چی خراپەکاری و زیان گەیاندنـە بەمەردووم دەگات، بەجۆریّ کەمەردووم ئینکاری ئەکات ،وەکو کوشتن و برین و دەسـت وەشاندن و جنێودان .. هتد ، وەئەم کارانە خوای گەورە کۆی کردونەتەوەو نـاوی بـردووە بە (منكر) .

وەلەهێزی وەهمیەی شەیتانیەوە ئەوە پەیدا دەبیّ کەئادەمیزاد بەردەوام هـەوڵ و کۆشش ئەکا بۆ ئەوەی بەرزبێتەوە بەسـەر باقی ئادەمیزاد ، وەخۆی بکا بگەورەو فەرمان

دار ، وەئەگەر یەکێ لەفەرمانی دەرچوو ستەمی لێبکاو ماڵی تاڵان بکاو موڵکی دابگرێ ، ئەمانەیش ناوبراون بە (بغي) واتە لەسنوور دەرچوون و زیادە ڕەوی بەسەر مەردووما ..

جا کاتێ ئادەمیزادی موسڵمان جێگیرو خاوەن ئیستیقامەت بوو لەسەر بەجێهێنانی عەدل و ئیحسان و خزمەت کردنی خزم وکەس و کار ، وەلەسەر تەرك کردنی بەکارهێنانی هێزی نارەزوو لەکاری فاحیشەدا ، وەهێزی توڕەیی‌و قاری ئاژەڵی لەئازاردانی خەڵکدا ، وەهێزی وەهمیە لەخۆ بەرزکردنەوە بەسەر باقی ئادەمیزادا ، ئەمە بەڕاستی سەرکەوتوو موسڵمانە ، وەخوای گەورە ئامۆژگاریان دەکات بەهیوای ئەوە کەبیربکەینەوە لەئەنجامی کارو فەرمانی خۆمانا (تائێرە بەکورتی باسی ئایەتەکە بوو)

بەڕاستی ئەم ئایەتە لەهەموو ئایەتێ سنوورەکەی فراوانتر و داگیرترە بۆ بیرو باوەڕو کردەوەی چاکو خراپی ئادەمیزادو رەوشتی جوان ..

وەخوای گەورە فەرمان ئەدا لەقسەو گوفتاردا داد پەروەریتی ئەنجام بدەین لەنێوان خزم و دۆست و ناسیاردا ، بەبێ هیچ جیاوازیەك ، وەك دەفەرموێ : ﴿..وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى .. ﴾ الانعام : ١٥٢ .

واتە کاتێ کەوتنە ئاخاوتن و دوان دادپەروەربن ئەگەر خزم و خۆیشتان بن .

## ٢٠ - اللطيف

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای دادپەروەر ئەم ناوە (٦) جار هـاتووە لـەقورئانی پیرۆزدا کەمەبەست خوای گەورەیە ، وەبنچینەی ئـەم نـاوە - لوطـف -ە واتـە نـەرم و نیانی ..

اللطیف : واتـە خـوای پـەروەردگار خوایێکـە زۆر نـەرم و نیـان و بەبەزەییـە بەرامبەر بەمەخلوقاتی ، بەتایبەتی ئادەمیزاد وەمۆڵەتی ئەوان کەسانە دەدات کەستەم دەکەن بەنەزانی ، وزۆریەیان تێیـدا هیدایـەت دەدات و ، ئـەیان کاتـە هـەڵگری ئـاڵای ئاشتیو دادپـەروەری ، ئـەوانیش بـاربوو تۆڵـەی رابردوویـان دەکەنـەوە بەچـاکەکاریو پەشیمان بوونەوە ، جائەگەر ئەم نەرم و نیانیو لەسەر خۆییـەی خـوای گـەورە نەبوایـە ئەوە زۆربەی ئەوانەی کەهیدایەت دراون بەڕاستی شادمان نەدەبوون و سەرەڕای ئەمـەش دەبونە سوتەمەنی دۆزەخ .

خوای گەورە بەهۆی بەشـە هەسـتیارەکانەوە هەسـتی پێناکرێـت ، بـەڵام ئـەو بەنهێنی و نەرمی و ووردی هەموو شتێ دەزانێ ، وەئـەم لەسـەرخۆییەو نەرمیـەی خـوا بەخشـە بۆ بەرەی ئادەمیزاد چونکە خـوای گـەورە بـەختیاریو ئاسـودەیی بەنـدەکانی دەوێت لەدونیاو قیامەتا . خوای بەخشندە دەفەرموێ : ﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ ..﴾ شوری : ١٩ .

بێگومان خوا بەخواستی خۆیو بەهەرشتێ بیەوێ بەلوتف و میهرەبانە ، وەئـەو خوایـە زۆر زانـاو دانایـە .. وەهـەروەها میهرەبـانی خوایـە کەهەرچی نـازو نیعمەتـە ئەیبەخشێ بەهەر کەسێ بیەوێ ، هەروەها لوتفێتی خوایـە کەبونـەوەرەکانی نـارایش و جوانی و رزق و رۆزی و بەخشش و نیعمەتیانی پێداوە ، لەمانە بەتایبەتی زینـدەبوەکان لەگیاندارانی جۆراو جۆر .

خودای لەتیف لەسورەتی الانعام دا لەئایـەتانی (١٠١ - ١٠٣)دا دەفـەرموێ :

﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ(١٠١)ذَلِكُمْ اللَّهُ رَبُّكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ(١٠٢)لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾

زاتی باری خۆیەتی ئاسمانەکان و زەوی هێناوەتە کایەوەو بەدیهێناون و پێداویستی بوونیانی پێبەخشیوەو خاوەن ئەوپەڕی دەسەلاّت و شکۆمەندی‌یەو بەڕێوەیان دەباو هەرخۆی خاوەنیەتی‌و سستی و کەموکوڕی روی تێناکاو شایەستەی نیە ، لەئادەمیزاد ناکاو وەکو ئەو پێویست بەرۆڵە نیەو پێویستی پێنابێ و ، جاخاوەن رۆڵە نیەو گەرەکی نیەو گەرەکی نابێ ، خاوەن خێزان نیەو پێویستی پێ نیەو شایەستە نیە ، وەلەئادەمیزاد ناچێ و هەروەها لەهیچ شتێ ناچێ و ناکا ، هەموو مەخلوقێکی بەدیهێناوەو رێکی خستووەو لەباری خستووەو ئەندازەی بۆ داناوەو سەرەتاو کۆتایی بۆ بڕیار داوە رەنگێکی دەبەرا کردووە ، لەژێر تاکە دەسەلاّتی خۆیا ، بەڕێوەی دەباو ، سەرپەرشتی دەکاو ، پێداویستیەکانی بونیانی بۆ مایەسەر کردووەو دەکا ، هەر زاتی پاکی خۆشی ، بەهەر هەموو شتێ خاوەن زانیاری‌یەو، تەنها خانەیەکی زیندووش نیە ، لەدەرەوەی زانستی خوای گەورەبێ ، وەیان ئەتۆم و زەرەرێ نیە..

جا ئەو زاتەیە (الله)یەو خودای ئێوەیەو پەروەردگارتانەو بەڕێوەتان دەباو سەرپەشتیکاری هەموو کەون و بونەوەر دەکاو هەر خۆشی ئیلاهەو پەرستراوی ئێوەیەو بەغەیری ئەو پەرستراوێ تر نیە ، هەر هەموو مەخلوقێکی بەدیهێناوەو هەر خۆیەتی خاوەن دەسەلاّتی بێوێنەو ، خالقێتی هەر بەدەستی خۆیەتی هەرچی دێتە ئاراوەو دێتە خەلق بوون ، هەر خۆیەتی بەدیان دێنێو ، خەلقیان دەکاو ، بەڕێوەیان دەبا ، دەی کەواتە ئێوەش تەنها بەندایەتی ئەو بکەن و هەر ئەو بپەرستن ، زاتی باری هەر خۆیەتی بەسەر هەموو شتێکەوە ، وەکیلەو گشت شتێ پالّ دەداتەوە بەلایەوەو، ئومێدو هیواو پێداویستی هەر بەوەو ،لەوی دەترسێ و یادی دەکاو حەزو ئاواتەکانیان لەو دەخوازن ..

چاوو بیناكان لەو پلەیە نزمترن كەبتوانن دەركی زاتی باری بكەن و بەماهیەت و زاتی بگەن، بەلاّم زاتی باری چاوی بیناو زانیاری و زانستی بەهەر هەموو شتیّ هەیە وەخۆی خاوەن كەرەم و لوتف و شارەزاو خەبیرە..

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی حەج دا دەفەرمویّ : ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ(٦٣)لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴾ الحج : ٦٣ ـ ٦٤ .

زاتی باری دەیەویّ ئادەمیزاد بێنێتەوە واقیعی خۆی و هۆشی بێنێتەوە مێشكی خۆیاو لەدونیای مەشغەلّەت و غەفلّەت و وەسوەسە درۆیینە شەیتانەكان نەجاتی بداو ، سەرەنجی رادەكێشیّ كەبگەرێتەوە واقیعی خۆیو، بۆ خۆیو دەوروبەری خۆی بروانیّ، ئەوەتە پێی دەفەرمویّ ئایا نابینیو تەماشا ناكەی و نازانی كە بێگومان خوای گەورەیە باران دەبارێنیّ لەئاسماناو ، زەویو زارەكانی پیّ سەوز دەكاتەوەو، دیاردەی ئەو كەون و بونەوەرە ، نویّ كردنەوەی بەهارو زیندووكردنەوەی زەویەكان و، خۆش كردنی ژیان و، بیّگومان ئەوە دەخاتە روو، كەزاتی باری خاوەن لوتف و كەرەمە شارەزاو خەبیرە بەهەر هەموو شتیّ ، بەراستی خوای گەورە لوتف و كەرەمی زۆرە بەناوەرۆك و ناواخنی هەموو شتیّ دەزانیّ و خەبیرە ، هەرچی لەئاسمانەكان و زەویدا هەیەو مولّكی خۆیەتی و هی ئەوەو بۆ ئەوەو، هەر خۆیەتی خاوەنی هەموو شتیّو، بێگومان زاتی باری دەولّەمەندی بیّسنوورەو وەبیّ نیازو پێویستیە كەمو كورِی و ناتەواوی شایەستەی نیە ، شكۆمەندو خاوەن كەرەم و ستایش بۆ كراوەو سوپاس گوزارە ، هەروەها خوای گەورەو میهرەبان لەسورەتی لوقماندا لەبارەی ئامۆژگاریەكەیەوە بۆ كورِەكەی و رۆلّەكەی بۆمان دەگێرِێتەوەو دەفەرمویّ : ﴿ يَابُنَيَّ إِنَّهَا إِنْ تَكُنْ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ فَتَكُنْ فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ لقمان : ١٦ .
واتە ئەی رۆلّەكەم بزانە ئەگەر هەندی میسقالە دانەییّ لەخەرتەلە یالە هەرچی بیّ لەكاروكردەوەو هەلّوێست و ووتارو گوفتاردا جا لەناو بەردێكا بیّ یا لەئاسمانابیّ یا لەژێر

زەویا بێ یالەهەر شوێنێکا بێ لای خوای گەورە وون نابێو حیسابی خودای هەر لەسەرەو، خوای گەورە خاوەنی ئەو کارو کردەوەیە فەرامۆشی ناکاو بەو ئەندازەیە هەڵی دەسەنگێنێ و حیسابی بۆ دەکا .

بەڕاستی و بێگومان خودای گەورە خاوەن لوتف و کەرەمەو بەناوەڕۆك نـاواخنی هەموو کارو کردەوەیێ دەزانێ و لێی شـاراوە نییـەو زانـاو خـەبیرە پێیانـەوە .. ئـەو ئامۆژگارییەش وا دەگەیەنێ کەئادەمیزادی موسڵمان ئیهمال و موهمیـل نـەبێ، کـارو کردەوەو وتەی گچکەو کەمیش لەبەرچاو بگرێ ، چونکە خەراپەو تاوانـە گـەورەکانیش لەسەرەتاوە لەسـاکاریو کـاری بـچوکەوە دەسـت پێـدەکاو تەشـەنە دەکـا ، ئـەوەشمان لەبیرنەچێ هەر بەدانە شقارتەیێ پەرێزێکی فراوان دەسووتێ و گەلێ قینەو ئاشوبی تـری بەداوادا دێ ..

هەروەها خوای گەورە لـەبارەی ئـەم سـیفەتە بـەرزەی خۆیـو ئاشـکراکردنی و راگەیاندنی بەعالـەمی مـەردووم دا لەسـورەتی ئەحزابـدا زنجیرە ئامۆژگاریـەکانی بـۆ خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و وەبۆ باقی ئافرەتانی موسڵمانان دەفـەرموێ : ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ الاحزاب : ٣٤

واتە کات و وەختی خۆتان بەفیڕۆ مەدەن و ڕادەی ڕۆشنبیریێتی خۆتان باڵاکەن و، یادکەنەوەو بخوێننەوە لەماڵەکانی خۆتانا لەئایەتانی خودای گەورە لـەکیتابی قورئـان و بونەوەرا لەحیکمەت و دانایا ، بەڕاستی خـودای گـەورە خـاوەن لوتـف و کەرەمـە بـۆ کەسانێ یادی دەکەن و بەرەو دونیای هۆشیاری بێداری دەکەونـە رێ ، وەزانـاو شـارەزاو خەبیرە بەکارو کردەوەی پیاوچاکاناو بەندایەتی هۆشـیارو خواپەرسـتانا ، هـەوڵ و کـارو رەنجیان فەرامۆش ناکاو پاداشیان دەداتەوەو رازییان دەکاو خۆشیانی دەوێ .

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (شورا)دا لەئایەتی (١٩) دا دەفەرموێ : ﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴾ واتـە خـودای پـەروەردگار خـاوەن

لوتف و کەرەم و نەرم و نیانە بەرامبەر بەبەندەکانی و کەرەم و نیعمەتانی زۆری بەسەرا دارشتوون و هۆو ئەسبابی رزقی زۆری بۆ مایەسەر کردوون و بەخواستی پڕ لەحیکمەت و دانایی خۆی رزق و رۆزی دەبەخشێ بەهەریەکێ لەبەندەکانی، خۆی خاوەن هێزێکی لەبن نەهاتووەو هیچ هێزێ نیە خۆی لەئاستی بدا یا رێرەوو سونەتی تێك بداو ، خۆی تاکە هێزە لەبەرێوەبردنی کەون و بونەوەرا، شکۆمەندو ئازیزو تواناداره بەرزو پاك و کارزانە..

هەروەها خوای بالادەست لەسورەتی (الملك)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ(١٢)وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوْ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ(١٣)أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ(١٤)هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ ﴾ الملك : ١٢ - ١٥ .

واتە بەڕاستی و بێگومان ئەوانەی کەلەخوا دەترسن و، خاوەن خشوعن و ملکەچن لەبەرامبەر فەرمانەکانی خوای پەروەردگاریان لەپەنهان و نادیارو، کەچی لێشیان دیار نیەو غەیبە بەلام بەژیرو بیریان حالێن کەپەروەردگار چاوی قودرەتی لێیانەو لەبەرچاوی خودا بەهیچ شێوەیێ ناتوانن وون بن، گەرچی ئەوانیش پەروەردگار نەبینن و نابینن، لەگەلێ ئەوەش هەر لێی دەترسن و خۆشیان دەوێ و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن و، جا لەبۆ ئەو جۆرە کەسانەیە مەغفیرەت و رەحمەت و بەهەشتانی پڕ نیعمەت و ئەجرو پاداشتی گەورە، خودای پەروەردگار ئەوپەڕی دەسەلات و دادپەروەری لەلایەو جا ئەگەر ووتارو رەفتارتان بەنهێنی ئەنجامی بدەن یاخود ئاشکرای بکەن ئەوە خوای بالادەست زانایە بەسینەو دلێ و دەروونەکان بەخواست و خەیالات و پستە پستەکان، بەئاشکراو نهێنیەو کاری دەستەکان بێداربینەوە یەکێ خۆی مەخلوقانێکی بەدیهێنابێ چۆن نازانێ چی تیایە ، چی لەبالاندایەو چی لەخەیالایە ، بەلێ بەڕاستی هەر خۆی خاوەن لوتف و کەرەمە بەناوەرۆکی هەموو شتێ دەزانێ و شارەزاو خەبیرە بەهەموو کارو ووتارێ، ئەگەر کۆتربازێ پاش ماوەیێ لەکارەکەیدا هەموو سروشت و کارو جولەکانی کۆتری بزانێ وەمەڕدارێ لەمەڕەکانیو، باقی بەخێوکەرە گیاندارەکانیتر هەریەکەیان

شارەزاو زانابێ بەسروشتی ئەو گیاندارانەی بەخێوی دەکەن، ئەی چۆن خودای زانا بەسروشت و کارو وتاری بەندەکانی نازانێ زاتی باری هەر خۆیەتی زەوی بۆ ئێوە گێڕاوە بەملکەچی تا پێداویستی ژیانتان جێبەجێ بێ و تابتوانن بڕۆن و بگەڕێن بەکون و کەلەبەرەکانی و ڕێگاکانی ، بخۆن و بخۆنەوە لەرزق و ڕۆزیەکانی و گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای ئەوە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ .. إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴾ یوسف : ١٠٠ . حەزرەتی یوسف پێغەمبەری خواناس زانای هۆشیار سەرکەوتوو بەسەر نەفس و شەیتان، جوانی خووڕەوشت جوان، بێدارو ووریا پاك ڕەفتارو، دڵ گەورەی بەلێبوردەی لەخواترسی ژیرو عاقڵی خوا پێداو پەروەردگاری خۆی دەناسێ و سیفەتەکانی شارەزایەو خۆی پێ ئارایشداوەو لەدونیای بەختەوەریدا نقوم بووەو دۆست و خۆشەویستی خودایەو حەقی خۆیەتی کەپەروەردگار سیفەتێکی خۆی لەسەر زوبانی ئەوا بۆمان ڕاگەیەنێ کەفەرموویەتی بەڕاستی پەروەردگاری من خاوەن لوتف و کەرەمە بەخواستی پڕ لەحیکمەت و دانایی خۆیەو، هەر خۆشی خاوەن هەموو زانست و زانیارییەکەو، زانایە لەهەموو کارەکانی، دانایەو حەکیمە .

ئێمەی موسڵمانیش پێویستە بەم سیفەتە خۆمان ئارایش دەین لەبەرامبەر یەکا خاوەن لوتف و کەرەم و نەرم و نیان بین و، زاڵ بین بەسەر نەفس و شەیتان و واز بێنین لەدڵ ڕەقی و ملهوڕی و کۆڵەواری و ڕەقەکاری ووشکی و ڕەزیلی و قرچۆکی و بیر تەسکی خۆپەسەندی و ئەنانی و هەموو سیفەتێکی خراپیتر، وەبزانین کەخوای گەورە (عزوجل) لوتف و کەرەمی بەسەر کەسانێ دادەبارێنێ کەخۆی بەم سیفەتە برازێنێتەوەو ئارایشبدا ، لەئاشنایێتی خوای گەورەدا عاشیق و دڵسۆزو بەوەفابێ خاوەن لوتف و روخۆش و نەرم و نیان بێ ، هۆشیارو بێدارو زاناو ووریابێ پەرۆشی حەق و دادپەروەریبێ ئاواتی برایەتی سەربەستی ژین بێ .

## ٢١ – الخبير

ناوێکه لەناوە جوانەکانی خوای نەرم و نیان ، ئەم ناوە (٤٥) جار هاتووە لەقورئانی پیرۆزدا ، کە(٣٣)جاریان بە (خبير) وە (١٢)جاریش - خبيراً - ، کەهەمووی دەست نیشانە بۆ ئەم سیفەتەی میهرەبان ، بنچینەی ئەم ناوە - خبر - ە واتە ئاگاداری ..

الخبير :- واتە خوای گەورەو زانایە بەهەموو شتێ ، وەلەدەنگ و باس و هەواڵی بەندەکانی ئاگادارو هۆشیارە ، وەزانایە بەنهێنی هەموو شتێ و بەسەرەنجام و چارەنووسیان دەزانێ ..

ئەم سیفەتەی خوا والەبەندە دەکات کەئاگادارو هۆشیاربێ و بزانێ کەخوای گەورە ئاگادارە بەهەموو رازو نیازو بیرو هۆش و خەیاڵاتی ، بۆیە لەقوڵایی گیانی خۆیا خۆ دەپارێزێ لەهەرچی ناتەواوی و نابەجێیێ ببێ ، وەسەرەتا دەست دەکات بەپاك کردنەوەی نەفسی خۆی بەناواتی روو سپی بوون لەبەرامبەر قاپی میهرەبانا ، دوور لەوەی کەسبەی رۆژی شەرمەزارو رووزەردی لای خوابێ .. خۆ ئەگەر جارێ توشی گوناهێ ببێ ئەوە باوەڕەکەی بەتوندی هەرەشەی لێدەکاو ناچاری پەشیمانی دەکا جا دەکەوێتە تەقەلا بۆ پڕکردنەوەی بەتۆبەو چاکەکاری ، وەلەلایەکیترەوە بەڵێن و پەیمان نوێ دەکاتەوە کەلەگەڵ ئەم گوناهە ئاشنا نەبێتەوە ..

زیندەوەرە بچووکەکان بەهەزارەها جۆری ووردیان ، وەئەستێرە گەورەکان بەهەزارەهایان شایەدی خەبیراتی خوای بێهاوتان - کاتێ کەئادەمیزا تاوانێ دەکا لەدەرونییەوە هەست بەلێپرسراوی و دادگا دەکا ، تارادەیەك بۆی روون دەبێتەوە ، گەر کەسیش ئاگای لەتاوانەکەی نەبێ ، ئەوا دەرون دەزانێ لای هێزی گەورە وون و شاراوە نییە ، بۆیە بەشێك لەپەشیمانی لەباوەش دەگرێ ، جائەگەر بیدرکێنێ یا بیشارێتەوە .. خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿..وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ هەروەها دەفەرموێ : ﴿وَاللَّـهُ

خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ کەهەردوو ئایەتەکە یەك مەبەست دەگەیەنێ ، کەخوای گەورە ئاگادارو زانایە بەو کارەی کەدەیکەن ..

خوای گەورە لەبارەی ئەو سیفەتەی لەسورەتی (بقرە)دا لەئایەتانی (٢٧٠ ، ٢٧١) دا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا أَنفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ(٢٧٠)إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾

واتە : هەر خێرو نەفەقەیێ بەخشیبێتان و وەیان هەر نەزرێ ئەنجامتان دابێ، جا هەرچۆن بێ وەیا هەرچەند بێ لەهەر رۆژوو شوێنێکابێ، ئەوە بێگومان خودای گەورەو بالآدەست پێی زانایەو ئاگای لێیەو دەزانێ، وەئەوانەی دەست گیرۆیی هەژاران و داماوان ناکەن و خاوەنی وادەو بەلێن نین و تێکەلی زولم و ستەمکارین ئەوە خوای گەورە بالآو سەرکەوتویان ناکاو ، بێجگە لەخوای پەروەردگاریش کەسێکیتر نیە تاکو ببێ بەیاریدەدەرو سەرهێخەریان وەخوای گەورەش قین و غەزەبی لەستەمکارانەو ریسواو خەجالەتیان دەکاو بێکەس و بێ پشتیوانیان دەکا موستەحەق بەئاگری دۆزەخیان دەکا

جائێوەی خواناس و ئیماندار ئەگەر خێرو صەدەقەیێ بکەن، بەئاشکراو بەنیەتی خوای گەورەو، بۆ ئەوەی خەلکانی تر چاوتان لێبکاو ئێوەش بۆ خێرو خێرات ببن بەقودوەو پێشرەو ئەمە بۆ ئێوە مایەی چاکی باشی و پیرۆزی و بەرزییە ، وەئەگەر بەنهێنی و پەنهانیش خێرو صەدەقات ببەخشن بەنیەتی ئەوەی تاکو توشی ریایی و روپامایی نەیەن تاکو بیسەلمێنن مەبەست تەنها خوای پەروەردگارە ئەوسا بیدەن بەهەژاران ئەوە بۆ ئێوە باشترین و خێرترین شتێکە، وە ئەو خێرو صەدەقاتانەتان دەبێتە مایەی ئەوەی کە گوناه و تاوانەکانتان بپۆشرێ و، لێبوردەی خواتان شایەستەبێ، بەراستی و بێگومان خودای پەروەردگار بەو کارو کردەوەی کەئەنجامی دەدەن ئاگادارەو شارەزاتانەو خەبیرە بەکارو نیەت و هەلوێستتان ، هەروەها خوای گەورە لەسورەتی

(الانعام)دا لەئایەتانی حەڤدەو هەژدەدا دەفەرموێ : ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِنْ يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ(١٧)وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴾ واتە ئەگەر خودای بالادەست توشی زەرەرو زیانێکتان بکات ئەوە کەسێ نیە لای بەرێ و بەری لێ بگرێ تەنها خۆی نەبێ ، وەئەگەر بەهرەمەندتان بات بەخێرو بێرێ ئەوە کەسێ نیە خواست و ئیرادەی خودای گەورە بەرپەرچ بداتەوە، بەڕاستی خودای میهرەبان لەسەر هەر هەموو شتێ توانادارەو خاوەن دەسەلاتە بەسەر هەموو بەندەکانی، بەسەر گشت بەدیهێنراوانی، هەر خۆی حەکیم و دانایە لەکارەکانی، خەبیرو شارەزایە لەبینەو بەردەی گشت بەندەکانی ، هەروەها خوای گەورە لەسورەتی هود لەئایەتی (١١١) دا دەفەرموێ : ﴿وَإِنَّ كُلاًّ لَمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ هیچ کەسێ نیە لەئادەمیزادەکان بەچاك و خەراپیانەوە کارو بڕیارو هەڵوێستیان بێ ئەنجام و چارەنووس بێ، یا بێ پاداش و بێ تۆڵە بێ، نەخێر هیچ کامەیان نیە ئیللا بەپێی تەواوی کارو کردەوەکانیانەوە گوفتارو ووتارەکانیانەوە بەر حیساب و لێپرسینەوەن، یا پاداشتە رازی دەکرێ هەست و خواستی ، یانیش سزاو تۆڵەی سەختە بەقەد گوناهی بەدبەختە ، پەروەردگاری مەزنی تۆیە کردەوەیان دەسەنگێنێ ، هەر کێی چۆن بێ و چی کردبێ ئاوای دێنێ ، بێگومان و بەیەقینی ، زۆر بەڕاستی و بەتەئکیدی ، هەرچی دەیکەن پێی خەبیرە ، شارەزایەو خاوەن بیرە ، خواست و تەقدیری گشت حەقن ، دوژمنانی کەللەڕەقن ، خۆی دەزانێ چیان بۆ باشە ، لەدوا رۆژو لەپاداشا، هەروەها خوای گەورەو بالادەست لەسورەتی نورا بەشێوەیەکی ئامۆژگاری رووەو ئیمانداران لەئایەتی (٣٠)دا دەفەرموێ : ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾

ئەی پێغەمبەری ئازدارو سالار قەولت بفەرموو بەگشت ئیماندار چاویان دابێنن لەڕاست حەراما لەئاست ناموسی خەواص و عاما، ئەوساش وریابن لەپاکیو چاکی نەکەونە داوی ئارەزووبازی، خۆ پاراستنتان بۆ چاوو دامەن پاکیو پیرۆزییە بۆ کاری

ئێوە ، واش مەزانن کارو کردەوە بەسەر دەچێتن بێ پرسینەوە، یا واتێ نەگەن کەس لێو دیار نیە ، هەر شتێك نەکەن هیچی بونیە ، نەخێر برای شێرن خوا ئاگاداره بەسەر گشت بەندە هەردەم بەکارە ، تۆ هەرچی دەیکەی ئەو زانیویەتی مۆلەتی داوی لەبەر حیکمەتی ، بەس باش بزانە ، گشت بۆت حیسابە ، وردیلە و زەرەش هیچ بۆت لانابا، لەرۆژی قیامەت لەسەر تەرازوون چ خێربێ و چ شەڕ هیچ لێت نابێ وون، ئەوسا دەزانی چەندە بەدبەختی ئەگەر رەحم نەکرێ تەواو شەکەتی بێیارو، کەس لەناو نەگبەتی ..

هەروەها خوای پەروەردگار لەسورەتی (الحجرات)دا لەئایەتی (١٣) دا دەفەرموێ : ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ واتە ئەی کۆمەلانی خەلکان و مەردووم هۆشیار ببنەوەو سەرتان لێ نەشێوێ و بەفێڵ و تەلەکەی شەیتانان دامەکەون، بزانن هەر ئێمەینە ئێوەمان بەدیهێناوە لەپیاوو ئافرەتێکا لەکاتێکدا کەئێوە نەبوون و ئیتر ئێوەمان گێڕاوە بەگەلان و قەومانی جیا جیا تیرەو هۆزو قەبیلەی زۆر بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، کەئایاتی خودان دەسەلاتی گەورەی خواتان بۆ دەرکەوێ ئەوسا لێی بترسن و زولم و ستەم لەیەکتر نەکەن و چاکەو کۆمەکی یەکتر بکەن و ، کەسێ بەگەل و قەومیەتی نەنازێ بەسەر گەل و قەومێترا، یا کەسێ بەتیرەو قەبیلەی نەنازێ بەسەر تیرەو قەبیلەی ترا، بزانن ئێوە هەمووتان برای یەکن کوڕان و کچانی باوکە ئادەم و دایکە حەوان، کەستان لەکەسێکیتر باشترو چاکتر نیە مەگەر بەخواپەرستی و چاکە کردن نەبێ، بەڕێزترینتان ئەو کەسەیە کەلەهەمووتانا خوا پەرست تربێ، بەڕاستی خودا زاناو خەبیرە ، هەروەها خودای خەبیرو زاناو بەتواناو شکۆمەند لەسورەتی (الحشر)دا لەئایەتانی (١٨،١٩،٢٠) دا دەفەرموێ : ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ(١٨)وَلاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ(١٩)لاَ يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ الْفَائِزُونَ ﴾

واته : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئەی کەسانێ کەبڕوادارن تەقوای خودا بکەن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودابن ، عاقڵ و ژیرو ووریابن هەریەکێ لەئێوە بابڕوانێ و سەیرکە ئاخۆ چی ئامادە کردووەو بەپێشی خستووە بۆ بەیانی کەقیامەتەو ڕۆژی لێپرسینەوەیە ، بێداربنەوە لەخودا بترسن لەفەرمانەکانی خودای پەروەردگار دەرنەچن، وەبەدوای هەواو ئارەزوو نەکەون، بەڕاستی بێگومان خودای زاناو دانا ئاگادارو خەبیرە بەکارو بەهەڵوێست و نیەتیان دەزانێ، گچکەو گەورەی لێ وون نابێ ..

ئەی کەسانێ خۆتان بەئیماندار دەزانن وەکو ئەوان کەسانە مەبن خودایان بیرچۆتەوەو فەرامۆشیان کردووە ئەوانە لەواقیعی بیروهۆشی خۆشیانە ترازاون و کەوتونەتە دونیای مەشغەڵەت و غەفلەت و بازاڕی درۆیینە شەیتانەکان و ، خوای گەورەش بێنرخی کردوون جا رابردوو ئێستاو داهاتووی خۆیانیان فەرامۆش کردووە لەسەر ڕێگەی ڕاستی خودایی ترازاون و دەرچوون وەکەوتونەتە دونیای فوسق و بێ بەرنامەیی و سەر لێشێواوییەوە ، کەسانێ کەشایەستەو ئەهلی دۆزەخ بن وەکو کەسانێ نین و نابن کەئەهلی بەهەشت و ڕەحمەتن، بەڵکو کەسان و هاوەڵانی بەهەشت خۆیانن سەرکەووتوو سەرفرازن، بەغەیری وان وان لەناو خەسارەتمەندی و ئاگری جەهەندەما وان لەناو پەشیمانی و خەجاڵەتی ، بەڕاستی خوای گەورە شارەزایەو خەبیرەو دەزانێ کێن سەرکەوتوو وەکێن سەرلێشێواوو ئەهلی ئاگرن .

قورئانی پیرۆز لەهەموو روو لایەنەوە باسی تەواوی خەبیرێتی خوای گەورە دەکات، کیتابی کەون و بونەوەریش بەزوبانی حاڵ و بەدیمەنی دیاردەیی‌و بەرەنگ و شێوەیەوە لەخەبیرایەتی پەروەردگارەوە دەدوێ، جا هەر جۆراو جۆری مەخلوقێ بەنەوعێ و بەجۆرێ ، بەڵێ چ مەجەرەکان و ملیۆنەها کەشکەشکانەکان چ ئاسمانی شین و ئەستێرەکان چ چیاو دۆڵ و کێوەکان چ باغ و چەم و بێستانەکان چ دەشت و دەرو بیابانەکان چ دەریاو روبارو کانیاوەکان چ گیاندارو بێگیانەکان چ نزم و نشێوو بەرزەکان چ سەوزو سورو ڕەنگەکان هەر گشتیان بەڵێ هەر گشتیان ئالای بەرزکراوەیان خەبیرێتی

خودای باڵادەستی تیا نەخشراوەو تیا نوسراوە بۆ هۆش و چاوی نەقوچاوە ، بۆ بیرو هۆشی ئازادکراو ، بۆ عەقڵ و بیری بەند نەکراو بۆ هۆش و فامی نەشێواو ، لەگوڵاڵە کارامەکان هەموو جۆریان هەموو رەنگیان پەر بەپەریان لەباڵندەو مەل و جۆریان لەفڕین و قارەو دەنگیان لەشێوەو روخسارو رەنگیان، هەر گشتیان هەموو پەریان .. لەمەڕو بزن و حوشترو چێڵەکان هەر گشت نەوعیان هەموو جۆریان، شێوەو دیمەن و بەرهەمیان، بارەو قارەو هەست و دەنگیان، هاتووچوون و هەڵسوکەوتیان، هەر گشتیان، هەموو بەشیان، دیاردەی خەبیرێتی خودان، دەرس و پەندن لەبۆ ژیران کەخالقیان ، بەدیهێنەرو مالیکیان ، هەم زانایەو هەم توانایە ، زۆر بەرەحمە بەکەرەمە خاوەن خیبرەی بێ سنورە هەر خۆی سەرچاوەی خیبرەیە ، هەرچی هەیە هەر لای ئەوە هەر ئی ئەوەو هەر بۆ ئەوە، خیبرەی دەست هەموو مەخلوقێ لەهەر شوێن و هەر کاتێ بێ، ئی خۆیەتی و بەخشیوەتی لەهەمووشیان دەسێنتەوە تا واقیع بێ هەر ئی ئەوە.

باسی داری بەروبوم کەین چەندین جۆرن ، لەهەر جۆریان چەندین جۆرن تا بژمێری هەر ناژمێردرێن هێندە زۆرن ، جا ئەوانیش هەموو نەوعیان هەموو جۆریان بەهەموو شێوەو رەنگ و بەژنیان، باڵاو قەدو گەڵاو رەگیان، گشتیان دیاردەی خەلقی خودان، لەوەصف و باسی خەبیری‌دان، رون و ئاشکراو دیاریان کردووە، بۆ کەسانی عەقڵی خۆیان ون نەکردووە، خوا توانایە هەم زانایە، خاوەن خیبرەو شارەزایە .. ئەو راستیەمان لەبیر نەچێت سیفەتەکانی خودای پەروەردگار بەخەبیرێتیشەوە نەبەستراونەتەوە بەجێگەو شوێن و مەکان یا بەئان و کات و زەمان ، وەبیرو هۆشی ئێمە وەیا زانیاریو عیلمی ئێمە سنورداره هەرگیز ناتوانێ خول بخواتەوەو تێبگات لەتەواوی سیفەتە بێسنورەکانی خودای باڵادەست لەم سیفەتانەش خەبیرێکی خودای پەروەردگار .

## ٣٢ - الحليم

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای زانا ، وە (١١) جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە کەمەبەست سیفەتی خوای گەورە بێت بنچینەی ئەم ناوە (حلم)ە واتە دان بەخۆداگرتن و خۆگری و لەسەرخۆیی ..

الحلم : یانی ئەو خوایە پەروەردگارێکە خۆگرو بەئارامە ، چاوپۆشی دەکاو لێخۆش دەبێ و عەیب و عار دەپۆشێ ، لەهەڵەو تاوانە خراپەکان خۆش دەبێ بەتایبەتی هەرکاتێ بەندەکانی کەبگەڕێنەوە لای و پشتی پێببەستن و واز لەپوچەڵی و بەتاڵ بێنن

ئەم میهرەبانە پەلە ناکات لەتۆڵە سەندنداو مۆڵەت دەدات بەڵام لەیاد و فەرامۆشی ناکا ئەم دواخستنەش خۆگرو ئارامیەتی کەبەخششن بۆ بەرەی ئادەمیزاد بەتکاو ئومێدی ئەوە، کەپەشیمان ببنەوەو خۆیان لەدونیاو قیامەتدا نەدۆڕێنن ، وەئەم میهرەبانە بەپەلە تۆڵە ناسەنێ و زوو تووڕە نابێ ، حەز دەکا بەندەکانی ئەم سیفەتە بکەنە رەوشتی خۆیان .. خوای گەورە مەدحی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەکاو دەفەرموێ : ﴿..إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ ﴾ التوبە : ١١٤ . واتە بەڕاستی حەزرەتی ئیبراهیم حەلیم و خۆگرو بەئارامە .

وەخوای گەورە لەم سیفەتەوە لەبارەی خۆیدا دەفەرموێ : ﴿ .. وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾ البقرە: ٢٣٥ .

نەرم و نیانی و حەلیمێتی خوای گەورە هاوڕێکی دانایی‌و حیکمەتی خۆیەتی کەمایەی رەحمەت و بەهرەی خودایە بۆ ئادەمیزادەکان بەگشتی ، دافعێك و هاندەرێك نیە خودای حەلیم هەڵبنێ و نەرم و نیانی و حەلیمێتیەکەی ئاڵوگۆڕ پێبکا، یا کەم و زیادی بکات یا بەهیچ شێوەیێ پەنجەی تیا بخات، وەك ئادەمیزاد نیە کەچەندین هۆکاری ماددی‌و مەعنەوی هەن کەهەمیشە کاریگەرییان هەیە بەسەر چەن و چۆنێتی سیفەت و

ناکارو داب و نەریتەوە ، هەروەها پێداویستانی زۆری ئادەمیزادو ناتەواوی و کەم و کورپیەکانی مویتەلابوونی بەنەفسی ئەممارەو شەیتانەوە ئەوانەش خۆیان لەخۆیاندا جۆرەها کاریگەرییان هەیە لەسەر رەوشت و ئاکارو سیفەتانی ئادەمیزادەوە ، یا بەمانایێ تر بەربەست و عەوائیق زۆرە لەپێش ئادەمیزادا بۆ گەیشتن بەم سیفەتە بەرزو پیرۆزە کەحەلیمێت و لەسەر خۆیی و نەرم و نیانی‌یە ، بەلاّم هیچ بەربەرست و عەوائیق نیەو نەبوەو نابێ لەپێش زاتی باری شکۆمەندەو حەلیمەوە ، هەروەها زاتی ئازیزو شکۆمەند هیچ کاریگەریەکی بەسەروە نیەو هیچ پێداویستی روو لەو ناکاو بێ نیازو گەرەکە ، ئابەمەوە سیفەتە جوان و بەرزو پیرۆزەکانی دامەزراون و هەمیشەیین ، ئادەمیزادیش لەسەریەتی کەهەردەم لەتێکۆشان و تەقەلادابێ خۆی لەسیفەتانی جەمال و کەمال و پاکی و جوانی و پیرۆزی و بەرزی نزیك بکاتەوە، بەئومێدو تکای ئەوەی لەئاسودەیی‌و بەختیاری بەهرەمەند ببێ و، وەببێ بەمایەی جێبونەوەی لەجیرانێتی زاتی پاك و بەرزو پیرۆز لەبەهەشتی پڕ نیعمەتانی نەبڕاوەی هەتا هەتایی ، وەیەکێ لەم سیفەتانە کەمایەی پاکی‌و پیرۆزی و بەرزی‌یە نەرم و نیانی و حەلیمێتی‌یە ، خوا قسمەتمان کات و پێمان ببەخشێ .. مێژووی دێرینی ئەم کەون و بونەوەرە وەکو زۆر لەسیفەتە بەرزەکانی خودای بەواقیع سەلماندووە وەمایەی پەندو عیبرەت و ئامۆژگاری‌یە بۆ ئێمە ، هەروەها زۆرێك لەسونەنانی باری تەعالای بۆ ئێمە روون کردۆتەوەو دەرخستووە ، وەیەکێ لەم سیفەتە بەرزو پیرۆزەی حەلیمێتی‌و نەرم و نیانی‌یە کەهەمیشە رەونەق و پرشنگی ناوجەرگەی مێژووی کەون و بونەوەرە بۆ هۆشیاران پرشەنگ دەدات بەواتاو مانای زاتی باری شکۆمەندی ئازیز ئومێدگای ژیران و عاقلاّن دۆست و ئاواتی بێداران زۆر نەرم و نیان و حەلیمە زۆر زاناو بەدەسەلاّت و کەریمە وەکو خاوەن عەتاو بەخشش و رەحیمە ئاواش شکۆمەندو بێ لەکەو عەزیمە ، ئەی زاتی باری ئەی حەلیمی بێ وێنە ئەی پشت و پەنای زانایان ، دیارە رەونەقی نورو هیدایەتی تۆیە دونیای تاریکی‌و جەهالەتی شەق کردووە کەون و کائیناتی راگرتووە هەزاران خامۆشی بێدار کردووە هەردەم بەربەستی وێڵی و

گومرایی و جەهالەت بووە، زاتی باری لەبارەی حەلیمێتی خۆیەوە لەکیتابە پیرۆزو بەرێزو بەرزەکەیدا دەفەرموێ : ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ(٢٦١)الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لاَ يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُوا مَنًّا وَلاَ أَذًى لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ(٢٦٢)قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴾ البقرە : ٢٦١ـ ٢٦٣ .

زاتی باری خاوەن باوەڕو ئیمانداران هان دەداو تەشجیعیان دەکات کەوا بەخشین و خێرکردنیان وەگەڕخەن و بەرەکەت بخەنە پاداشەکانیان و ئیمانیان و هەست و ویست و عەقڵ و ژیریان و هەروەها زانست و زانیارییان و رزق و رۆزییان چونکە خێرکردن مایەی پیرۆزی و بەرزی و گیان پاکیو بەرەکەتی رزق و رۆزی زانیارییە ، هەروەها مایەی خۆشەویستی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ و بنەبڕکردنی چەندەها موشکیلەو گیروگرفتە ، هەروەها مایەی لابردن و دەفع کردنی دەردوو بەڵایە سەرەڕای ئەوانەش مایەی تەمەن درێژی و بەرەکەت تیا رژاندنیەتی ، ئا ئەوەتە زاتی باری نمونە دەهێنێتەوە بۆ هەڵ نان و تەشجیع کردنی خاوەن سەروەت و سامانەکان بۆ خێرکردن و بەخشینی بەشێ لەماڵ و داراییان بەهەژاران و داماوان و موستەحەققان لەرێگەی خودای گەورەو میهرەبانەوە ، دەفەرموێ نمونەو وێنەی ئەو کەسانەی کەماڵ و داراییان لەپێناو رێگەی خودا دەبەخشن وەك وێنەی دانەیێ لەدانەوێڵە وایە کەبروێندرێ پاش چاندنی ، وەحەوت گوڵە گەنمی لێ دەربچێ هەر گوڵە گەنمێ سەد دانەی تیابێ ئا ئەوە دەبێ یەك بەحەوت سەد ، واتە هەر خێرێ پاداشەکەی بەقەد حەوسەد قاتی خۆیەتی، جا خوای گەورە زیادی دەکات و چەند بارەی پاداش دەداتەوە بۆ کەسانێ کەخواستی لەسەربێ لەبەندە پاك و خێرکەرو چاکەکانی ، بەراستی خوای گەورە زانیاری گەلێ فراوانەو خۆشیو بەختەوەری ئادەمیزادەکانی دەوێ ، ئالێرەدا تەشبیهی نەبێ خوای گەورە وەکو مامۆستایێ کەقوتابیەکانی هان بدات لەسەر پاك و خاوێنی و خوێندن و دیراسە کردن ، خۆ

دەشتوانێ هەر کامەی ناجح و سەرکەوتوو بکات بیکات ، بەڵام پلەو پایـەی بـەرزی بـۆ کەسانێ دادەنێ کەشایستەن چونکە حوکمی حەق و ویژدان و سونەنی ژیان ئاوا دەخوازێ لێلادانی کارێکی نەگونجاوو نامەقبول و نامەعقولە ، دیارە خوای گەورەش رزق و رۆزی و پلەو پایەی بەرزی زۆری بێ ژمار لەلایـە لەدەسـت خۆیـەتی چـۆنی ببەخـشێ ئـاوای دەبەخشێ ، بەڵام گشتی بەپێی سونەتی پڕ لەحیکمـەت و دانـایی خۆیـەتی جـا ئـەوان کەسانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن پاشان منەت بەدوایا ناخەن دڵ و دەروونی هەژارانی پێ ئازار نادەن بـەڵکو تـەنها مەبەسـتیان خوایـەو هیـچیتر ئەوانـە ئـەجرو پاداشـیان لای پەروەردگاریانە ترس و غەمگینیان لەسەر نیەو لەبۆ نیە لەوەی پاداشیان لەبەین بچێ یا کەم و کوڕی تیابکەوێ ، سەرەڕای رووسوریـشیان لـەقاپی رەحمـەتی خـوای گـەورەوە ، قسەیەکی خۆش و روێکی شیرین و لێبوردەیێ باشترەو خێرترە لـەخێرو صـەدەقەیێ کـە باری ئەزیەت و منەتی بەدواوەبێ ، بەڕاستی خوای گەورە بێ نیازە لەچاکەو خێری گشت کەسێ بەتایبەتی ئەوانەی ئەزیەت و منەت دەخەنە دوای خێرەکانیانەوە ، خوای گـەورە ئـەو ئـەمرو فـەرمان و ئامۆژگاریانەشـی هـەر رەحمەتـەو ، خۆشـی بەختـەوەری ئادەمیزادەکانی دەوێ ، هەروەها خوای گەورە لەسەر خۆیەو پەلەکار نیـیە خاوەن حیلم و حەوسـەڵەیە ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِنْ تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ المائدە:١٠١

هەروەها خوای پەروەردگار لەبارەی ئەم سیفەتەی خۆی کـەحیلم و حەوسـەڵەیەو لەسـەرخۆییە رووەو ئیمانداران ئامۆژگارییان دەکاو دەفەرموێ : ئەی گرۆهـی ئیمانـداران ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هێناوە سەبرتان هەبێ خاوەن حـیلم و حەوسـەڵەبن لەسـەرخۆبن لەکارەکانتانا گەر حیکمەت و دانایی وای دەخواسـت ، پرسـیارمەکەن لەشـتانێك گـەر راستیەکەتان بۆ دەرکەوێ پێیەوە گیرۆدەو نارەحەت بن ، چونکە سروشتی ئادەمیزاد وایە لەڕووی زانست و زانیارییەوە کەم و کوڕی زۆرە لەلایەکی تریـشەوە گـیرۆدەو ئیبتـیلای نەفـسی ئەمارەیـە کـەداواکاری نارەوایییـە هـەروەها گـیرۆدەی شـەیتان و ئیبلیـسی

نەفرەتیشە جا ئەو کاتەی کەوەحی قورئانی دابەزیو تێتان دەگەیەنێ ، جائەگەر کەموکورێکتان بووبێ لەبەر نەزانین یا پێش ئەوەی بیزانن ئەوە خوای کردگار خاوەن لێبوردەو غەفورە لەناستییەوە ، خوای بالآدەست و پەروەردگار غەفوورەو گوناە پۆشەو لێبوردەیە خاوەن خۆگریو لەسەرخۆیە بەحیلم و حەوسەڵەیە .

هەروەها خوای گەورە لەسورەتی التغابن لەئایەتانی (١٧ - ١٨) دەفەرموێ :

﴿إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ(١٧)عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾

ئەگەر ئێوە بەش و باریێ بکەنە خێرو ببەخشن بەهەژاران و داماوان ئەوە خوای گەورە واحیسابی دەکات کەوەکو قەرزو قۆڵە دابتانە خۆی، بۆی لەصندوق و باقی خۆیا گل دەداتەوە مادام بەچاکی و بەباشی و بەمەبەست خوا بەخشیبێتتان ، ئەوە خوای گەورە بۆتان چەند بارە دەکاتەوە لەپاداشتان و فەرامۆشی ناکاو، دەیکا بەمایەی لێبوردنتان و ڕێزتان لێدەنێ و پایەتان بەرز دەکاتەوە ، بەڕاستی خوای پەروەردگار سوپاس گوزارو چاکەو خێرخوازی لەبەرچاوا دەگرێ و، لەسەرخۆو خاوەن صەبرو حیلم و حەوسەڵەیە ، هەموو کارەکانی بەوپەڕی پڕ حیکمەت و داناییەوە ئەنجام دەدات، چونکە خۆی زانایەو خاوەن زانیارییەو دیاردەو نادیارەکان دەزانێ و دەناسێ و عیلمی پێیانەوە هەیە، وەخۆی شکۆمەندەو ئازیزە وەحەکیم و داناشە لەکارو فەرمانەکانیا ، کەخوای گەورە مەجال و مەودای خێری داوەتە دەست ئادەمیزاد ئەمەشی هەر ڕەحمەتە ، کەمایەی بەرزبوونەوەی ئادەمیزادە خێرخوازەکانەو مایەی پاك بوونەوەی دڵ و دەروون و ماڵ و سامانەکانیانە ، هەروەها خوای گەورە لەسورەتی ئیسراء لەئایەتی (٤٤)دا دەفەرموێ ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لاَ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾

هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی پاك و بێگەردێتی خوای گەورە دەردەخەن و تەسبیحاتی ئەو دەکەن، جا هیچ شتێ و هیچ مەخلوقێ نیە ئیللا وا لەتەسبیحات و

ستایشی پەروەردگارایە، بەڵام ئێوەی ئادەمیزاد زانیاریتان ناگات بەحاڵی بونتان لەچۆنیەتی تەسبیحاتی وان، خوای گەورە لەسەرخۆیەو خاوەن صەبرو حیلم و حەوسەڵەیە ، هەروەها لێخۆشبوو لێبوردەیە لەبەرامبەر بەندەکانی گەر بگەڕێنەوە بۆلای و واز لەخەراپەو تاوان بهێنن .

خودای پەروەردگار لەئادەمیزاد ناچێت وەك و لەهیچ مەخلوقێتر ناکاو پێیان ناچێ ، ئادەمیزاد کەگەورەو سەرداری مەخلوقەکانە ئەوساش پڕیەتی لەکەم و کوڕی یا بەمانایێتر لەزۆر ڕوو لایەنەوە کەم و کوڕی هەیە، لەڕووی تواناو دەسەڵاتیەوە لەڕووی زانست و زانیارییەوە لەڕووی هەست و نست و شعورو نەفسیەتیەوە ، هەروەها ئادەمیزاد ناچارو موسەیەرە لەزۆر ڕوو لایەنی بوون و ژیانیەوە، وەکو هاتنە بوون و مردن و دونیای بەرزەخ و زیندووبونەوەو ئامادەبوون لەزەوی مەحشەردا ، هەروەها ئادەمیزاد پێداویستانی زۆر زۆری پێویستەو گەرەکە بۆ دابین کردن و بەجێ گەیاندنی ژیان .

بەڵام زاتی باری خوای باڵادەست کردگاری دانا لەهیچ روو لایەنێکەوە کەم و کوڕی نیەو کەمو کوڕیش رووی تێناکات، چ لەڕووی تواناو دەسەڵاتی بێسنوریەوە چ لەڕووی زانست و زانیارییەوە، وەبێ نیازو پێداویستە لەغەیری خۆی هەموو شتێ لەوەوە سەرچاوە دەگرێ و پێداویستی بەوە، بەبێ ئەو هەڵ ناکاو ناتوانێ لەدونیای بووندا خۆی بگرێ، لەستایش و حەمدی ئەوایەو ، زاتی باری هەموو ناوە جوانەکان و سیفەتە بەرزەکانی ئی خۆیەتی شایەستەی خۆیەتیو داواش دەکات لەخاوەن باوەڕان بەسیفەتانی جوان و شایەستەیان خۆیان پێ ئارایش بدەن ، وەخۆیان دووربگرن لەسیفەتانی بەدو ناڕێك و ناشیرین، بەئومێدی ئەوەیان تاکو دوارۆژ لەبەهەشتی بەریندا لەجیرانێتی خوادا شوێنیان بێتەوەو ئاسودەو بەختەوەری بن .. جا یەکێ لەم سیفەتانەش صەبرو لەسەر خۆییە حیلم و حەوسەڵەیە، کەئازادی دەدات بەعەقڵ و عیلم و ئیمان ، دەرفەت و مەجال بۆ شەیتانەکان ناهێڵێتەوە بەوەی کاری ناگونجاوو ناڕەوایان پێبکات .

سـيفەتی حـەلیمێتی سـەبرو خـۆگری سـیفەتی پێغەمبـەران و پیـاو چـاکان و صـالیحان بـووە، وەخـوای گـەورە لـەباس و وەصـف و مـەدحی حـەزرەتی ئیبراهیمـدا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ﴾ هود : ٧٥ .

بەڕاستی حەزرەتی ئیبراهیم پێشەوای خواناسـان و خواپەرسـتان لەسـەرخۆبووەو خاوەن حیلم و حەوسـەڵەبووە هەمیشە دڵی بەلای خوای پـەروەردگارا بـووە، موتتـەقیو خاوەن خووڕەوشتی جوان بووە ، هەروەها خوای گەورە لەمەدحی حـەزرەتی ئیـسماعیلا کەخاوەنی خۆگری صەبرو حیلم و حەوسەڵە بووە دەفەرموێ : ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ الصافات : ١٠١ .

واتە مزگێنیمان دا بەحەزرەتی ئیبراهیم کەرۆڵەیەکی گـەنجی تـازە لاوی لەسـەر خۆی خاوەن حیلم و حەوسەڵەی پێ دەبەخشین، مێژووی بەڕێوەبردنی ئەم کەون و بونەوەرە فراوانە بەو هەموو کەشکەشان و مەجەراتانەوە بەو هەموو ئەستێرەو کەوکەبانەوە مانای حەلیمێتی و حەوسەڵێتی خوای پەروەردگاریان تیا دیارەو رەونـەق دەداتـەوە ، هـەروەها مۆڵەت دانی ستەمکارو زاڵمان و بێباوەڕان لەدرێژایی مێژوودا سەرەڕای ئـەوەش رزق و رۆزی پێدانیان و دەبرکردنی پێداویستی ژیانیـان لەلایـەنی پـەروەردگارەوە گـشتی ئـەو راستیە دەسـەلمێنێ کەزاتی باری حیلم و حەوسەڵەی بێسنوورەو خاوەن رەحم و بەزەیییـە حیکمەت و دانای ئەو لەئارادایە ..

جا ئێمەی موسڵمانیش پێویستە خۆمان ئـارایش دەیـن بـەم سـیفەتە شـیرینەو خۆمانی پێبەهرەمەندو پایە بەرزبکەین کەئەم سیفەتە بەرهـەمێکی ئیمانیـیـە مایـەی رەحمی خودایە بۆ تاك و بۆ کۆمەڵ .

## ٣٢ - العظيم

ناوێکه لەناوە جوانەکانی خوای بەئارام ، بنچینەی ئەم ناوە (عظم)ە واتە گەورەیی و بەرزی .

العظیم : واتە خوای گەورە لەوپەڕی گەورەییدایە لەهەموو روو لایەنێکەوە لەزاتی خۆیدا ، لەحیکمەت و داناییدا ، لەبەرنامەو شەریعەتدا ، لەدروست کراوەکانیا لەزانست و زانیاریدا لەفەزڵ و بەخشینا ..

هەموو گەورەیییەك جالەهەرچ روو لایەنێکەوە بێ لەئاستی وویا زۆر زۆر نزم و بچووکە ، ئەم میهرەبانە لەهەموو سیفەتێکا گەورەیی تیابێ ئەوە هەر شایان بەخۆیەتی ، جا بۆ ئەوەی ئەم سیفەتە گەورەیەی خوامان لەیاد نەچێت پێغەمبەرمان (ﷺ) بەسوننەت بۆی دیاری کردووین کەلەکاتی رکوعی نوێژدا بڵێین - سبحان ربي العظيم - وەکو چۆن خوای گەورەی زیاتر لەجارێکا داواو فەرمانمان پێدەداو دەفەرموێ : ﴿ فسبح بسم ربّكَ العظيم ﴾ الواقعه .

پاك و بێگەردێتی پەروەردگاری شکۆمەندو عەزیمت بنوێنەو دەربڕە..

تاکو زانست و زانیاری لەپێشکەوتندابێ، گەورەیی و عەزەمەتی خوای میهرەبان خۆی ئاشکراترو روونتر دەکاتەوە ئەوەی زانست تائێستا پێی گەیشتووە (لەبارەی زانیاری ئاسمان) زیاتر لە (٢٠٠٠) ملیۆن کەشکەشان (مجره) دۆزراوەتەوە وەگەلێ زیاتریش چاوەڕێ ئەکرێ ، وەهەر کەشکەشانێ زیاتر لە (١٥٠) هەزار ملیۆن ئەستێرەی تیایە ، ئەمانەش گومانی تیانیە کەگشتی لەئاسمانی دونیان ، وەحەوت ئاسمانیش بەسەرمانەوەن وەکو خوای گەورە لەسورەتی (ملك)دا دەفەرموێ : ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا .. ﴾ واتە ئەو خوایەیە حەوت ئاسمانی بەسەر یەکەوە بەدیهێناوە وەپێغەمبەری خۆشەویستمان - ﷺ - دەفەرموێ } وما السمواتِ السبع في كفِّ الرحمن الاّ كخردلٍ في يدِ احَدِكُم { واتە حەوت ئاسمانەکان لەدەستی قودرەتی خوا وەکو غەردەلێ (کەبچوکترە لەدانە جۆیەك) وایە لەدەستی یەکێ لەئێوە .. بەڵێ !! ئەمە عەزەمەتی زاتە ، هەروەها دەفەرموێ : } وما السماوات السّبع في الكرسي الاّ كدراهم سبعة القيت

في ترس (القلغان) واته حەوت ئاسمانەکان لـەناو کورسـی خـوادا وەکـو حـەوت پـەنجایی (درهەم) وان کەبیخەیتە تەشتێ ..

هەروەها دەفەرموێ : } بين السماء الدنيا والتي تليها خمس مئة عام وبين كل سماء خمس مئة عام وبين السماء السابعة والكرسي خمسة مئة عام والعرش فوق الماء والله فوق العرش لايخفى عليه شيئ من اعمالكم { واته بەینی ئاسمانی دونیـاو ئاسمـانێ کەوا بەسەریەوەتی (٥٠٠) ساڵە رێیە جا هەر خوای گەورە دەزانێ چ جـۆرە سـاڵێ و چ جۆرە سورعەیێ چونکە تـەنها رۆژێ لای خـوای گـەورە وەك هـەزار سـاڵی ئێمـە وایـە کەبیژمێرین ، وەك لەسورەتی (حەج) ئایەتی (٤٧)دا دەفـەرموێ : ﴿..وَإِنَّ يَوْمًا عِنـدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ ﴾ وەبەینی هەر ئاسمانێ و ئاسمانێتر (٥٠٠) ساڵە رێیـە ، وەبەینی ئاسمانی حەوتەم و کورسی (٥٠٠) ساڵە رێیە ، وەعەرشی خوا بەسەر ئاوەوەیەو وەبە سەر ئاسمانەکانەوەیە ، وەزاتی خوای گەورەش بەسەر عەرشەوەیە ، هیچ شتێ لێـی شاراوە نیەیەو لێی ون نابێ لەکارو کردارو فرمانی ئێوە) [1]

الله اكبر ئەمە عەزەمەتی گەورەییو دەسەلات و موڵـك و سـامان و زانیـاری و زانستی ئەو زاتەیە ، کـە (الله)یـە و نـاوە جوانـەکانی لـەخۆی نایـە ، خـۆی عەزیمـەو عەزەمەت هەر لەخۆی دێ ..

کەلیمەو ووشەی عەظیم کەلیمەیەکی مەعنەوییـە ئەصـڵەکەی لەکەلیمەیـەکی ماددییەوە وەرگیراوە ئەویش (عظم)ە کەئێسقانی گەورە دەگرێتەوە وەزیـاتر لـە (١٠٧) شوێن لەقورئانا هاتووە بەهەموو موشتەقەکانیەوە ، وەتـەنها لـە (٦) جـاردا مەبەسـت سیفەتی خوای گەورە دەنوێنێ ، یەکێ لەو ئایەتانـەی ئایـەت کورسـیـیە کەژمارەکـەی (٢٥٥)ە لەسورتی (البقرە)دا خوای گەورە باسی شکۆمەندی و زاتی خـۆی تێـدا دەکـاو دەفەرموێ ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ

---

[1] ئەم سێ فەرمودەیە ئیمام محمد عبدالوهاب لەکیتابی التوحید گێڕاویەتەوە ل(٢٦٦)

يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ وەپێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەبارەی ئایەت کورسییەوە دەفەرموێ { من قرأ آية الكرسي دُبُرَ كل صلاة لم يمنعه من دخول الجنة الا الموت } رواه النسائي والطبراني من حديث ابو امامة ، واتە هەر کەسێ ئایەت کورسی بخوێنێ لەپاش هەموو نوێژەکانا ئەوە هیچ شتێ بەرگری لێ نەکردووە بچێتە بەهەشت، تەنها مردن نەبێ ، واتە نەمردووە بۆیە نەچۆتە بەهەشت هەروەها لەفەرموودەیەکیترا کەئیمامی عەلی رەزای خوای لێبێ گێراویەتیەوە لەپێغەمبەر ﷺ : { من قرأ آية الكرسي دبر الصلاة المكتوبة كان في ذمة الله الى الصلاة الاخرى } رواه الطبراني باسناد حسن ، واتە ئەوەی ئایەت کورسی بخوێنێ لەپاش نوێژی واجبدا ئەوە دەکەوێتە ژێر پارێزگاری خوداییەوە تا نوێژەکەیتر ، جا زۆر پێویستە ماناو واتای ئەم ئایەتە بزانین کە کورتەکەی ماناکەی وایە ( زاتی الله کەخودایە خۆی تاکە پەرستراوەو هیچ پەرستراوێ تر نیە تەنها خۆی نەبێ کەهەمیشە زیندووەو راگری هەموو کەون و بونەوەرەوە، ئەو زاتە نابۆرژێ و نانوێ، خاوەنی هەر هەموو شتێکە بەئاسمانەکان و زەویشەوە بەهەرچی تیاشیان دایە ، ئیرادەو ویست و تکاو شەفاعەتی کەسێ بەئەنجام ناگات بەبێ ئیزن و مۆڵەت و ئیرادەی ئەوا ، وەخاوەن هەموو زانیارییەکە دەزانی چیتان لەبەردەستایە لەهەموو شتێ وەچیشتان لەدوایە ، وەئێوە دارای وەیا خاوەن هیچ عیلم و زانیاریێ نین لەئاست ئەوا تەنها ئەوەندە نەبێ کەخۆی پێی بەخشیون، کورسیو شکۆمەندی و زانیاری خودای گەورە گەلێ فراوانترە لەئاسمانەکان و زەوی ، وەپارێزگاری و بەرێوەبردنیان ئێش و ئەزیەتی پێ ناگەیەنێ چونکە زاتی باری خۆی بەرزو شکۆمەندی گەورەو (عظیم)ە .

دیارە خوێندنی ئایەت کورسی بۆیە هێندە چونکە خێرو پڕ بەهرەیە شکۆمەندی و عەزیمێتی خوای گەورە یادی ئادەمیزاد دەخاتەوە، تاکو وورپابێ و بەپیلانەکانی نەفس و شەیتانەکان دانەکەوێ .

ئەوانەی لەرۆژی قیامەتدا ماڵ کاول و خەسارەت مەند دەبن کیتابیان بەدەستی

چەپەوە پـێ دەدرێ ، بێبـاوەڕن بـەخودای عـەزیم و شـکۆمەند هـەر بۆیـەش خێـری هەژارانیشیان بڕاوە، وەکو لەم ئایەتانەی سورەتی (الحاقـة)دا روون و ئاشـکرایە کـەخوای گەورە تیایاندا دەفـەرموێ : ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَـا لَيْتَنِي لَـمْ أُوتَ كِتَابِي(٢٥)وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِي(٢٦)يَا لَيْتَهَا كَانَتْ الْقَاضِيَةَ(٢٧)مَـا أَغْنَـى عَنِّـي مَالِي(٢٨)هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِي(٢٩)خُذُوهُ فَغُلُّوهُ(٣٠) ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ(٣١)ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ(٣٢)إِنَّهُ كَانَ لاَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِـيمِ(٣٣)وَلاَ يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ(٣٤)فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ(٣٥)وَلاَ طَعَامٌ إِلاَّ مِـنْ غِسْلِينٍ(٣٦)لاَ يَأْكُلُهُ إِلاَّ الْخَاطِئُونَ ﴾ الحاقة : ٢٥ - ٣٧ . واتە ئەوەی پـشتی کـردووە لەبەرنامەو پەیامی خودای گەورە روح و گیان و فیترەو عەقڵی خۆی تێـك داوەو فاسـید کردووە، لەرۆژی قیامەتداو لەمەیدانی مەحـشەردا کیتـابی کـارو کـردەوەو بیروبـاوەڕی خۆیـان بەدەسـتی چـەپا وەردەگرنـەوە، جـا لـەداخان و پەشـیمانیان هاواریـان لێ بەرزدەبێتەوەو دەڵێ خۆزیا نەکا ئەم کیتابەم پێ نەدرابایە من نـەمزانی حـاڵ و حیـسابم چۆنەو چۆن نەیە ، ئای خۆزیـا نـەکا هـەر لەبـەین چـووبایەن و زینـدوو نەکرابایەنـەوە ، ماڵەکـەم و سـەروەتەکەم بـێ نیـازی نـەکردم و فریـام نەکـەوت ، دەسـەڵات و دەسـت رۆیشتنەکەم لەبەین چوو و بەهیلاکی بردم ، جاپێی دەڵێن ئەم قسانە نایخوا تازە بیگـرن کۆت و زنجیری دەهەوکێ کەن و فڕێی بدەنە ناو ئاگری جەهەنەدەما پاشانیش لەناو ئاگرا بەزنجیرێکی حەوتا گەز بیبەستنەوە ، دیـارە ئـەم زنجـیرە زۆرە زیـاتر بـۆ ئیهانـەکردن و بێئومێدبوونێتی لەناو ئاگرا دەنا سێ چوار گەز زنجیر بەس بـوو، جـا لەبەرچـی تووشـی ئەوهەموو مـاڵ وێرانیـەو خەجاڵەتیـەو روو رەشـیەی بـووە چـونکە لـەدونیادا ئیمـانی بەخودای عەزیم و شکۆمەندو بەرزو باڵا نەبووە یارمەتی و خـواردنی نەئـەدا بەهـەژاران وەنەخەڵکیشی هان دەدا بۆ ئەمە ، جا ئەم رۆکەی قیامەت کەسێکی غەم خۆرو گەرمی نیە ، تەنها ئاوی زۆر گەرم دەکرێ بەسـەریاو بەگـەروپاو، هـیچ خـواردن و تـەعامێکی خۆشیش نیە، تەنها زوخاوو کێماوی جەهەندەمیان نەبێ ، کەئەمەیە خواردنی کەسانێ روح و گیان و عەقڵ و ژیری و فیترەی خۆیانیان تێك داوەو فاسید کردووە.

## ٣٤ - الغفور

ناوێکه لەناوە جوانەکانی خوای گەورە ، بنەچینەی ئەم ناوە (غفران)ە واتە داپۆشین و شاردنەوەو لێبوردن ..

الغفور : واتە خوای گەورە لێبوردن و لێخۆش بوونی زۆر زۆرە بەردەوام تاوانەکان دادەپۆشێ پاش تەوبەکردن هەرچەندە تاوانەکان بەری ئاسمانەکانی پڕکردبێ یا بەقەد گۆی زەوی بێ یا بەقەد کەفی دەریا بێ ، مادام تاوانبارەکە دان بەتاوانەکەی بنێ و تەوبە بکاو پەشیمان بێتەوەو نەگەڕێتەوە سەر کارو کرداری ناهەموار ، ئەوە خوای گەورە تەوبەو پەشیمانیەکەی لێ قەبوڵ دەکاو بەخششی پێدەدا لەخەزێنەی بێبن و نەبڕاوەی خۆی کەبرێتییە لەگۆڕینی خراپەو گوناهەکانی بەچاکەو ئیحسان و خێر ، ئەم ڕاستیەش وەکو لەم ئایەتانەدا دەردەکەوێ : ﴿قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ الزمر : ٥٢ .

واتە پێیان بڵێ ئەی ئەو بەندانەی زیادە ڕەویتان کردووە بەسەر گیان و نەفسی خۆتانا ، واتە تاوانتان یەکجار زۆرە ، بێ هیوا مەبن لەبەزەیی خوا بێگومان خوا گەر خواستی لێبێ گشت تاوانەکان دەپۆشێ ، ئەو خوایە زۆر لێخۆش بوو میهرەبانە ، هەروەها دەفەرموێ : ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴾ الفرقان : ٧٠ .

واتە لەتاوانباران و بێ باوەڕان ئەوانەی تەوبە دەکەن و ئیمان دێنن وەکارو کردەوەی چاکە دەکەن ئەوە خوای گەورە خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێتەوە بەخێروچاکە ، بەڕاستی خوای میهرەبان لێخۆش بوو تاوانپۆش و بەزەییە .. بەڵام خوای گەورە لەو کەسانە خۆش نابێت کەبەرگری لەڕێگەی خوا دەکەن و لەسەر کوفرو تاوانکاری دەمرن ، وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ ﴾ سورە محمد: ٣٤ .

هەروەها خوای گەورە بۆی هەیە بەخواستی خۆی لەهەر تـاوانێ خـۆش بـبێ ، بەڵام هەرگیز لەتاوانی شیرك و هاوبەش خۆش نابێ ، وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ..﴾ النساء : ٤٨ .

نـاوی (الغفـور) دەرگـای ئومێـدو هیـوا لـەتاوانبارو گوناهکـارە کۆڵـەوارەکان دەکاتەوە بۆ ئەوەی بێنەوە سەر راستە شەقامی ژیان و سەرەنجامی خۆیـان نەفـەوتێنن و ماڵ کاولی نەکەن، چونکە روو زەردی لەدوا رۆژدا ئاگری بلێـسەداری جەهەنـدەم گاڵتـە نیيە گاڵتەی لەگەڵا ناکرێ ، جا هەرچۆنێ بێ ئینسان هۆشـێ بێنێتـەوە بـەخۆیاو ئـەو هەلە بقۆزێتەوە کەغوفرانێتی میهرەبانێتی خودایە ، جانەگەر خوانەخواستە فورسـەت و هەل بەسەرچوو و نەما ئەو کاتە کەس بەهانای کـەس نایـە لەبەدبـەختیو شـەرمەزاری نەبێ هیچیتر بەدوا نایە ، خوا پەنامان بدات بەلێبوردەیی و میهرەبانێتی خۆیەوە .

بەرێزان ناوی (غفور) لەسەر وەزن و کێشی (فعول ، شـکور ، صـبور) لـەزمانی عەرەبیدا ئەم ناوە صیغەی موبالەغەی پێ دەوترێ و بۆ زۆری و بـەکاردەهێنرێ ، وەئـەم ناوە زیاتر لە (٩٦) شوێنا لەقورئانا هاتووە ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کـەلێبوردەیی و لێخۆشبوونی خودای گەورە یەکجار زۆرە ،بەراستی ئەمەش جێگەی بەشـارەت و موزگێنییە بـۆ ئیمانـداران بەگـشتیو وەبـۆ تاوانبـارو گوناهکـاران بەتایبـەتی ئـەم سیفەتەش دیـاردەی شـکۆمەندی و چـاکەخوازێتی خـودای غـەفور دەنـوێنێ هـەروەها سەخاوەت و میهرەبانێتی خوای بێهاوتا دەردەخا .. جا ئەگەر خـودای گـەورە غـەفورو لێبوردە نەبوایە ئێمەی تاوانبارو گوناهکار قوڕو هەشی کێندەرێمان بەسەر خۆ کردبایـە ، کێ هەیە لەگوناهان ببورێ مەگەر خودای غـەفور و رەحـیم نـەبێ، .. دیـاردەی ئـەم هەمووکەون و بونەوەرە فراوانە بەهەر هەموو مـەخلوق و بـەدیهێنراوانی جـۆراو جـۆری ناویەوە، بەو هەموو کارامەو رێك و پێکیـو جوانیـەوە، نیگـای دەسـتی زاتـێکن هـەر غەفورێتی لێدەوەشـێتەوە بـەڵام بـۆ کـێ !! دیـارە هـەر بـۆ کەسـانێك رووەو ئاسـۆی غەفورێتی ئەوا هەنگاو دەنـێن ، رووەو میهرەبـانێتی ئـەوا کۆشـش دەکـەن ، دەرگـای

ڕەحمەتی ئەویان گرتووە بەجێگەی ئومێدو ئاواتیان، وەکو لەژێر سێبەری ئەو ئایەتانە ئەو واتاو مانایە ڕەنگ دەداتەوەو دەدرەوشێتەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَةَ اللَّهِ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ البقرە: ٢١٨ .

﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ ال عمران: ٣١ . واتە خوای گەورە دەفەرموێ ئەی پێغەمبەری خودا ئەی سەردارو سالاری عالەم بفەرموو و بڵێ گەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ گەر ئێوە خواستی لێبوردەیی خوا دەکەن دەتانەوێ لەدەرگای ڕەحمەتی خوا بدەن و تێیدا بچنە ژوورەوە فەرموون بەدوای ڕێگەکەی من بکەون، ڕێگاکەی من بگرنە بەر، ئالەم ڕێگایەیە خۆشەویستێتی خودایی دەرگای لێبوردەیی گوناهان و دەرگای ڕەحمەتی خودایی دەرگای هەمیشە بەختیاری ، بەڵێ بەختیاریو ئاسودەییو دڵفراوانی عیززەت و شکۆمەندی هۆشیاریو زانیاری، خۆشەویستی و برایەتی هەموو دەرگاکانی خێرو بەهرە ئالەوێدان، ئەم دەرگایە لێبوردەیی خودایە کەرۆژانە چەندین کەسانێ پێیەوە شادمان دەبن و، دونیای فوسق و گوناه بەجێ دێڵن و، ڕووەو ئەو ئاسۆیە فراوانە دڵ تەزێنە هەنگاو دەنێن، ئەو جارە لەجیاتی گوناە و تاوان دەست دەکەن بەخێرو چاکە دەست دەکەن بەبەخشین و ئیحسان، لەهەوڵدان بۆ قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوویان، بۆ شکۆمەندی و بەرزی و بۆ ڕووسپی بوون و جیرانێتی هەتا هەتایی خودایی..

خۆی ئەو دەرگایەش یەکێکە لەدەرگاکانی ڕەحمەتی خودایی، خەڵکان و مەردوومان پێیەوە بەهرەمەند دەبن وەخەڵکانێکی تریش پێیەوە ئاسوودەو دڵنیا دەبن ، لەشەڕو گێچەڵی هەندێ لەگوناهکاران و تاوانباران ڕزگاریان دەبێ و بۆیان بەبەهرەو خێری چاوەڕوان نەکراو دەگۆڕ درێنەوە .

ئازیزان : زاتی باری کەغەفورو ڕەحیمە خۆشی لەوە دێ ئێمەی ئادەمیزادیش ئەم سیفەتە بکەین بەئاشناو دۆستی خۆمان و خوو ڕەوشتمانی پێ ئارایش بدەین ، چونکە بەڕاستی ئێمەی ئادەمیزاد زۆر زۆر پێویستیشمان بەلێبوردەیی یەکتر هەیە تاکو ژیان

خۆش بیّ تاكو گیانی تەعاون و هاریكاری و هەروەزی ئاسۆی تەسك نەبێتەوە ، بـابزانین ئێمەی ئادەمیزاد كەموكوڕیمان زۆرە لەزۆر ڕوو لایەنـەوە، ئەگـەر لەیـەك تـر نـەبوورین چاوپۆشی لەیەكتر نەكەین ئیدی دەرگای فیتنـەو ئاشـوب هەمیـشە هەروالآیـە، ئێمـەی ئادەمیزادی هاو ڕەنگ ئەگەر لەیەكتر بەداوەبەن وەكەین وەكـو ووتویانـە ئـەوە هـەرگیز ئیدارە ناكەین و ژیان لەیەكتر تالّ دەكەین ، وەلەبیریشمان نەچێت كەحەق و مافمان زۆرە بەسەر یەكترەوە ، دەبا لەئاست كەموكوڕی یەكترا گیانی لێبـوردەیی و عـەفومان بێتـە جۆش ، تاكو خەلكانیتریش لەئاست ئێمە ئاوابن..

لەكۆتاییدا دەلّێین : ربنا اغفر و ارحم وانت خیر الراحمین ..

## ٢٥ - الشكور

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای تاوان پۆش ، بنچینەی ئەم نـاوە (شـکر)ە واتـە سوپاس گوزاری ..

الشکور : واتە خوای گەورە پەروەردگارێکە زۆر سوپاس گوزارەو زۆر دەبەخـشێ لەبەرامبەر کارو کردەوەی کەمەوە ، مادام ئەم کارو کردەوەیە بەپاك و رێکـی بـێ وەیـا بەبێ ریایی‌و روپامایی ئەنجام درابێ ، لەگەڵ ئەوەش کەنازو نیعمەت هەر ئی خۆیـەتی‌و بەخشیویەتی بەڵام بەندەکان بەجوانی و رێکی سەرپەرشتی ئەم نـازو نعیمەتـە دەکـەن و هەژاران و داماوانی لێ بێبەش ناکەن ، جا خوای گەورە ئەم جۆرە بەندانەی خۆش دەوێ و لێیان دەبورێ و چاکەیان وەردەگرێ ..

هەروەها خوای گەورە سوپاسـی ئەوکەسـانەش دەکـات کەسـوپاس و ستایـشی دەکەن ، ئەمـەش بـۆ بەنـدەکانی بـەعیبادەت دادەنـێ ، وەکـاتێ دۆسـتان و نـازیزان و چاکەکاران لەبەهەشتا بەیەك دەگەن سـڵاوی خۆشەویـستی و پیرۆزبـایی نـازو نیعمـەت لەیەك دەکەن ، شادمانی دایان دەگرێ وەهـەموویان بەیەکـەوە سوپاسـێتی پـەروەردگار دەردەبڕن وەك دەفـەرموێ : ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَــكُورٌ ﴾ فـاطر : ٣٤ . واتـە بەهەشـتیان سـوپاس و سـتایش دەردەبـڕن بـۆ ئـەو پەروەردگارەی کەباری غەمگینی و کەم و کوڕی لەسەر هـەڵگرتین و لادایـن ، بەڕاسـتی پەروەردگارمان لێ خۆش بوی زۆر سوپاس گوزارە ..

سوپاس و ستایش دەربڕین بەرامبەر خوای گەورە زۆر مانـاو باسـی لێـوە دێتـە کایەوە ، لەمانە باوەڕکردن بەنیعمەتی خوایی‌و راستی‌و دڵسۆزی و وەفـاداری بەرامبـەر بەچاکەکار ، وەرگرتن و قەبوڵ کردنی باری منەت و درەوشانەوەی تیشکی خۆشەویـستی .. ئادەمیزاد دەبێت خۆی برازێنێتەوە لەم سیفەتە خواییە چاکە پۆش نەبێت و سوپاس گوزاری برای ئیمانداری بکات بەرامبەر بەهەر چاکەیەك کەلەگەڵیا دەکرێت .. سـوپاس گوزاری هێمنی ئەبەخشێ بەدەرونەکان و پەیوەندی و خۆشەویستی نێوان تاکـەکان زیـاد

دەکاو پەرە بەچاکەکاری دەدا ، وەخوای گـەورەش دەفـەرموێ : ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾ ابراهيم : ٧ .

واتە : پەروەردگارتان پێتان رادەگەیەنێ گەر سوپاس گوزاری بکەن لەسەر نـازو نیعمەت بەڕاستی بۆتان زیاد دەکەم و پەرەی پێدەدەم ، وەئەگەر داپۆشەری نازو نیعمەت بن و بێباوەڕبن بەڕاستی ئازارەکەم بۆیان سەختە ، هەروەها دەفـەرموێ : ﴿بَـلِ اللَّـهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ الزمر : ٦٦ .

زاتی باری کەخۆی شەکورە چـاکەی چـاکەی لەبەرچـاوە هـەوڵ و تەقـەلای پیـاو چـاکان فەرامۆش ناکاو رەنجیان بەفیڕۆ ناداو سوپاسـیان دەکـاو ڕێزیـان لێـدەگرێ و بەباشـترین شێوە پاداشیان دەداتەوە ، وەهەڵیان دەنێ بەوەی کەئەوانیش لەبەینی خۆیانـا سـوپاس گوزاربن چاکەو خێرو بێری یەکتر بەکەم سەیر نەکەن و یەکتر بێ منەت نەکەن و ئـازاری دڵ و دەروونی یەکتر نەدەن ، خودای شەکورو باڵادەست لەکیتابـە پیرۆزەکەیـدا چـەندین ئایات و نیعمەت و بەهرەی خـۆی بـیری ئـادەمیزاد دەخاتـەوەو داوای پـاکیەو سـوپاس گوزاری و شوکرانەشی لێدەکات، وەك لەم ئایەتانەدا رەوشەن و ئاشکرایە کەزاتی شەکور دەفـەرموێ : ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل٧٨ .

واتە : زاتی (الله) خودای باڵادەست ئێوەی لەزگی دایکتانا دەرکردووەو لەوکاتـە ئێوە سست و بێتواناو بێ زانیاری بوون هیچ شتێکتان نەدەزانی ، کەواتە ئەوڕۆ مـەغرور مەبن بەزانیاریەکانتان و، بەبەهرەی خوداو نیعمەتی بزانن نەیکەن بەمایـەی گومڕاییـو وێڵیو فوسق و فەسادەوە ، هەروەها گوێ و چاو و دڵ و هەست و شـعور و عـەقڵی پـێ بەخشیون، بەئومێدی ئەوەتان رێگەی خودای گەورە بگرنە بـەرو حـەقی ئـەو ئەندامانـە بدەن و لەشوێن خۆیانا بەکاری بهێنن و سـپڵەو بەدنـەك نـەبن بـەڵکو سـوپاس گـوزارو شوکرانە ژمێری بکەن و چاکەو نیعمەتانتان لەبەرچاوا بـێ .. هـەروەها خـودای شـەکور لەسورەتی (یس)دا لەئایەتانی (٧١ ، ٧٢ ، ٧٣)دا دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَـا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ(٧١)وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا

يَأْكُلُونَ(٧٢)وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلاَ يَشْكُرُونَ ﴾ .

واته ئايا نابينن و ناڕوانن وەتێـی ناگـەن لـەوەی کەئێمـە بـۆ ئـەوانمان خـەلق کردووەو بەدیهێناوە لەجۆرەها ئاژەڵ و مەڕومالآت، کەجێگەو دیاردەی دەسـت و کـاری باڵاو بەرزی ئێمەیە کردومانە بەماڵ و موڵك بۆ ئەوان، لەو ئاژەڵانە کەحوشـترو مانگـاو مەڕو بزن و جۆرەکانیانە لەوەی کەبۆ سواری بەکاری دەهێنن لەوەی کەبەخواستی خۆیان دەیکوژنەوەو دەیخۆن ، هەروەها جۆرەهـا سـوودی لێ دەبیـنن لـەخێرو بێـرو خـواردن و خواردنەوەی، کەسەرتاپای نیعمەتە ئایا هێـشتا ئێـوە حـاڵی نـابن و شـوکرانەی خـوای گەورەی لەسەر ناکەن ، تا بەڵکو شوکرانەی خوای لەسەر بکەن بـەوەی ئیمـان بهێـنن و ڕێگەو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی بگرنەبەر .

زاتی شەکور (جل جلالە) لەوەی کەداوای شوکرانەمان لێدەکات وەنەبێ پێویـست و بەشوکرانەی ئێمە بێت نەخێر ، بەڵکو خودای باڵادەست خـۆی چـاکەخوازو خێرخـوازو بەخشندەو بەهرەبەخشە ، خۆشی و چاکەو پاکێتی ئادەمیزادەکانی دەوێ ، بـەو سـیفەتە ئادەمیزادەکان بەرزو پیرۆزو پاك دەبـن، وەشـیفای نەخۆشـیانی دڵ و دەروونیـان دێـت، وەمایەی کامەرانی و سەعادەتی خۆیانە ، دەنا خوای گەورە بێ نیازو پێویستە گـەرەکی بەهیچ نیە .. وەکو لەم بارەوە لەسورەتی لوقمان خـودای شـەکور دەفـەرموێ لەئایـەتی (١٢)دا : ﴿..وَمَنْ يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيـدٌ ﴾ واتـە بەڕاستی ئەوەی شـوکرانەی نیعمـەتانی خـودای گـەورە بکـات و ڕێگـەو ڕێبـازی ئـەو بگرێتەبەر ئەوە نەفس و گیانی خۆی بەهرەمەندو پیرۆزو باڵاکردووە وەسەرجەم خێروبێـرو بەهرەی ئەم شوکرانەی بۆ نـەفس و گیـانی خۆیـەتی ، بـەڵێ ئـەوە زاتـی بـاری ڕەحمـی بەئادەمیزادەکان کردووە بەوەی دەرگای شوکرانەو سوپاسی بۆ خـستوونەتە سـەر گـازی پشت ، جا ئەوەی کوفرانی نیعمەتی خوای گەورە بکات پشت لەبەرنامـەی بکـات ئـەوە بێگومان زاتی (اللە) شەکوری بێنیـازو خـۆی دەوڵەمەنـدە لەهـەموو ڕوویەکـەوەو بـێ پێویست و گەرەکە خاوەن شکۆو ستایش بۆ کراوە ..

زاتی شەکور (سبحانە وتعالی) مەدحی حەزرەتی (نـوح) علیـە الـصلاة والـسلام

دەكات كەعەبدو بەندەیەكی شەكور بـووە وەك دەفـەرمویٚ : ﴿ .. إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴾ الاسراء: ٣ .

بەڵێ ژیانی حەزرەتی (نوح) علیه الصلاة والـسلام یەك پارچە دەعوەو بانگەوازی خەڵك بووە بۆ خوا، ئەوە مانای شەكورێتی دەگەیەنیٚ ، شەكورێتی خـودای گـەورە ئـاوا دەبیٚ وەكو لەژیانی حەزرەتی نوحا و باقی پێغەمبـەرانی تـر (علـیهم الـصلاة والـسلام) رەونەق دەداتەوە ، هەروەها زاتـی شـەكور (عـزّ وجـلّ) لەسـورەتی ئیـسرادا لەئایـەتی (١٩)دا دەفـەرمویٚ : ﴿وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ كَـانَ سَعْيُهُمْ مَشْكُورًا ﴾

ئەوەی خواستی رۆژی دوایی‌و قیامەت بیٚ ئەو كۆششە بكا كەمایەی سـەرفرازی و روسپێتی‌یە لەمەیدانی مەحشەردا، ئەو هەوڵ و تەقەلایەش لەژێر ئـالاّی ئیمانـدارێتی بیٚ‌و خۆی خاوەن باوەڕبیٚ، ئا ئەوانە كۆشش و كردەوەكانیـان جێگـەی بـەهرەو سـوپاس گوزاری‌یە، پەشیمانی بەدوایا نایی‌و خاوەنەكەی بەرز دەكاتەوە لەلای خودای شەكورا .

هەروەها زاتی شەكور (سبحانه وتعالی) باسی سەرەنجامی خواناسانمان بۆ دەكات لەسورەتی (الانسان) كەلەناو بەهەشتا لەناو نـازو نیعمـەتان ، پاداشـی صـەبر گرتنیـان لەسەر رێگەو بەرنامەی خوای بالآدەست، بەهەشت و پۆشـاكی حـەریرە كـەتیایا لەسـەر قەڵەوێران پالكەوتوون سەرماو گەرما نابینن و بەروبومی درەختەكانی بەهەشـت بۆیـان داكەوتوون بەچاكی‌و ساكاری نۆشی دەكەن، بەكوپ و پەرداخی زیوینی جۆرەها شـەرابی خۆشیان بەئەندازەی رێك و پێك پیٚ دەبەخشریٚ ، هەروەها شەرابی تێكەڵ بە زەنجـەبیل و كانیاوی بەناو سەلسەبیل و جۆرەها نیعمەتانی جۆراو جۆری تریش جا پاش ئـەم هـەموو نیعمەتە ماددیانە خوای گەورە پێیان دەفەرمویٚ : ﴿إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَـزَاءً وَكَـانَ سَعْيُكُمْ مَشْكُورًا ﴾ .. بەڵێ ئەوە پاداشتانەو كۆشش و سەعیـشتان وەرگـیراوو جێگـەی شوكرو سوپاسی‌یە .. ئەمەش خۆی لەخۆیدا جۆرە بەهرەیـەكی مەعنەوی‌یـە كەمایـەی ئاسودەیی‌و بەختەوەری دڵەو هەروەها مایەی رێزو بەهرەو پیرۆزی‌یە ..

## ٣٦ - العلي

ناوێکە لە ناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای سوپاس گوزاری شەکور ، ئەم ناوە (١١) جار لەقورئانا هاتووە ، بنچینەکەی - علو -ە واتە بەرزی و بڵندی ..

العلي : واتە خوای گەورە پەروەردگارێکە بێ وێنەیە لەبەرزی و بڵندی ، هەرچی هۆشیاران و زانایان هەیە لەئاستییەوە نزم و مەلولن ، بەرزی و بڵندی ئەو پەروەردگارە زانیاری و بیرو هۆشی هیچ کەسێ پێی ناگاو لێی نـازانێ و، وەلەزانینیـەوە سەرسـام و پەشۆکاوو داماون ..

بەرزیو بڵندی خوای گەورە لەگەڵ هیچ شـتێکا بـەراورد ناکرێـت ، هـەر خـۆی دەزانێ لەپلەو پایەی بەرزو بێسنوری، سنورو ژیری ئادەمی پەی پێ نابـات ، لەهـەموو بەرزان بەرزترە، وەلەهەموو بڵنـدان بڵنـدترە ، هـەموو بـەرزو بڵنـدێ لەئاسـتیا نزمـەو وەهەموو شتێ والەژێر دەسەڵات و رکێفی ئەوایە ..

ئەم سیفەتە تایبەتە بەپەروەردگاری مەزنەوەو هـەر کەسـێ لەدەرونیـەوە خـۆی بباتە ژێر ئەم سیفەتەو بەخۆی بنازێ و ئەوا خوای گەورە ریسوای دونیاو قیامەتی دەکاو لەبەهەشتی پڕ نازو نیعمەتی بێ بەش دەکا ، توشی ئەشکەنجەو ئازاری دۆزەخی دەکـا ، چونکە نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ ئەو کەسانەیە کە نایانەوێ بەرزی و بڵنـدی بنـوێنن و وەکۆشش ناکەن بۆ بەدکاری و فەسـادی وەك دەفەرموێ : ﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَـا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ القصص : ٨٣ ..

بێگومـان ئـەم سـيفەتەی خـوا والـەدەروونی بەنـدەکانی دەکـات کـەمرۆڤی چاکەویست و دڵسۆزی لێ بێتە کایەوەو ، وەعاشـقی دادپـەروەرێتی و ئاشـتیو یەکسانیو مرۆڤایەتی بێت.. ای گەورە لەبارەی بەرزێتی خۆیدا دەفەرموێ : ﴿ ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُـوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾ لقمان: ٣٠

واتە زاتی شکۆمەندی (اللە)ی بێ وێنە خۆی حەق و راستەو دادپەروەرە، وە ئـەو هاوارو ئومێدەی کەئەیبەن بۆ غەیری خوا ئەوە بـەتاڵ و پـڕو پووچـە ، بەڕاسـتی خـوای

گەورە زۆر بەرزو بڵندو گەورەیە .. هەر ئەو شـایانی نـاوبردن و هانـا بـۆ بـردن و پـەنا پێگرتن و پشت پێ بەستنە .

هەروەها دەفەرموێ : ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ شوری : ٤ .

واتە بۆ خوایە ئەوەی وا لەئاسمانەکان و زەوییە ، ئەو خوایـە زۆر بـەرزو بڵنـدو گەورەیە..

فراوانی ئەم کەون و بونەوەرە شاهێدە لەسەر بەرزی و بڵنـدی ئـەو زاتـە پـاك و پیرۆزە، هەروەها مێژووی دێرینی گشت بەدیهێنراوەکان لەوانەش بەتایبـەتی ئـادەمیزاد هەر شاهێدی و گەواهی دەدەن لەسەر بەرزیو شکۆمەندی زاتی باری .. لەبابی فـیترەی ئادەمیزادیشەوە کەسەلێندراوەو روونە کەزاتی باری تابڵێی بڵنـدەو بـەرزە ، لـەکاتێکا کەئادەمیزاد ناچار دەبێ یا گیرۆدەی دەردو بەڵایێ دەبـێ کەمایـەی بـێ هیـوی و هیـوا براوییە لەدەوروبـەری ماددیـاتی، ئەوکاتـە یەکـسەر رووەو زاتـی بـاری دەگەڕێتـەوە، لەدەرونیا هاواری لێهەڵدەستێ بەنزاو پاڕانەوە رووەو زاتی بەرزو باڵا دەڵـێ ئـەی زاتـی شکۆمەند ئەی خواوەندی بێ وێنە ئەی بەرزو بڵندی هەمیشەیی دەرمان و چارەی هەموو دەردو گیروگرفتێ لەلای تۆیەو هیچ لای تۆ عاسی نابێ تۆ لەوە بـەرزتری گـرێ کـوێرەو دەردو بەڵاو گیروگرفت لێی بوەستی ، خواست و ویست و ئیرادەی پڕ حیکمەت و دانایی تۆیە بەڕێوەبەری گشت کەون و کائیناتە بەماددییات و مەعنەویاتەوە، بـەڵێ کـەون و بونەوەر مێژوو فیترەی ئادەمیزادەکان و فریشتەکان گشت شاهێدن لەسەر بەرزی و بڵندی و شکۆمەندی زاتی بێوێنە خواوەندی ئازیز .. خودای شکۆمەند و باڵا دەست لەسورەتی غافر لەئایەتانی (١٠ ــ ١٢) دا دەفـەرموێ : ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّـهِ أَكْبَرُ مِنْ مَقْتِكُمْ أَنْفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ(١٠)قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَـيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ(١١) ذَلِكُمْ بِأَنَّهُ إِذَا دُعِـيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِنْ يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَـبِيرِ﴾ کـاتێ کـەکافرو

بێباوەڕەكان لەسەر كۆنەو لۆمەی یەكتری لەمەیدانی مەحشەرا، تووڕەیی و ناڕەزایی و بێزاری خۆیان لەئاست یەكا دەردەبڕن، هەریەكەی مایەی گومڕابوون و وێڵی خۆی لەچاوی دۆست وهاوبیرو هاودەمی خۆی دەزانێ و لێی قەلس و تووڕەیە .. ئالەو كاتەدا بڕیاری خودایی پێیان دەگاو بانگیان لێدەكرێ كەتووڕەیی‌و خەشم و قینی خودایی گەلێ گەورەترو زیاترە لەوەی ئێوە لەیەكتری دەكەن، ئەوەبوو كاتێ كەبانگ دەكران بەلای ئیمان و باوەڕا پشتتان تێی دەكردو پێی بێباوەڕبوون ، تا لەو كاتە دەڵێن پەروەردگارا لەنەبونا ئێمەت هێنایە بوون و ژیان پاشان ئێمەت مراندو دیسان ئێمەت هێنایەوە ژیان لەم مەحشەرو قیامەتەدا جائێمە دانمان نا بەگوناه و تاوانەكانمان ئایا چارە رێگەیێ هەیە لێی رزگاربین ؟! نەخێر لەبەر ئەوەتان كاتێ بانگی بیروباوڕی یەكتاپەرستی بانگ دەكرا، دەووترا وەرن بەرەو ئیمان هێنان بەزاتی (اللە)ی تاك و بێ هاوەڵ بێ باوەر دەبوون پێیەوە ، بەڵام ئەگەر بانگ كرابان بۆ بەزمی هەوا ئارەزوو ، بۆ دواكەوتن بەدوای نەفس و شەیتان ، بۆ بێ دینی و پەرستنی جیهان باوەڕتان پێی دەكردو بەرەو پیری دەچوون ، بێ لێكۆڵینەوەو تێڕوانین و چەن و چۆن، جا ئەمڕۆ چارەی ئێوە تەنها پەشیمانی و رووڕەشی و ئاگری جەهەندەمە ، تەنها ریسوایی غەم و پەژارەو فیغان و شەڕە دەمە ، تەنها ئازارو ئەشكەنجەو قەهرو غەمە ، ئەمە بڕیارو حوكمی خودایە ، فەرمانڕەوایی هەر بۆ ئەوایە، خۆی بەرزو بڵندو شكۆمەندە ، خۆی گەورەو باڵاو بەهرەمەندە ، بەهرە دەبەخشێ بۆ خواپەرستان ئەوانەی بەدین ژیانیان نەخشاند، خودای بەرزو بڵند باڵایان دەكا پلەو پایەی زۆر رویان تێ دەكا ، ئەوەی بێ دینەو خوای گەرەك نیە ، لەرۆژی دواییش هیچی بۆ نیە ، هەڵوێست و كاری سەری دەخواتن بەرەو ئاگری دۆزەخ دەیباتن ، خەتایی من نەبوو خەتای فلانی بوو بریاو خۆزیانا وانە باو وابوو، ئەمانەش خۆیان جۆرە دەردێكن هەم قەهرو عەزاب ئاهی ساردێكن، كەی خۆزیاو بڕیا بەری گرتووە چی دەدوریەوەو چیت نەچاندووە، سونەتی خوایی بەرزو باڵایە خۆی شكۆمەندە هەتا هەتایە ، ئەوەی نەناسێ ئەم زاتە بەرزە كارو دوا رۆژی هەر لەرزە لەرزە

## ٣٧ - الكبير

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای بەرزو بڵند ، ئەم ناوە (٦) جار لەقورئانا هاتووە کەمەبەست سیفەتی خوای گەورە بێ ، بنچینەی ئەم ناوە (کبر)ە واتە گەورەیی .

الکبیر : واتە خوای گەورە پلەو پایە بڵندو بەرزو گەورەیە ، گەورەیی ئەم میهرەبانە سنورەکەی فراوانترە لەبیرو زانیاری ئادەمیزاد ، وەبە بەشە هەستیارەکانیش هەستی پێ ناکرێ ، گەورەیی خوا نەبەستراوەتەوە بەکات و ئان و ساتێ و، لەهەموو ڕوو لایەنێکەوە هەر پایەدارو لێهاتووە ، هاو وێنەی نیەو نەبووە ، خۆی نەبێ کەسێ نازانێ لەگەورەیی و بەرزی ئەم زاتە ، هەموو گەورەو بەرزان لەئاست گەورەیی خوا نزم و داماوەو مەلولە ، وەك دەفەرموێ : ﴿..إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴾ النساء: ٣٤ . واتە بەڕاستی خوا زۆر بەرزو گەورەیە ، وەدەفەرموێ : ﴿..وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ..﴾ العنكبوت : ٤٥ .

بەڕاستی هەموو دڵ و دەروونانی خواناسان سەرسامە لەبەرامبەر ئەم تەعبیرە قورئانیانە ، وەهەرچی ئادەمیزاد بیلێ بەرامبەر مانای ئەم سیفەتە بەرزانەی خواوە ، مافی خۆیان ناداتێ وکەم دەنوێنێ و نەوەك زۆر ، مەگەر هەر قورئان خۆی بتوانێ مافی ئەم سیفەتە بەرزانەی پەروەردگار بەتەواوی بدات ، وەکو دەفەرموێ : ﴿ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴾ الرعد : ٩ .

واتە : خوای پەروەردگار زانایە بەنادیارو دیارەکان خۆی بەرزو گەورو شکۆمەندە ، هەروەها خودای بالادەست دەفەرموێ : ﴿وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ الجاثية : ٣٧ . واتە گەورەیی و بەرزی و شکۆمەندی هەر بۆ زاتی خودای گەورەو بالادەستە لەئاسمانەکان و لەزەویدا، زاتی خودای پەروەردگار خۆی پایەبەرزو شکۆمەندو ئازیزو داناو حەکیمە .

وەئیمامی (محمد)ی کوڕی عبدالوهاب لەکیتابی تەوحید ئەم سێ فەرمودەیەی

هێناوەتەوە لەلاپەڕە (٢٢٦) کەفەرمویەتی :

} ما السماوات السبع في الكرسي الا كدراهم سبعة القيت في ترس (أي قلغان) {

واتە : حەوت ئاسمانەکان لەچاو کورسی تەنها وەکو حەوت درهەم وان کەبخەیتە تەشتێ ، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێ : (وما السماوات السبع في كفّ الرحمان الا كخردلٍ في يد أحدكم) واتە حەوت ئاسمانەکان لەدەستی قودرەتی خودای رەحمان تەنها وەکو خەرتەلەیەك وان لەدەستی یەکێ لەئێوە ، هەروەها پێغەمبەری سەردارو سالاری خۆشەویستمان دەفەرموێ : (بين السماء الدنيا والتي تليها خمسة مئة عام وبين كل سماء خمسة مئة عام وبين السماء السابعة والكرسي خمسة مئة عام والعرش فوق الماء والله فوق العرش لايخفى عليه شيء من اعمالكم) واتە : بەین و مەسافەی ئاسمانی دونیاو ئاسمانی دوایی ئەو پێنج سەد ساڵە ڕێیە ، وەبەین و مەسافەی هەر ئاسمانێ و ئاسمانێ تری دوای ، پێنج سەد ساڵە ڕێیە ، وەبەین و مەسافەی ئاسمانی حەوتەمین و کورسی ، پێنج سەد ساڵە ڕێیە وەعەرشی خودای گەورە لەسەر ئاوە ، زاتی بەرزو گەورەو باڵا لەسەروی عەرشەوەیە ، هیچ شتێکی لێ شاراوەو وون نیەو نابێ لەکارو کردەوەیی ئێوە ..

ئەوەی لەئاسمانا وورد بێتەوەو ئەم فەرموودانەش بخاتەوە یادو بەرچاوی خۆی، وەپرشنگێ لەنوری هیدایەتی خودای بەردڵ کەوتبێ دەزانێ و تێدەگا کەگەورەیی خودای گەورە شایانی مل بۆ کەچ کردنەو ڕێزلێنانە .. بەڵێ ئەم ئاسمان و زەوییە ئەم بەرزو نەوییە ئەم رەش و سپییە ئەم درێژی و پانیيە ، ئەم بوون و مردنە ئەم هات و چوون و بەرێبردنە لەگەڵ باقی ئەوانی تریش بەوەی دیارەو بەنادیاریش، هەرچیەکی هەن هەر لەو باسەدان باسی گەورەی و مەزنی میهرەبان، بۆ زاتی پاکی خاوەندی جیهان خالقی گیاندارو بێ گیانەکان، ئەی زاتی پاك ئەی شکۆمەندی بێ وێنە ئەی ئاواتی بێداران ئەی پشت و پەنای هۆشیاران ئەی خۆشەویستی عاقڵان ئەی دۆست و هاوەڵی پاك دڵان

ئەی نوری نور پەخشی بێ مەکان، کێ هەیە لەگەورەیی تۆ حالّیبێ مەگەر یەکێ تۆ کەمێکت پێ بەخشیبێ مەگەر یەکێ نوری لەتۆوە پەرِیبێ ، مەگەر یەکێ حەلاوەی ئیمانی نۆشیبێ ، مەگەر یەکێ بەعەشقی تۆوە خەنیبێ ،نازیزان خودایگەورە میهرەبانی بێ وێنە ئادەمیزادەکانی خۆش دەوێ و ئاینی خۆی لەناویانا سەرخستووەو هەر رۆژێ چەندین کەرِەت لەکاتانی جیاجیا بەبلّندگۆیان بانگەوازە ، بانگی بێدارییە باس کردنی کرۆکەی حەق و راستییە تۆقاندن و راونانی شەیتانی لەعنەتییە الله اکبر .. الله اکبر .. الله اکبر .. دوبارە لەدوای دووبارە بۆ ئەو ئادەمیزادە بێچارە، یادی دەخاو تێی دەگەیەنێ (الله اکبر) زاتی (الله) خواوەندی مەزن تاکی گەورەی بێ وێنەیە ، لەگەورەیی هەر ئەو هەیە ، گەورەیی ئەو بێ سنورەو بەبێ وەیە ، جا ئەم زەوییە خوا پەرستە خول دەخواتن بەو یاسایە رێك و چوستە، کات و نیدای بانگ دانەکان ، دەگێرێتەوە بۆ گشت جیهان، لەهەموو لاوە چەند بارە الله اکبر دووبارە لەدوای دووبارە ، ماناو واتای پوختەیی وایە ئەی ئادەمی ، ئادەمیزادی عالەمی ، گەورەو خوایە ئێوە بەندەن ، لەم دونیایە ، وەرن رووکەن بۆ گەورەتان دەبنە پاشای هەردوو جیهان ، نەبنە بەندەی نەفس و شەیتان وان بێ وەفان شایستەنین بۆ روتێنان ، دوژمنتانن لەگشت جیهان ، مێژوو ئێستاو داهاتووتان دژبەخوداو حەق پەرست و یارو دۆستان .

## ٢٨ - الحفيظ

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە ، بنچینەکەی (حفظ)ە واتە چاودێری و پاراستن (الحفیظ) یانی پەروەردگاری مەزن چاودێرو پارێزەری هەموو شتێکە .. وەهەرشتێ گەر خوای گەورە چاودێری نەکاو نەیپارێزێ دەفەوتێ وبەرەو نەمان دەڕوا ، هەروەها خوای میهرەبان پارێزگارو پارێزەری لەبیرو باوەڕەکان و هەڵگرانی دەکاو کارو کردەوەیان دەژمێرێ و دەپارێزێ بۆ ئەوەی دوا ڕۆژ هەریەکە بەئەنجامی تەواوی خۆی بگاو بەقەد زەڕڕەیێ ستەم و زوڵمی لێ نەکرێ ، وەچۆنیەتی ئەم پاراستنەش هەر خوا خۆی دەیزانێ ، وەبەدیهێنراوەکان مافی ئەوەیان نەدراوەتێ کەلەتەواوی کارو کرداری خوا بگەن ، وەیان پارێزیو چاودێری لەشتێ بکەن ، مەگەر بەئیزن و خواستی خوا نەبێ ، ئەم میهرەبانە باشترین پارێزەرو وەبەزەیی‌ترینی بەزەییانە وەك دەفەرموێ : ﴿..فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ یوسف: ٦٤.

هەروەها خوای گەورە پارێزەری ئیماندارانەو کۆسپەکانی ژیانیان بۆ ئاسان دەکاو، وەبەگیانی بەرزی پیرۆز یارمەتیان دەدا ، وەپارێزەری بەرنامەو کیتابەکەیەتی بۆ ئەوەی بەکۆمەڵانی مەردووم ڕابگەیەنێ و هۆشیاران لەنوستوان جیابکاتەوە مافی هەریەکەیان بداتەوە ، چونکە پێغەمبەرمان (محمد) ﷺ کۆتایی پێغەمبەرانە ، ئیتر هیچ پێغەمبەرێ نایێ بەبەرنامەو یاساوە تا ئەم دونیایە دێتە کۆتایی .. وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ الاحزاب

واتە محمد ﷺ باوکی یەکێ لەپیاوانی ئێوە نیە بەڵکو نێرراوە فرستادەی خوایە وەدواهەمین پێغەمبەرە ، بێگومان خوای گەورە بەهەموو شتێ زانایە، ئیمانداران پێویستە لەسەریان خۆیان برازێننەوە لەم سیفەتە خواییە ، پارێزگاری دادپەروەری و دادوەری بن ، وەکارو کردارو ڕەفتارو بەرنامەو یاسای خوا بپارێزن ، وەك چۆن لەلای خوا فەرمانیان پێکراوە ، وەلەسەر ئەم کارە مەدح کراون وەك دەفەرموێ : ﴿ .. الآمِرُونَ

بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنْ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُـدُودِ اللَّـهِ وَبَـشِّرْ الْمُـؤْمِنِينَ ﴾ التوبه:١١٢ .

واته : ئەوانەی فەرمان دەکـەن بەچـاکەکاریو قەدەغـە دەکـەن لەخراپـەکاریو پارێزەری بەرنامەو سنوری یاسای خودان ، مزگێنی و موژدە بدە بەو خاوەن باوەڕانە ..

وەخوای گەورە خۆی پارێزگاری لەکیتابەکەی دەکـات و بـڵاوی دەکاتـەوە ، وەك لەم دوو ئایەتە روون و ئاشکرایە ، کەدەفەرمویٚ : ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الـذِّكْرَ وَإِنَّـا لَـهُ لَحَافِظُونَ ﴾ الحجر : ٩.

واتە : ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو خۆشمان پارێزگاری لیٚدەکەین ، هەروەها دەفەرمویٚ ﴿ ثم إنّ علينا بيانه ﴾ القيامة

واتە ئەی (محمد) - ﷺ - گەر قورئانتمان بۆ خوێندەوە تۆ پەیڕەوی بکەو ریٚگـە بەرمەدە ، پاشان لەسەر ئێمەیە بەمەردومی بگەیەنین .. ئەم راستیەش بەڵگەنەویستە ، وەك ئەمڕۆی رۆژگار کەم کونجیٚ و کەلەبەریٚ ماوە قورئان خۆی نەگەیاندبیٚ و هۆشیارانی دڵ نەفراندبیٚ !!

حافیزێتی خودای باڵادەست لەم کەون و بونەوەرەدا لەرۆژی روناك ئاشکراترە هەم لەروی ماددیات و هەم لەرووی مەعنەویاتـەوە هـەم، لـەڕووی زاهیری‌ـو هـەم لـەڕووی باتنیەوە ، ئائەوەتە ئـەم کەونـەو بونـەوەرە پـڕ لـەم هـەموو بـەدیهێنراوو مەخلوقاتـە بەدرێژایی ملیۆنان ساڵ بەردەوام بەزمانی حاڵ لـەحافیزێتی و پارێزگـارێتی خـودای بـیٚ هاوتا دەدویٚ و شاهێدی لەسـەر دەداو دڵـی بێـداران رەوشـەن دەکاتـەوەو ، بیٚئاگایـان لەناسینی خودا واگا دێنیٚو ، هەزارەها دەرس و وانەیان بەرچاو دەخا ، هـەر هـەموویان وەك و خزمەت گوزارێکی بەندە رام و موسەخخەرە لەخزمەتی بـەرەی ئـادەمیزاد وەکـو زاتی حافظ دەفەرمویٚ : ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الـسَّمَاوَاتِ وَمَـا فِـي الأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ..﴾ لقمان : ٢٠ .

ئایا تیٚی ناگەن و نابینن کەزاتی (الله)ی حافظ، بـۆ ئێـوە رام و موسـەخخەری

کـردووە بەهەرچـی لەئاسمانـەکان و بەهەرچـی لەزەویـدا هەیـە ، کەبـەردەوام لـەرام و موسەخخەرێتی دان بۆ خزمەتی ئێوە، ئەدی ئەوە بۆ ئێوە دەسەڵاتی بێ پایـانی خـودای باڵادەست نانوێنێ ، ئەدی ئەوە بۆ ئێوە رەحمـان و رەحیمێتـی خـوای گـەورە دەرناخـا ، ئەدی ئەوە بۆ ئێوە حافیزێتی و پارێزگارێتی خودای گەورە روون ناکاتەوە؟!

وەبۆ ئێوەی تەواو کردووە لەنیعمـەتانی دیـارو نادیـارو زاهـیری و بـاتینی گـەر ئادەمیزاد سەیرێکی ووردی بەدیقەت بکات و بڕوانێ بەلای لاشەو جەسـەدی خۆیـا لـەو هەموو ئەندامە سەیر سەیرە کەهەریەکەی لەچەندین کارگانی ئاڵۆز سـەیرترو ئـاڵۆزترە، هەر یەکەیان لەکارو پیشەی خۆیانا بـەردەوامـن، بێدەسـتی ئینـسان بێئـەوەی دەسـتی تیابێ بیەوێ یا نەیەوێ خۆ دیارە هەموو کارگەو کارخانـەیێ پارێزگـارو بەڕێوەبـەرێکی هەن ، ئاوەهاش ئەم هەموو ئەعزاو ئەندامە هـەر گـشتیان روانگـەو دیـاردەی دەسـتی حافیزێتی خودان، پارێزگارێتی خودای باڵادەست دەردەخەن باسی دەستی پاراستنی زاتی پاکمان بۆ روون دەکاتەوە نیعمەت و رەحمەتی پەروەردگارمان بۆ دیار دەکەن ..

هەر زەررەو، ئەتۆمێ لەهەر جۆرو بەدیهێنراوو مـەخلوقێ بێ ، هەموو خانەیەکی زیندوو لەهـەر جـۆرو زینـدەبوێیێ ، هـەر گـشتیان دیـاردەی چـاودێری و پاراسـتن و پارێزگارێتی خودای تاك و بێهاوتایان پێوەدیارە، هەر گـشتیان لەشـوێن خۆیـان ئـاڵای خواناسینیان هەڵگرتووە لەباسانی ناوە جوانانی خودا دەدوێن ، دەستی ئادەمیزاد دەگرن رووەو ناسینی زاتی پاك و بێوێنـە دەیبـەن.. یـا لایەنـە مەعنەویـەکانیش فـەرامۆش نەکەین کەخوای گەورە پارێزگاریانە و چاودێریانە وەکو عەقڵ و شعورو هەست و نست و ئەندێشەو بیروهۆش و زاکیرەو زەین و لەسەرووی هەمووشیانەوە روح و گیـان و نـەفس و عیلم و ئیمان و یاساو نیزام .. هتد ئەوانەش هەریەکەیان لەشـوێن خۆیانـا زاتـی پـاك دەیان پارێزێ و چاودێریان دەکات و بـەڕێوەیان دەبـات ، هیـچیان نـاتوانن بـۆ مـاوەی چرکەیێ بێ دەستی خودا لەبوون دابـن ، بێکۆمـەك و یارمـەتی خـودا تـەواو نـابن، ئەمانەش خۆیان هەر گشتیان لەباسی گەورەیی زاتـی پـاکن، دیـاردەو روانگـەو مانـای

تەواوێتی بەھرەو نیعمەتانی زاتی رەحمان و رەحیممان پێدەگەیەنن .. جار وایە زاتی خودای بەزەیی و پاك وەكو وانەو دەرس بەبەندەی سەر لێشێواو داماوی بدات ئاوا بۆ چەند چرکەیێ ھۆشی لێ دەسێنێتەوە جا ئەو کاتە ئەو ئادەمیزادە خۆشی لێ بزر وون دەبێ و بەجێ و رێگەی خۆی ناکەوێتەوەو دەوەستێ ، جا پاشان ھۆشەکەی پێدەبەخشێتەوە عەقڵ و ژیان و روحی بۆ میزان دەکاتەوە، ئاوا زاتی پەروەردگار تێی دەگەیەنێ، ئەی ئادەمیزاد ئەی بەندەی ھەژار تۆی روو لەمردن زاڵمی بێ عار پێداویستیانت زۆرن بەھەزار، رووکە دەروازەی زاتی کردگار، بیروھۆشەکەت تەواو بخەکار ھەندە گوێ مەدە بەنەفسی بەدکار، دڵ و دەروونت برازێنەوە بەنوری ئیمان پاکی کەرەوە ، ئەوسا تێدەگەی تۆ لەکوێ نوستوی بەداو تەڵەی شەیتان داکەوتوی، حافیزێتی خوا بۆت رەوشەن دەبێ نیعمەت و بەھرەت بۆ دەردەکەوێ ..

ئەی زاتی پاك شکۆمەندی ئازیز جوانی بێ وێنە نیعمەتدەری بێ شومار نوربەخشی بێمەکان ، پارێزەرو چاودێری گشت جیھان ئەی خاوەن ناوە جوانەکان، ئەی پەروەردگار ئەی کردگار، ئەی زانای دانا ئەی شافی ناصر ئەی ریسواکەری زاڵمان، پشت و پەنای پاك روان، کێ ھەیە بتوانێ ببێ، مەگەر تۆ خەلقی بکەی، کێ ھەیە بتوانێ بمێنێ مەگەر تۆ حیفزی بکەی، کێ بێ پاراستنی تۆ دەمێنێ کێ بێ چاودێری تۆ دەخوێنێ ، ئەی خۆشەویستی بێ وێنە ھەژاری بەردەرگای تۆینە چاومان لەرەحمی تۆیە بمانپارێزە چاودێریمان کە بەرەحمەت، تۆ باشترین چاودێری و پارێزەری

﴿ ..فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ یوسف :٦٤ .

## ٣٩ - المقيت

ناوێکە لەناوە دادپەروەرەکانی خوای چاودێر ، بنچینەی ئەم نـاوە - مقـت - ە واتە نارەزایی و رق و قین .

المقیت : واتە پەروەردگارێکە زۆر رق و قینی دەبێتەوە لەنادروستی و نابـەجێیی و ناشیرینی و تاوانباری ، وەلەئەنجامـدانی گونـاهی ئادەمیـیـەکان بەتایبـەتی گوناهـە گەورەکان ، وەکو هاوبەش دانان و بێباوەڕی دەربڕین وەك دەفەرموێ : ﴿ .. وَلاَ يَزِيـدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلاَّ مَقْتًا .. ﴾ ٣٩: فاطر .

واتـە بێبـاوەڕان چـیـیان بـۆ زیـاد ناکـات کـوفرو بێباوەڕیەکـەیان لـەلای پەروەردگاریانا تەنها نارەزایی و رق و قین نەبێ ، هەروەها خـوای گـەورە هەڕەشـە لـەو موسڵمانانە دەکا قسەو ووتار گەورەی بێکردەوەن وەك دەفـەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللهِ انْ تَقُولُوا مَالا تَفْعَلُون ﴾ الصف :٣ .

ئەگێڕنەوە کەکۆمەڵێك لەموسڵمانان پێش ئەوەی جەنگ پێویست بکرێ لـەرێی خوادا ، دەڵێن گەر بمانزانیایە چ کارو کردەوەیـەك لای خـوا خۆشەویـست و پەسـەندە ، ئەمان کرد تا ئەمردین ، خوا بەپێغەمبەر دەفەرموێ خۆشەویسترین کـردەوە دوای بـڕوا بەخوا ، جەنگ کردنە لەرێی خوادا، جاکاتێ جەنگ پێویست کرا ، ئـەو موسـڵمانانەی کەئەو قسەیان کردبوو ، زۆریـان پێگـران بـوو ، وە دەیـان ووت - وەك قورئـان بۆمـان دەگێڕێتەوە .. ﴿وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلاَ أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَـلٍ قَرِيـبٍ ﴾ النساء: ٧٧

واتە ئەی پـەروەردگارمان بۆچـی جـەنگت لەسـەر پێویـست کـردین؟ بـۆ دوات نەخستین تاماوەیەکی نزیك ، کەکاتی مردنی خۆمانە .. ئەنجا خوای گـەورە هەڕەشـەیان لێدەکاو دەفەرموێ : ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێنـاوە بۆچـی ئـەوەی دەیڵـێن بـەکردەوە نایکەن زۆرمایەی خەشمی خوایە ـ نارەزایی خوایە ـ کەقسەیەك بڵێن و بەکردەوە نایکەن .. هەروەها ئەوانەی کێـشەو جیـدال دەکـەن لـەبارەی ئایـەتی خـوا بـەبێ هـیچ جـۆرە

زانیاریی‌یه‌ك و ده‌لیلیٚ ئه‌مانه جیٚگه‌ی رق و قین و ناڕه‌زایی خوای گـه‌وره‌و ئیمانـدارانن ، وه‌خوای گه‌وره به‌توندی هه‌ڕه‌شه‌یان لیٚده‌كاو ده‌فه‌رمویٚ : ﴿الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَـاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ وَعِنْدَ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ غافر : ٣٥ .

موسلمان ده‌بـیٚ رق و قینـی لـه‌دوژمنانی خـوا بیٚـت له‌بـه‌ر خـودا بـۆ حـه‌ق و دادپه‌روه‌ری ، نه‌ك بۆ نه‌فسی خۆی یا بۆ نه‌فسی كه‌سیٚتر، وه‌موسلمان نابیٚ كاریٚ ئـه‌نجام دا كه‌بكه‌ویٚته به‌ر خه‌شم و قینی خوا ، وه‌نه‌گـه‌ر كـاریٚكی وای لیٚـڕوودا ـ نـه‌خوازه‌لاٚ ـ به‌زووترین كات و سات خیٚریٚكی پاكی چاكی به‌دوا ڕه‌وان بكات ، چـونكه خیٚـرو چـاكه توڕه‌یی‌و قینی خوای گه‌وره ده‌كوژیٚنیٚته‌وه‌و ئاده‌میزاد له‌مردنی به‌ڕه‌زاله‌ت ده‌پاریٚزیٚ وه‌ك له‌ئه‌نه‌سه‌وه ده‌گیٚڕنه‌وه كه‌پیٚغه‌مبـه‌ری مـه‌زن - ﷺ - فه‌رمویـه‌تی : ( الـصدقة تُطفـئ غضَـبُ رَبٌ وتدفعُ مَيتةَ السوءِ) . تاج - ج٢ - ص٤٢ .

خـودای بالاٚده‌سـت و شـكۆمه‌ندو ئـازیز له‌كیتابـه ئازیزه‌كـه‌ی خۆیـدا له‌سـه‌ر گوزشته‌ی پیٚغه‌مبه‌رانا به‌شیٚ له‌قارو غه‌زه‌به‌كه‌ی خـستۆته‌كار به‌سـه‌ر چـه‌ندین گـه‌لانیٚ كه‌شایه‌سته‌بوونه وه‌كو گه‌ل و قه‌ومی حه‌زره‌تی نووح كه‌چۆن بیٚبـاوه‌ڕان قڕانیـان هـاتو گشتیان به‌ر عه‌زاب و قاری خوا كه‌وتن له‌توفانا خنكان و تاكیان لیٚبڕا وه‌ك ده‌فه‌رمویٚ : ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلاَّ خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمْ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾ .

هه‌روه‌ها گه‌ل و قه‌ومی عاد كه‌خوای گـه‌وره حـه‌زره‌تی (هـود)ی بۆیـان ره‌وانـه كردبوو له‌ئه‌نجامی زولم و كوفرو بیٚباوه‌ڕیان به‌ر خه‌شم و قینی خوا كـه‌وتن، به‌ڕه‌شـه‌بای صه‌ر صه‌ر گشتیانی به‌ریاد كرد كه‌حه‌وت شه‌وو هه‌شت رۆژ به‌رده‌وام به‌سه‌ریانه‌وه داهات و به‌شیٚوه‌یه‌كی زۆر توندو به‌هیٚز تا سه‌ره‌نجام له‌ریـشه‌ی ده‌رهیٚنـان و وه‌كـو دارخورمـای له‌ریشه هه‌لكه‌ندراویان لیٚهات ، وه‌كو زاتی شكۆمه‌ند ده‌فه‌رمویٚ : ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ(٦)سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴾ الحاقه : ٦ـ٧ .

هەروەها گەل و قەومی ثمود کەخودای ئازیزو شکۆمەند حەزرەتی (صالح)ی بۆ رەوانە کردن کەپەیامی خودایان پێڕاگەیەنێ جا لەئەنجامی بێباوەڕی و زوڵم و توغیانیان بەر خەشم و قاری خوا کەوتن ، تەنها بەدەنگێکی بەرزو گەورە گشتیان تۆقیان داو لەترسانا بەچۆکا داکەوتن و مردن ، بەڵێ بێباوەڕی و زوڵم و ستەم ئادەمیزاد ترسنۆك و بێورەو بێ غیرەت دەکات .. وەك زاتی ئازیزو پەروەردگار لەبارەی قەومی ثمودەوە دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ(٦٦)وَأَخَذَ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴾ هود : ٦٦ ـ ٦٧ .

هەروەها خودای بالادەست فیرعەون و هامان و سەربازەکانیانی لەئاوا نوغرۆ کردووە، هەروەها ئەمردو خەڵکانی مەدیەن کەحەزرەتی شوعەیب پێغەمبەریان بوو، زۆرێك لەگەلان و قەومانی دێرین قارو غەزەبی خوایان چەشتووە، لەئەنجامی زوڵم و بێباوەڕی و توغیانیان، وەکو زاتی بالادەست دەفەرموێ لەسورەتی عنکبوت ئایەتی ٤٠ : ﴿فَكُلاً أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُمْ مَنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُمْ مَنْ خَسَفْنَا بِهِ الأَرْضَ وَمِنْهُمْ مَنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ .

واتە گشتیان بەر قارو غەزەبی ئێمەوە کەوتن لەبەر گوناه و زوڵم و تاوانیان جا لەوانەی بەردەبارانمان کردن بەهۆی بای بەهێزەوە وەلەوانەی دەنگێکی گەورە قۆزتنیەوەو تۆقاندیان و بەچۆکا دایخستن و ، لەوانەی لەزەویمان بردنە خوارەوە بەهۆی بومەلەرزەو بورکانەوە وەلەوانەی نوغرۆمان کردن بەهۆی تۆفان و ئاوەوە ، جا زاتی (الله) خودای بالادەست ستەمێ لێ نەکردوون بەڵکو ئەوان خۆیان ستەم و زوڵمیان لەخۆیان کرد بەوەی پشتیان کردە حەق و راستی رویان کردە زوڵم و بێباوەڕی .

ئەمڕۆکەی دونیا وەکو رابردووی خۆی واتاو مانای قاروقینی خودا لەئاسۆو مەیدانی واقیع دان بۆ کەسانێ چاوی بینینیان هەبێ، بۆ کەسانێ مانای قاروقینی خودا

بزانن، جا ئەوانەی پەیوەندی لەگەڵ ئاسمانا ناکەن و یاسای خودا پشت گوێ دەخەن دەبێ خۆیان بگرن لەبەرامبەر شەڕو دژایەتی ئەم کەون و بونەوەرەدا ، بۆ بومەلەرزەو تۆفـان و گەرماو سەرما، بۆ لەشکرانی کوللەو میکرۆب و بۆ نەخۆشیانی دەروونی و کۆمەلایەتی بۆ هەزارەها تەنگ و چەڵەمەو گیروگرفت ـ زاتی (مقیـت) دەفەرموێ : ﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴾ الانعام : ٦٧ .

واتە ئەی پێغەمبەری سالارو سەردار (ﷺ) پێیان بفەرموو زاتـی شـکۆمەندی بالادەست تواناداروو قادیرە ئەشکەنجەو عەزابتان بدات لەسەروتانەوە جا بەهەرهۆیێ بـێ یا لەژێر پێیەکانتانەوە، وەیانیش بتانکات بەچین چین و تاقم تاقم، عەزاب و ئەشکەنجەی دەستی یەکترتان پێ بچێژێ ، جابڕوانن چۆن ئایـات و نیـشانەکانی خۆمانتـان بـۆ روون دەکەینەوە بەڵکو رەجاو تکاتان وابێ بۆ خۆتان تێبگەن و بزانن ..

ئەی توانااداری بێ وینە ئەی خاوەن رەحمەت و نیعمەت، تواناما‌ـان دە کـەرێبازی شیرینی تۆ بگرینەبەر بمان پارێزە لەقاروقین و غـەزەبت تـۆ جێگـەی ئـاوات و نومێـدی ئێمەی، ئێمە بەرین لەکەسانێ زوڵم دەکەن و تۆیان ناوێ .

## ٤٠ ـ الحسيب

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای نارەزا بە بەدکاری، بنچینەی ئەم ناوه (حساب)ە واته ژمارەو راده ..

الحسيب : واتـه ئـەم خوایـه پەروەردگارێکـه لـەکارو کـردارو گوفتـارو نیـەتی بەندەکانی دەپرسێتەوه ، وەسەرانـسەری لێپرسـینەوەو موحاسـەبەی رۆژی دوایـی هـەر بەدەستی خۆیەتیو هەر خۆی ئەنجامی دەدا ، وەهەموو کەس واچـاوی لەبـەزەیی ئـەوەو هیچ شتێ بەدەست کەس نیيه ،نەبۆ خۆی نەبۆ کەس و کـاری خزمـانی، مەگـەر شـتێ خوای گەوره خۆی خواستی لەسـەربێ وەك دەفـەرموێ : ﴿لاَ ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَـرِيعُ الْحِسَابِ ﴾ غافر: ١٧ .

واته : ستەمکاری و زوڵم نیيه ئەمرۆ بێگومان خوا حیساب کارێکی ووردەکارو دەقیقه، وەنادەمیزاد بۆی نیه خەڵك موحاسـەبه بکـات تـەنها بەیاسـای خـوای گـەوره نەبێت ، وەکەسێ ناتوانێ خۆی لەژێر حیسابی خوای گەوره بشارێتەوه یا تـاڵوگۆڕی تیـا بکا ..

وەخودای دادپەروەر هیچ شتێ لەحیسابا فەرامۆش ناکاو لەیادی ناچێت تەنانەت ئەگەر بەقەد خەرتەلەیەکیش بچووك بێت ، وەك دەفەرموێ : ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَـا حَاسِبِينَ ﴾ الانبيـاء: ٤٧ . واته میزانی دادپەروەری دەخەینه تـاڵاوه لـەرۆژی قیامەتـدا وەهیچ نەفس و گیانێ زوڵـم و سـتەمی لێ نـاکرێ لەشـتێ ، ئەگـەر هەنـدی میـسقاڵه خەرتەلەێ بێ دەیهێنینـەوه، کافیەو بەسه کەخۆمان ژمێرکاری بین هەروەها دەفەرموێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴾ النساء: ٨٦ .

بەراستی و بێگومان خـودای باڵادەسـت و شـکۆمەند هـەموو شـتێ ئەنـدازەو پێوانەی کردووەو بەحیساب ژماره دای ڕشتووه ، خوای گەوره ئیمانداران هان دەدات بـۆ ئەوەی بانگەوازی خوا بەخەڵك رابگەیـەنن و لەکـەس نەترسـن و وەخودایـان بەسـه بـۆ

لێترسان و هەموو تەنگەتاو ناخۆشیەك و حیسابێك وەك دەفەرموێ : ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴾ الاحزاب : ٣٩ .

واتە ئەوانەی نامەی خودای گەورە رادەگەیەنن وەلێی دەترسن و لەکەسی‌تر ناترسن پشتیان بەخودا بەستووەو خوای شکۆمەند کافی‌یەو بەسە بۆ حیساب و ژمارەو ئەنجام ، هەروەها دەفەرموێ : ﴿إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ(٢٥)ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ ﴾ الغاشیة : ٢٥ـ٢٦ .

واتە : نادەمیزاد گشتیان گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیەو پاشان لەسەر ئێمەیە حیساب لەگەڵ کردنیان ..

خودای باڵادەست و شکۆمەند لەسورەتی (الطلاق)دا لەئایەتی (٨) و (٩) دەفەرموی : ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِ فَحَاسَبْنَاهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَاهَا عَذَابًا نُكْرًا(٨)فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴾ واتە زۆرێك لەگوندو دێ و ئاوەدانیەکان پشتیان کرد لەئەمرو فەرمانی پەروەردگاریان و پێغەمبەرانیان خودای شکۆمەند فەرامۆشی نەکردن، بەڵکو کارو کردەوەو بێ باوەڕیەکانیانی بۆ حیساب کردن بووە ئەنجامی بەهیلاك بردنیان و عەزابدانیان بەشێوەیەکی زۆر بەهێزو ناخۆش ، سەرەنجام چەشتیان ئەنجامی ئەمرو هەڵوێستی نالەباریان کەعاقیبەت و چارەنووسیان خەسارەتمەندی و زیانبازی بوو ..

خودای حەسیب و بێهاوتا ئەکارو کردەوەی ناهەمواری زاڵمان و بێباوەڕان فەرامۆش دەکات نەکارو کردەوەی خواپەرستان و چاکەخوازان پشت گوێ دەخات ، بەڵکو هەموو کارو کردەوەیێ و هەموو گوفتارو رەفتارێ دەژمێرێو هەڵدەسەنگێنێ بەپێی سونئەتی خۆی مامەڵەیان لەگەڵا دەکاو لەدونیاو قیامەتدا ، وەکو لەم ئایەتانەدا هەڵوێستی نالەباری بێباوەڕان و زاڵمان بۆ باس دەکاو ، وەسونەن و جۆریەتی مامەڵەی خۆی لەگەڵیانا بۆمان رون دەکاتەوە وەك دەفەرموێ : ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ

﴿ كَفَرُوا أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لأَنْفُسِهِمْ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ ﴾ ال عمران: ١٧٨ .

كافرو بێباوەڕو زاڵمان واحيساب نەكەن كەدونياو ژيان و ژيوارمان پێداون و لەسەريا مۆڵەتمان داون ، مايەی خێرو چاكەبێ بۆ نەفس و گيانيان نەخێر بەڵكو بۆيە درێژەمان پێداون تاكو تاوان و گوناه بۆ خۆيان زۆر بكەن لەئەنجاما شايەستەی ئەو عەزاب و ئەشكەنجەيەبن كەمايەی سوك و ريسوايی و زەليليیە بۆيان ، هەروەها خودای ئازيزو حەسيب لەسورەتی (الانفال) دا لەئايەتی (٥٩) دا دەفەرموێ : ﴿ وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ ﴾ واتە با كافرو بێباوەڕان واحيساب نەكەن كەخودای حەسيب لێيانەوە بێئاگايە، وەهەرچی دەيكەن لەسەريان دەچێ و پێش دەكەون نەخێر ئەوان لەدەستی خودای بالآدەست دەرناچن و كەسێ نيە پەنايان بداو لايان بۆ بكاتەوە ، هەروەها لەسورەتی (ال عمران) دا لەئايەتی (١٨٠) لەبارەی رەزيلانەوە خودای حەسيب دەفەرموێ : ﴿ وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ .

واتە ئەوانەی رەزيلی و قرچۆكی دەكەن لەو بەش و بارەی خوای گەورە بەفەضلی خۆی پێيداون، وا حيساب نەكەن ئەوە مايەی خێرو بەهرەيە بۆيان ، بەڵكو مايەی شەڕو بەدبەختيە بۆيان لەئەنجاما كۆت و زنجير و تۆق دەخرێتە گەردنيان لەرۆژی قيامەت و حيسابا بەو ماڵەی كەرەزيل و قرچۆكيان پێوە كردووە .

باوەڕبوون بەزاتی (الله) كە(حسيب)ە بەماددیات و بەمەعنەوياتەوە راستيەكی داخوازی ئيمانیيە حەقيقەتێكی پاك و بێگەردە، بەم ئيمان و باوەڕە ژيان ميزان دەبێ و فيطرە ئاسوودە دەبێ ژيری دەكەوێتەوە سەر سككەو رێڕەوی خۆی، سەعادەت و بەختياری باڵی خۆی دەكێشێ بەناو گەرەك و شارو ئەو شوێنانەدا كەئيمان تيايدا بالآيەو بلآوبۆتەوە..

ئەوانەی تووشی توغیان بووینە یا تووشی دەبن جەهەنەدەم بۆیـان لەسـەنگەرایە کەهەتا هەتایی تیایدا دەمێنیتەوە، ئـاوی گـەرم و خوێنـاو کێمـاوی جەهەنـدەمیان دەخۆنەوە، ئەوانەن بێ ئاگان لەحیسابی خودایی‌و لەبیریان چۆتەوە کـەخودای بالآدەسـت (حەسـیبە)و حیـسابیان لەگـەلا دەکـات، وەبێئاگـا بـوون لـەوەی کـەزاتی (حەسـیب) هەمووشتێکی (احصاء) کردووەو ژماردووەو نوسیوەتەوە، دەی بچێژن ئازارو ئەشکەنجەو عـەزابی جەهەنەدەم بەڕاستی هەرگیز لێـی رزگـار نـابن و جـار لـەدوای جـار عـەزاب و ئەشکەنجەتان بۆ زیاد دەبێ و لەزیاد بووندایە ئەم راستیەش وەکو خودای بالآدەسـت لـەم ئایەتانەدا روونی کردۆتـەوە : ﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا(٢١)لِلطَّاغِينَ مَآبًا(٢٢)لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا(٢٣)لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا(٢٤)إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا(٢٥)جَـزَاءً وِفَاقًا(٢٦)إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَابًا(٢٧) وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا(٢٨)وَكُلَّ شَـيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًا(٢٩)فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾ النبأ : ٢١ ـ ٣٠ .

لەفەرمودەیەکی قودسی هاتووە کەئیمامی موسـلم ریوایـەتی کـردووەو خـودای بالآدەست و حەسیب تێیدا دەفەرموێ ( یاعبادي إنّـما هـي أعمـالكم احصيها لكم ثـمَّ اوفيّكم إيّاها فمن وجد خيراً فليحمد الله ومن وجد غير ذلك فلا يلـومن إلا نفسه ) رواه مسلم .

واتە ئەی بەندەکانم بەڕاستی ئەوە پوختەی کارو کردەوەی ئێوەیە بۆتان دەژمێـرم و حیسابی دەکەم ، پاشان بەپێی کردارتان مامەڵەتان لەگەڵا دەکەم بێ زیادو کـەم جـا ئەوەی بەپیر خێرو چاکەیێ بچێ و بەدەستی بێنێ با سوپاس و شوکرانەی خـوای لەسـەر بکات وەئەوەی بەپیر خەراپەو زوڵم و تاوانێ بچێ و ئەنجامی بدات بالۆمەو سەرزەنـشتی کەسێ نەکا تەنها گیان و نەفسی خۆی نەبێ .

## ٤٧ـ الجليل

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خودای ژمێرەر ، بنچینەی ئـەم نـاوه (جـلال)ه، واتـه گەورەو بەشکۆو بەقەدەر بێ ئەوەی کەم و کورپەکی تیابێ - یا بەسەریا بێ .

الجليل : واتـه ئـەو خوایـه پـەروەردگارێکی زۆر گـەورەو بەقـەدرو رێـزه ، ئـەم سیفەتەش هەر شایانی خۆیەتی ، نادەمیزاد سنوری ژیـرو زانیـاری ناگاتـه ئـەم سـنوره فراوانه بێ پایانەی ئەم زاته، وه بـەدیهێنراوان خۆیـان نـاگرن لەبـەر هەیبـەت و شـکۆو گەورەیی‌و قەدری ئەم خوایه بێهاوتایەو مەزنه ، چونکه ووردو خاش دەبن و دەسـتوتێن و نامێنن ، وەتوانای هەلگرتنی قەدرو رێزی خـوای گـەورەیان نیـەو لەشـەرماو لـەداخا نەتورێنەوەو نەتوێنەوەو شەق دەبمن ، چونکه گەورەیی و رێزی ئـەم میهرەبانـه یـەکجار زۆر بەدەرتره لەوەی هۆش و بیر بۆی بچێت ، وەکو خوای گەوره بۆمان دەگێرێتـەوه کـه موسا پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) داوای لەخوا کـرد کـەبیبینێ، خـوای گـەورەش پێی فەرموو تۆ لەو توانایەنیت کەمن ببینیت ، بۆ ئەمه سەیری ئـەم کێـوه بکـه گـەر خۆی گرت لەبەر بینینم ئەوه پاشان تۆش ئەمبینی ، وەك دەفەرموێ : ﴿..فَلَمَّا تَجَلَّـى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا..﴾ الاعراف : ١٤٣.

جا پاش ئەوه خوای گەوره ، رێزو قەدرو عەزەمەتی خۆی پیـشانی کێوەکـەدا ، یەکسەر کێوەکە کەوت بەسەر یەکاو ووردو خاش بوو نەیتوانی خۆی بگرێ ، جـا موسـا پێغەمبەر لەترسانا لەهۆش چوو ، دوایی بەهۆش هاتەوەو فەرمووی مـن یەکـەم کەسـم کەشاهێدی دەدەم ئەی خوایه کەکەس تۆ لەدونیا ناتوانێت ببینێت .

هەروەها خوای گەوره لەباسی زانیاری قیامەت (واته رۆژی هاتنی) هەر گەورەو عەزەمەتی خوای زانا دەیزانێ و کەسێکی تر دەرکی ناکـاو پێـی ناگـاو نـایزانێ ، وەك دەفـەرموێ : ﴿ .. يَسْأَلُونَكَ عَنْ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِنْـدَ رَبِّـي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ..﴾ الاعراف :١٨٧

واته پرسیارت لێدەکەن لەرۆژی دوایی کەی ئەگاتە جێ؟ پێیان بڵێ زانیاریەکەی وا لەلای پەروەردگارا ، زانستی کەس نایزانێ و پێی ناگا ، تەنها خۆی نەبێ ، بەڵێ هەر گەورەیی ئەم زاتەیە رۆژی قیامەت بەرپا دەکاو ستەمکاران ریسوا دەکاو دەیانخاتە دۆزەخەوە ، هەڵگرانی ئاڵای خوایی‌و ستەم لێکراوان سەردەخا، بەنازو نیعمەتی بەهەشت دەیانبەخشێ و شادیان دەکا ..

شکۆمەندێتی و جەلیلێتی خودای بێ هاوتاو ئازیز شایەستەیە بۆ ئەوەی رێزی تەواوی لێبگیرێ و نافەرمانی نەکرێ و ملکەچی تەواوی بۆ بکرێ و سەرپێچی بەهیچ شێوەیێ لێنەکرێ و قەدری بەچاکی بزانرێ و، وەشوکرانەژمێری و سوپاس گوزاری بکرێ .. وەدەبێ لەگەڵ یادکردنیا بژین و لەیاد نەکرێ .. ئا بەمەوە ئادەمیزاد لەپیرۆزی و بەرەکەت و رەحمەت نزیك دەبێتەوە .. لەپلەو پایەی سەردەکەوێ و دونیای سەعادەت و بەختیاری دەیگرێتە ئەستۆی خۆی و سەرەنجام چارەنووسێکی زۆر چاك و باش مایەسەر دەکا ..

موسلیم و ئیبن ماجە ریوایەتیان کردوەو لەکیتابی ئیمانا لەئەبو موسای ئەشعەریەوە کەدەفەرموێ :

(قام فینا رسول الله - ﷺ - بخمس کلمات ، فقال ﷺ : إنّ اللهَ عزَّ وجلَّ لایَنامُ ولایَنبغي له أنْ یَنام یخفض القسط ویرفعه، یرفع الیه عملُ اللّیل قَبلَ عَمَلِ النهار ، وعملُ النهار قبل عَمَلِ اللیل ، حجابه النور ، لو کشفه لأحرقت سَبَحاتُ وجهه ماانتهی الیه بصرهُ من خلقه ) .

لەو فەرمودەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ خوای گەورە (عزوجل) ئانوێ و شایان و شایەستەی ئەو نیە بنوێ ، تەرازووی بەرز دەکاتەوەو دای دەنوێنێ ، یا بەمانایێتر بۆ هەر کەسێ ویست و خواستی بخوازێ رزق و رۆزی بۆ زۆر دەکا وەیالێی کەم دەکاتەوە .

وەکردەوەی ئادەمیزاد لەرۆژا بەرز دەکاتەوە بۆلای خۆی بەر لەکردەوەی شەو ،

وەکردەوەی شەویٚ بەرز دەکاتەوە بەرلـە کـردەوەی رۆژیٚ ، وە ئـەو پەردەیـە وا لەبـەینی خوداو عیبادایە نورە ، جا ئەگەر ئەو نورە ئاشکرا بکاو دەربخا ، ئەوە نورەکانی جەلال و جەمال و عەزەمەت و هەیبەت و سامی ئەو زاتە شکۆمەندو بەرزە هەرچـی مـەخلوق و بەدیهێنراوەکان هەن لەپێش هەموانیش ئادەمیزاد هەرگشتیان دەسوتێنیٚ .. مـەخلوق و بەدیهێنراوەکان بەرگە ناگرن ورەو توانایان نیيە لەبەرامبەر نوری جەلال و جەمالی زاتی شکۆمەندو ئازیز بوەستن .

ئەم سیفەتەی خودای بێهاوتا کەشکۆمەندێتی بیٚ لەکەیە کەجەلیلێتی بێوێنەیە وەکو شکستی بەسەر نەهاتووەو بەسەر نایێ و وەشایەستە نيیە .. هاوشانە لەگەڵ باقی سیفەتە بەرزەکانی تری وەکـو دادپـەروەرێتی و دانـایی و زانـایی و بـەرزی و پـیرۆزی و نەرمو نیانیو رەحم و بەزەیيو بەخـشندەیيو لێبـوردەیی .. هـەتادوایی .. جـا یـەکیٚ پرشنگی هیدایـەتی قۆزتبێتـەوە بـەش و بـاریٚ لەشـیرینی ئیمـانی نۆشـیبیٚ و بـەرگی غەفلەتی لەخۆی داکەنیبیٚ و ، دونیای کۆڵـەوارێتی جێهێـشتبیٚ ئـەو کەسـە دەتـوانیٚ بەشێکی کەم لەشکۆمەندی و جەلیلێتی خودای بێهاوتا حاڵیبیٚ .

جا روو لەخودای شکۆمەندو ئازیزو باڵادەست دەکەین دەڵێین ئـەی شـکۆمەندی ئازیز ئەی توانادارى بێوێنە ئەی زانای دانا ئیش و کارت دڵ رفێنە ئەی نوری دادپەروەر ئەی باڵادەستی سەروەر ئەی بیٚ احتیاجی زەمان و شوێن ئەی ئاگـادار بەگـشت هـێن و منهێنا کیٚ شکۆمەندێتیو جەلیلێتی تـۆ دەزانـیٚ، عـەقڵی کـەم و بـیری تەسـك کـەی دەتوانیٚ، کام زانیاری باسی دەکا کام زانیاری باسی ناکا ، چی هەیە لەتۆوە سەرچـاوەی نەگرتبیٚ، چی هەبووە پێش ئەوەی دەسـتت پێکردبـیٚ، ئـەی باڵادەسـتی بێنیـاز ئـەی ژمێرەری بەئەنداز تاکە ئومێدو ئاواتمان تۆی، تاکە دۆست و پـەنامان تـۆی، تاکـە رازو نیازمان تۆی، لەخەزێنە نەبڕاوەکـەت لەگەنجینـە بەخـشینەکەت لـەلێبوردەی فراوانـت لەبەزەیی رەحمی جوانت بەهرەمەندو پیرۆزمان کە، بەرزی و رەحمان پیٚ عطا کە .

## ٤٢ ـ الكـريـم

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە بنچینەکەی (کرم)ە واتە بەخشش ..

الکریم : واتە خوای گەورە پەروەردگارێکە زۆر بەخشش دەدات بەبـەدیهێنراوانی بەتایبـەتی ئـادەمیزاد جـا بەخـشندەی رزق و رۆزی و مـادیو مەعنـەوی بەخـشندەی نیعمەتانی نهێنی و ئاشکرایە ، هەروەها خوای میهرەبـان بەخـشندەیە هـەتا بەرامبـەر بەدوژمنەکانیا لەدونیادا ، وەبەخشندەیی ئازو نیعمەتی بێسنوورو بێحیساب و نەبڕاوەیە لەقیامەتدا بەئیماندارانی پاك و چاکەکار لەبەهەشتی بەریندا ..

هەموو گیانلەبەران بەگەورەو بچووکەوە، لەولاشەی کەهەیتیان و لـەو تەمەنـەی کەپێیان دراوە لەو هەزارەها پێداویستی ژیانیان بەگشتی بەخشندەیی خوای گەورەیـە .. بەخشندەیی ئەم خوایەش بەرامبەری هیچ شتێ نیە کەبۆی قەرەبوو بکرێتـەوە لەتۆیـە ، بەڵکو بەخواست و ویستی خۆی بەخشش دەدا بەهەرکەسێ کەبیەوێ ، کەسێ توانای کەم کردن و زیاد کردنی بەخششی خوایی نیەیە مەگەر بەویستی خۆی نەبێ، بەخـشـشی خـوا کەهات بۆ کەسێ بەکەس ناگەرێتەوە ، وەئەگەر لێی براو کەم بوو بەکەس بۆی نایێتەوەو زیاد ناکات ، وەهەموو لایەنە بەخششێك هەر لەلای خوا بەخشراوە جا زانیاری و زانست بێ یا پلەو پایە بێ یا ماڵ و سامان بێ ، لەمانە خوای گەورە بەخششی پلەو پایەی داوە بەئادەمیزاد بەسەر هەموو بەدیهێنراوانی وەك دەفـەرموێ : ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَـا بَنِـي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ..﴾ الاسراء : ٧٠ .

واتە : رێزمان لەنەوەی ئـادەمی نـاوەو بەخـشـشی پلـەو پایـەمان پێـداوە ، وە ووشکاییو دەریاییم بۆ مایەسەر (مسخر) کـردوون ، کەبـەئارەزووی خۆیـان هاتووچـوو فەرمان رەوایی تیا بکەن .

خوای گەورە ناوی سیفەتی خۆی بردووە بەکەریم ، وەکو دەفـەرموێ : ﴿يَاأَيُّهَـا الإِنسَـانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴾ الانفطار : ٦ .

واتـە ئـەی ئـادەمیزاد چـی تـۆی سەرلێـشێواندووە بەپـەروەردگاری سـەخی و بەخشندەت، وەخوای گەورە مەدحی موسا پێغەمبەر دەکات وەك دەفەرموێ : ﴿وَلَقَـدْ

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴾ الدخان :١٧ .

واته : بەڕاستی قەومی فیرعەونمان تاقیکردەوەو، بەلامان نارد فرستادە یەکی بەخشندەو سەخی ــ کەحەزرەتی موسا بوو (علیە الصلاة والسلام) ــــ وەخوای گەورە ئەم سیفەتەی داوەتە پاڵ فریشتە وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴾ التكوير: ١٩ .

واتە: ئەم قورئانە ووتارانێکی جوبرائیلی خاوەن ڕێزە.

هەروەها خوای گەورە ئەم سیفەتەی داوەتە پاڵ قورئانی پیرۆز ، وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ(٧٧)فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ ﴾ الواقعه :٧٧ ، ٧٨ .

واتە : ئەوەی فرستادەی خوا دەیخوێنێتەوە قورئانی کەریمە لەکیتابی پارێزراوا ، ئیمانداریش پێویستە خۆیان بەم سیفەتە برازێننەوەو سەخی و بەخشندەربن بەگوێرەی توانایان لەبەینی خۆیانا .

خوادای شکۆمەندو بالادەست و کەریم لەبارەی بەخششەکانیدا لەسورەتی ئیبراهیم دا لەئایەتانی ٣٢ و ٣٣ و ٣٤ دا دەفەرموێ : ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنْ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمْ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمْ الأَنْهَارَ(٣٢)وَسَخَّرَ لَكُمْ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ(٣٣)وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴾ .

واتە : زاتی (الله) کەخودای گەورەو میهرەبانە لەسەرەتادا ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، وەلەئاسمانا ئاوی بارانــدووەو دەبارێنێ ، جۆرەها میوەجات و بەروبومی پێدەردەکات، کەببێ بەمایەی رزق و رۆزی بۆتان ، وەکەشتی رام و موسەخخەر کردووە بۆ ئەوەی لەدەریاو بەحرەکاندا بگەرێن سودو بەهرەی لێوەربگرن گشتی بەئەمرو فەرمانی ئەوە ، وەروبارەکانی بۆ ئێوە رام و موسەخخەر کردووە، هەروەها رۆژ (خۆر)و مانگی بۆ رام و موسەخخەر کردوون بەو یاسایە جوان و قەشەنگە، کەملکەچن بەبەردەوامی لەخزمەتی ئێوەدا، هەروەها لەگەڵیا شەو رۆژی بۆ مایەسەرو موسەخخەر

کردوون جا هەرچی پێداویستی ژیانتانایە گشتی پێبەخشیون ، وەئەگەر بێت و نیعمەتان و بەهرانی خودای بژمێری کەوەکو بەخشش بۆتە کالاّو بالاّی هەموو شتێ ئەوە ناژمێردرێن، بەڕاستی ئادەمیزاد زۆر ستەمکاری زۆر سپڵەی نیعمەت پۆش و بێچاوو ڕووە ، ئەو هەموو چاکەو بەخششەکانی خودای بەرچاو ناگرێ و رو لەخوداو بەرنامەکەی ناکات .. کەرەمایەتی و بەخششایەتی خودای بێهاوتا کارو سیفەتیەتی ، هەرچەندە بەندەکانی ڕوو لەبێباوەڕی بکەن و سفلەو بەدنەمەك بن ئەوە خوای گەورە مۆڵەتیان دەدا بەڵکو هۆش و بیریان بێتەوە شوێن خۆیان و ڕوو لەخودا بکەن ، خۆی لەخۆیدا ئەم جۆرە مۆڵەتدانە جۆرە بەخشش ڕەحمەتێکی خودایییە، ئەوە هەرکاتێ ڕووی لەخودا کردەوە ئەوە خودای گەرە تەوبەو پەشیمانی لێوەردەگرێ و دوا ڕۆژو ئاخیرەتی بۆ مسۆگەر دەکاو لێی دەبورێ .

هەرچەندە خودای کەریم بەگەڕانەوەو شوکرانەی بەندەکانی چی لەپلەو پایەی ئەوا زیاد ناکاو ، وەیا کەم ناکات بەبێ باوەڕی بەندەکانی سفلەبونیان وەك لەسورەتی (النمل)دا لەئایەتی (٤٠)دا دەفەرموێ : ﴿..وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾ .

واتە : زاتی باری لەسەر زوبانی حەزرەتی سولەیمان (علی نبینا علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ ئەوەی شوکرانەی خوای گەورە بکات ئەوە بۆ کەسێکی تر نیەو رەنجی بەفیڕۆ ناچێ بەڵکو بۆ گیان و نەفسی خۆی دەگەڕێتەوە، نیدی منەت لەسەر کەسێ نەکاو وەخوای بالاّدەست شتێ زاد ناکات یا کەم ناکات لەپلەو پایەی خوایەتیدا ئەگەر شوکرانەی بکرێ وەیانەکرێ و ، وەئەوەی بێباوەڕبێ بەهەمان شێوە بێباوەڕی و کوفرەکەی بەسەرو گێلاکی خۆیا دادەکەوێتەوە بەڕاستی پەروەردگارم بێنیازو کەریمە دەوڵەمەندو خاوەن بەخششە .. پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەفەرمودەیەکدا لەباسی ئەم سیفەتەی پەروەردگار دەکاو دەفەرموێ : ( إن الله حيّ كريم يستحي إذا رفع الرّجل اليه يَديهِ أنْ يردَّهُما صفراً خائبتين).

بەڕاستی خودای شکۆمەندو ئازیز زیندووی خاوەن کەرەم و بەخششە (واتە

کەریمە) شەرم دەکات لەپیاوێ کاتێ کەدەستەکانی بەرز دەکاتـەوەو لەبـەریا دەپاڕێتـەوە ئەویش بەدەست بەتاڵی و بەهیـچی بـەڕێی کاتـەوە ، خۆزیـا نەکـە ئێمـەش گـشتمان خۆمانمان بەو سیفەتە ئارایـشت دابایـە ، کـاتێ کەهـەژارێ شـتێکمان لێـداوا دەکـات شەرمی خـودای بیگرتباینـایـەو بەبـەتاڵی و بـەهیچ و خـۆڕایی بـەڕێمان نەکردبایـە .. جارووەو خودای کەریم دەپاڕێینەوەو دەڵێین :

ئەی کەریمی خـاوەن کـەرەم ، ئـەی مـونعیمی خـاوەن نیعـەم ، چ شـتێ هەیـە سەرچاوەی بەخشینی تۆ نەبێ ، وادیارە لەبەرچاوێ غشاوەی لەسەر نەبێ ، ئەوا ئێمـەی هەژارو بێچارە ، رومان کردوەە قاپی تۆ نەجارە ، ئاسـۆیی بەخـشینت بێـسنورە ، بـۆ ئەوەی لەسەر رێگەت سورە ، ببەخشە پێمان ئەی ئازیزمان ، بەخشش و رەحمـەت و بەهرەو نیمان ، هەر دەرگای تۆیە ئاوەڵایە ، کوا دەرگایانی تر لەکوێ هەیە .

## ٤٢ـ الرقيب

ناوێكه لەناوە بەسامەكانی خوای بەخشندە ، ئەم ناوە (٥) جار لەقورئانا هاتووە ، تەنها (٣) جار مەبەست تیایدا خوایە ، بنـچینەكەی (رقـاب)ە واتـە چـاودێری و ئاگاداربوون.

الرقيب : واته ئەو خوایە پەروەردگارێكە چاودێری و ئاگاداری هـەموو ئاشـكراو نهێنییەكه لەهەموو كارو كردارێكا جا چی ئی ئادەمیزاد بێ یا هەر جۆرە مەخلوقێكی تربێ لەئاسمانـەكانا بـێ یالەسـەر زەوی بـێ ، یـا لـەدەریاو وشـكایی بـێ ، لەهەرچـی پێداویستی بونەوەرەكانە ئەم راستیە روون دەكاتەوە بۆ چاوی ژیرو بیرمان .. بـەڵێ ئـەم خوایەیە سوری ژیـانی هەریـەكێ لەزینـدەبووەكان چـاودێری دەكـاو رەگـەزو رەسـەنیان دەپارێزێ .. هەرشتێ چاودێری لێبكرێ ئەوە تەنها لـەلای خواوەیـە ، هـیچ شـتێ بـێ چاودێری خوای گەورە ناتوانێ خۆی لەبازاڕی بوون و وجوددا بهێڵێتەوە هەرچەندە بـچوك بێ یاگەورە، وەهیچ شتێ ناتوانێ دەستكاری چاودێرێتی خوا بكا لەهیچ روو لایەنێكەوە

خوای گەورە لەچـاودێریو ئاگـادارێتی بوونـەوەرەكانی پێویـستی بەیارمـەتیو كۆمەك نیە ، وەهەر هەموو شتێ لەژێر چاودێری ئەوایە وەك دەفـەرموێ : ﴿..وَكَـانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَقِيبًا ﴾ الاحزاب : ٥٢ .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ .. وَاتَّقُوا اللَّـهَ الَّـذِي تَـسَاءَلُونَ بِـهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ النساء:١ .

واتە : لەو خوایە بترسێن كەلەكاتی تەنگانە هانای بۆ دەبەن و یـا یـەكتر دڵنیـا دەكەن بەقەسـەم پـێ خـواردنی وەچـاودێری خزمایـەتی بكـەن بـەپێی دوورو نزیكیـان وەسیلەی رەحم بەجێ بگەیـەنن ، بێگومـان خـوا وابەسـەرتانەوە چـاودێرو موراقیبـە ، ئادەمیزادی ئیماندار دەبێ ئەم سیفەتە لەخۆی بهێنێتە جێ لەو مەیدانەی كەدەستی تیا دەڕوات تاكو بتوانێت خوای گەورە لەخۆی رازی بكـات ، هـەروەها خـوای گـەورە ئـەم

سیفەتەی داوەتە پاڵ فریشتەکانی سەرشانی هەریەکێ لەئادەمیزادەکان وەك دەفەرموێ :
﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاَّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق:١٨ .

واتە : هەر یەکێ لەئادەمیزادەکان دەم ناکاتەوە بـۆ قـسەکردن و هـیچ ووتـەیێ نیللا وا فریشتانی چاودێری بەسەریەوەن و بۆی تۆمار دەکەن ..

ئەگـەر ئـادەمیزاد بەچـاوێکی ژیرانـەو هۆشـیارانە وورد بڕوانـێ بـەم کـەون و بونەوەرەدا دیاردەی چاودێرێتی خوای بێهاوتا زۆر بەئاشکرایی دیارەو ڕەونەق دەداتـەوە لەهەمور مەخلوق و بەدیهێنراوێکا ، جا بچوك یا گەورە ڕەش یا سپی بڵنـد و بـەرز یـا نەوی ماددی یا مەعنەوی ، بۆ نمونە ئەگەر سەیری کەشکەشانەکان و مەجەرەکان بکەین لەگەڵیا سەیری ئەستێرەکان کەین بۆ لای یاساکەو نیزام بڕوانین دیارە بێـچاودێر ئـەوها ئەوهانین ، بەردەوامی وان بەم شێوە جوانە، لـەو بەرزاییانـەو لـەو ئاسمانانـە، دیـاردەی موراقەبەی دەستی زاتێکن بۆیە ئەوهانـە زۆر ڕێـك و پـێکن ، خۆشمـان و زەویـت هـیچ لەبیرنەچێ هەرچی ڕۆیشتووەو هەرچی دێتە جێ ، بون و پەروەردەی جێگەی چـاودێرین ، ئەگەر ئێستایەو ئەگەر لەدێرین، ئەگەر سەیری ئاوو دەریا کەین یا سـەیری بـاو هـەورو باران کەین یاخود بڕوانین بۆ چیاو شاخان هەم شیوو دۆڵ و بێستان و باغان یاخود بۆ چەم و کانیاوی شیرین یاخود بۆ سەحراو دەشتانی بەرین جۆراو جۆر ڕووەك فەرامۆش نەکەین قەشەنگی و ڕەنگیان بەرچاوا بخەین ، هەروا باڵندە جوان و سەیرەکان ئـەوەی لەزەوییـە ئەوەی لەئاسمان، ئاوازی دەنگ و نەغمەی دڵخۆشیان شێو شێوازو جوانی و قەشەنگیان، ئاورێ دەینەوە بەلای گیانداران لەبۆ ماڵات و وێنەی بەهاران، جا چـی هەیـە کەشـاهێد نەبێ زاتی باری حەق چاودێری نەبێ ..

خوای گەورە وەکـو بەڕێوەبـەرو پـارێزەری گـشت کـەون و بونـەوەرە ئاوەهـاش چـاودێرو موراقیبیانـە ، دیـارە بەڕێوەبەرایـەتی و پـەروەردگارێتی لەهـەمان کاتـدا پارێزگارێتی گشتیان دیاردەی چاودێرێتیو موراقیبێتیە ، سیفەتانێکن بێی یەکتر نابن ، خودای ئازیزو شکۆمەند کەخاوەن سونەن و و یاسای نەگۆڕە هەروەها لەگەڵیا دادپەروەرو

حەق پەروەرە، چونکە خۆی عادیل و حەققە ، دیارە ئەم سیفەتانەش بەبێ چاودێریتی نابێ و نابن ، بەڵێ خوای گەورە چاودێری کارو کردەوەی ئادەمیزادەکانەو بۆیان تۆمار دەکاو سیفەتانی دادپەروەری و حەق ویستی بەسەریانەوە ئەنجام دەدات .. هەروەها زاتی چاودێرو موراقیب لەسورەتی فصلت لەئایەتی (٤٠)دا دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لاَ يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا أَفَمَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ .

بەڕاستی ئەوانەی بێباوەڕن بەئایات و نیشانانی ئێمە لێمان شاراوە نابن و لەژێر چاودێری ئێمە وون نابن و بەئەنجامی کارو هەڵوێستی خۆیان دادەکەون جابیر بکەنەوە ئاخۆ یەکێ فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ و جەهەندەما باشترو چاکترە یاخود بەدڵنیایی و ئەمینی لەرۆژی قیامەت و حیسابا بێتە پێشەوە، دەی کەواتە کارو کردەوەو هەڵوێست و بیروباوەڕی نادروست دەپرژێتەوە سەر سەری خاوەنەکەی، جا فەرموون چی دەکەن بیکەن بەخواست و ویستی خۆتان، ئەوە بەڕاستی خودای چاودێر بەکارو کردەوەتان بینایەو، کەسێك زەڕڕەیەك خێرو شەڕی وون نابێ و لەئەنجاما وەکو خۆی دەیبینێتەوە .

زاتی شکۆمەندو ئازیزو چاودێر بینای لەهەر هەموو شتێکا، هیچی لێ وون نەبووەو نابێ وەشتێ نیە بتوانێ ڕێگە لەچاوی زاتی ئەوا بگرێ ، ئائەوەتە زاتی شکۆمەند لەکیتابە ئازیزەکەیدا لەسورەتی (الملك) لەئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّهُ بِكُلِّ شيءٍ بَصير ﴾ .

هەروەها بەسەر هەموو شتێکا وەك کەچاوی لێیەتی پێشیەوە ئاگادارەو بەسەریەوە شاهێدە، وەکو خۆی لەکیتابە بەرزو پیرۆزەکەیدا دەفەرموێ : ﴿..إِنَّ اللَّـهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ الحج: ١٧ .

وەکو خوای گەورە بیناو ئاگادارو شاهێدە بەسەر کەون و بونەوەرا ئاوەهاش لەهەمان کاتدا بیسەرو زاناشە وەکو دەفەرموێ ﴿ .. وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ هەروەها زاتی باڵادەست و پەروەردگار موراقیب و چاودێریشە بەسەر هەموو

کەون و بونەوەرەوە بەهەموو بەش و پارچەکانیانەوە ، وەك لەسورەتی الاحزاب ئایەتی (٥٢) دا دەفەرموێ : ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَقِيبًا﴾ الاحزاب : ٥٢ .

ئەوسا بابێینەوە سەر باسی نەفس و گیانی خۆمان کەخودای گەورە هەردەم پەروەردگارمانەو چاوی لێمانەو بیسەری ووتارمانەو ئاگادار بەحاڵمانەو بەڕێوەبەری لایەنانی ماددی و مەعنەویمانە ، ئەو هەموو ئەندامانە هەر خۆی خەلقی کردوون و هەر خۆی بەڕێوەیان دەبا ، ئەو هەموو عەقڵ و ژیری و بیرو فکرو زاکیرەو هۆش و هەست و زەین و روح و گیان و نەفس و ئەندێشەو خەون و خەیاڵ و .. هتد هەر گشتیان وان لەبەر چاوی زاتی خودا، وان لەبەر عیلم و زانستی خودا وان لەبەر موراقەبەو چاودێری خودا ..

با هۆشێك بێنینەوە خۆمان و روو لەنەفس و گیانمان بکەین و پێی بڵێین ئەی نەفسی غافڵ نەفسی بێ ئاگا هەتا کەی نوستووی نایێی وەئاگا، خەریکە بڕۆی لەدونیای فانی ، هەتاکو کەینێ رێگەت نازانی ، جێی عەیب و عارە پیس و زەلیلی، حەیف و موخابن ئەوها رەزیلی ، بەئومێدی چیت گەر خودات ناوێ بۆسەرگەردانی هەڵناستی تاوێ ، ژێرکەوتووی باری تەونی شەیتانی ، تاکەی دوژمنت بەدۆست دەزانی ، والەژێر چاوی پەروەردگاری ، بێداربەرەوە تۆ زۆر هەژاریت ، چاودێری خودا بۆ تۆ رەحمەتە ، تا دونیات ماوە بۆ تۆ مۆڵەتە ، کەبارت کردو رۆی بۆ ناو گۆڕ مۆڵەت کۆتایەو دەبی سەرەو شۆڕ ، ئەوساش بێدری سوودی ناگەیەنێ ، نەمزانیو خۆزیا چیت پێناگەیەنێ ، دەخیەلك یا رب فریامان کەوە، لەو نەزانینەی تێکەوتینەوە ، تاکە رەحمی تۆ بۆمان دەرمانە ، چارەمان دەکا لەگشت جیهانە ، ئەی چاودێری بێخواردن و خەو، ئەی چاودێری بەرۆژو بەشەو ، ئەی بیسەرو بینای زیندوو، ئەی راگری دونیای هەموو ، فەرامۆشیمان بەتۆ دێ ، سروەت بەیادت بۆ دڵی دێ ، بۆ تاوێ رەحمەتت لێن مەبڕە ، ئەوەی بێئومێدبێ هەر کوفرە .

## الله المجيب

ناوێکە لەناوە دڵخۆشکەرەکانی خوای چاودێر ، بنچینەی ئەم نـاوە (جـاب)ەیـە واتە وەڵام دانەوەو جواب دانەوە ..

المجيب : واتە ئەم میهرەبانە پەروەردگارێکە بەهانای داماوان و ستەم لێکراوانەوە دەچێت بەتایبەتی کاتێ کەلێی دەپاڕێنەوەو نزای لەبەر دەکەن .. هەر وەهـا بـەوەڵامی دۆستانی خۆی دێتەوە ..

خوای گەورە جێگای هانای هەموو شتێکەو هـەموو کەسـێکە هەرچـەندە ئـەو کەسە بێبڕواو گومڕا بێت ، لەکاتی تەنگانەو بێنیازبوونی لەدەورو بـەری ، بەناچـاریەو بێی دەستی خۆی لەدەرروونەوە ئاواتی پێدەخوازێ و هانای بۆ دەبات و لێی دەپاڕێتـەوە ، وەخوای گەورەش زۆر جار بەوەڵامی نەمانیشەوە دەچێت ، وەهـەر خوایـە ناخۆشـی و بەڵا لادەدات و ژیان ئاسودە دەکات و شیفای نەخۆشـەکان دەداو ، دەسـتی سـتەمکارو زاڵمان کورت دەکاتەوە ، وەك باسی بەهانا هاتنی خۆی دەکا لەکاتێکا پەنای پێـدەدرێ و لێی دەپاڕێـنەوە .. وەك دەفەرموون : ﴿أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَـاهُ وَيَكْـشِفُ السُّوءَ ..﴾ النمل:٦٢ .

واتە : ئایا ئەدی ئەوە خوا نیە!؟ کەبەوەڵامی لێقەوماوو ناچاردا دەچێ ، کـاتێ کەلێی دەپاڕێنەوەو ئەویش ڕزگاری دەکات لەناخۆشی ، یاخود کێیە تەنگانەو ناخۆشی لادەدا ؟ واتـە بێگومـان هـەر خـوای وەڵامدەرەوەیـە .. وەبێجگـە لـەخوای گـەورەش کەسێنیە لەغەیبەوە بەهانای کەسێ بچێ و لەتەنگ و چەڵەمەو ناخۆشی ڕزگاری بکات ، کەواتە کەسێ شایستەی ئەوە نیە لەغەیبەوە لێی بپاڕدرێتەوە تـەنها خـوای بێهاوتـا نەبێ ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّـهِ مَـنْ لاَ يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴾ الاحقاف : ٥ .

واتە : کێ لەو کەسە گومڕاترە کەلەغەیری خوای گەورە دەپاڕێتـەوە ، وەئـەوەی لێی دەپاڕێتەوە بەوەڵامیەوە نایێت تا ڕۆژی قیامـەت ، وەلەپاڕانـەوەی ئـەو غافـڵ و

بێئاگایه .. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ﴾ البقرە : ١٨٦ .

واتە ئەی نێراوی خوا ئەگەر بەندەکانم لێیان پرسیم ئەوە بێگومان من نزیکم و بەوەڵامی نزای نزاکان دێمەوە تابەوەڵامەوە بێن و باوەڕیم ، پێبێنن ، تکا وایە شادمان و سەرفرازبن ..

مادام خوای گەورە تەنها بەوەڵامی نزاکاران بێتەوە ، پێویست و ئەرکە لەسەر شانی بڕواداران فەرامۆشی نەکەن و لەبەریا نزا بکەن وەك دەفەرموێ : ﴿ وقال ربّكم ادعوني استجب لكم ﴾غافر: ٦٠ . واتە پەروەردگارتان دەفەرموێ لەنزا (دوعا) رووبکەنە من بەوەڵامتانەوە دێم .. خوای گەورە پاڕانەوەی کردووە بەمۆخی عیبادەت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( الدعاء مخ العبادة ) یا دەفەرموێ (الدعاء هو العبادة) واتە پاڕانەوە خۆی عیبادەتە، وەمەخلوقیش شایانی عیبادەت بۆ کردن نیە تەنیا خوای تاك و تەنها نەبێ .. هەندێ جار خوای گەورە بەوەڵام هاتنەوەی ئیمانداران دوا دەخا بۆ رۆژی قیامەت لەبەر چەندەها حیکمەت کەهەر خۆی دەیانزانێ ، جالەو رۆژە بە وەڵامیانەوە دەچێت و بەگوێرەی نزاکانیان تاوانیان لەسەر هەڵ دەگرێ و لێیان دەبورێ ، ئەوانیش ئەو کاتە ئاوات دەخوازن بەوەی خۆزیا خوای گەورە گشت نزاکانانی بۆ ئێستا هێشتباوە ..

وەکو سروشت و فیترەی ئادەمیزاد شاهێدە لەسەر موجیبێتی خودای باڵادەست و شکۆمەندو ئازیز ، لەوەی کاتێ کەتووشی تەنگانەو بەڵاو موصیبەت دێت بەوەی کەبێئومێد دەبێ لەهۆکارو ئەسبابە ماددیەکان بۆ چارەو حەلی ، ئەو کاتە بێ سێ و دوو لەدەروونیەوە ئومێد دەخوازێ بەزاتی خالقی ، بەفیترەی خۆی دەیسەلمێنێ کەزاتێکی باڵادەستی دوور لەهەموو کەم و کوڕیێ ، وەخاوەن هەموو دەسەڵاتێك وا زاڵە بەسەر هەموو شتێکەو جێگەی ئومێدی ناچارو بێچارانە، هەر خۆشی موجیبەو بەوەڵامی

نزاكاران دێتەوە ئەگەر خواستی لەسەربێ ، وەكو خاوەن موڵكەو زاڵە بەسەر هەموو بونەوەرا وەخاوەن ناوە جوانەكان و سیفەتە بەرزەكانە لەمانەش موجیبێتی، قوئانی پیرۆزیش لەزۆر ئایەتا ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە دەكات ، یەكێ لەم ئایەتانە خوای گەورە لەسورەتی الانعام لەئایەتی (٤٠ و ٤١)دا دەفەرموێ : ﴿قُلْ أَرَأَيْتَكُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللَّهِ تَدْعُونَ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ(٤٠)بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِنْ شَاءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴾ .

دیارە هەر موجیب ئومێدی لێدەكرێ بۆیە داواو نزای لەبەرا دەكرێ ئەمەش راستیەك و شاهیدیەتێكی فیترەو سروشتی ئادەمیزادە ، هەروەها ئەگەر سەیری مێژووی ئادەمیزادێتی بكەین مانای موجیبێتی و بەوەڵام هاتنەوەی خودایی تێدا رەونەق و ئاشكرایە ..

وەكو خوای موجیب لەقورئانە پیرۆزەكەی دا كەتاكە سەرچاوەیەكی بێشك و گومانە زۆرێك لەسەر گوزشتانی مێژوومان بۆ دەگێڕێتەوە لەوانەش بەتایبەتی ژیانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كەچۆن خوای گەورە بەوەڵامی داواو نزاكانی هاتوونەتەوە ، هەر لەدوعاكەی حەزرەتی ئادەمەوە تا دوعاكانی پێغەمبەری خۆشەویستمان علیه الصلاة والسلام یەكێ لەدوعاكانی حەزرەتی ئادەم و دایكە حەوا بریتیبوو لە : ﴿ قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ الاعراف : ٢٣ .

واتە : وتیان پەروەردگارا ستەم و زوڵممان لەگەیان و نەفسی خۆمان كرد ئەگەر لێمان نەبووری و رەحمەمان پێنەكەی ئەوە بێگومان لەدۆڕاوو خەسارەت مەندان دەبین ، هەروەها یەكێ لەدوعاكانی حەزرەتی (نوح) علیه الصلاة والسلام وەك كەخوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە لەسورەتی (نوح)دا كەفەرمویەتی لەدوعاكەیا: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لاَ تَذَرْ عَلَى الأَرْضِ مِنْ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا ﴾ نوح : ٢٦ . واتە حەزرەتی نوح فەرمووی پەروەردگارم هیچ كافرێ لەسەر ڕووی زەوی مەهێڵەوە، دیاریشە كەسەرەنجام چۆن خوای

گەورە بەوەڵامی هاتەوەو دوعاکەی گیراکرد ، هەروەها دوعاکانی حەزرەتی ابراهیم (علیه الصلاة والسلام) وەك خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : ﴿رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ(١٢٨)رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ البقرە : ١٢٨ ـ ١٢٩ .

پاش ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم و کوڕەکەی کەحەزرەتی ئیسماعیل بوو بینای کەعبەیان دروست کردووە رویان کردە پەروەردگارو هەندێ دوعایان کردو فەرموویان پەروەردگارا کارو کردەوەکانمان لێ قەبوڵ بکەو بەڕاستی تۆ بیسەرو زانای پەروەردگارا بمان گێڕە بەموسڵمان و ملکەچی بەرنامەو یاساکەت وەلەوەچەو نەوەکانیشمانا نەتەوەو ئوممەتێکی موسڵمان و مل کەچ بەبەرنامەو یاساکانت بگێڕە رێگەی بەندایەتیو هیدایەتمان بۆ رەوشەن بکەوەو وەتەوبەو پەشیمانیمان لێ قەبوڵ بکەو وەرگرە، بەڕاستی تۆ تەوبە وەرگری میهرەبانی ، پەروەردگارا پێغەمبەرێکی خاوەن ریسالەو نامەرەوان کە ناویان کەئایات و وتارانی تۆ بەسەریانەوە بخوێنێتەوە فێرە عیلم و مەعریفەتیان بکات و فێرە حیکمەت و داناییان بکات و دڵ و دەروونیان پاك بکاتەوەو تەزکیەیان بکات، بەڕاستی تۆ ئازیزو شکۆمەندو داناو حەکیمی .

جاخودای گەورە دوعایانیانی گیرا کردو بەوەڵامیانەوە هات وەکو خۆی و مێژوو عالیمان و ئیمانداران گشتیان شاهێدن ، هەروەها خودای شکۆمەند باسی یەکێ لەدوعاکانی حەزرەتی یونسمان (علیه الصلاة والسلام) بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ : ﴿ .. فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ(٨٧)فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ ﴾ الانبیاء : ٨٧ ـ ٨٨ .

واتە لەبەرمان پاڕایەوەو نزای لەبەرمان کرد، بانگی کرد لەناو تاریکاییانا ئەی خودای شکۆمەندو پەرستراو هیچ پەرستراوێ نیە بەغەیری تۆ نەبێ ، پاکو بێگەردی

شایەستەی تۆیەو تـۆ دووری لەهـەموو کـەموکوڕیێ، مـن بوومـە لەستەمکاران، جـا بەوەڵامیەوە چوین و دوعاو نزاکەمان گیراکـرد وەرزگارمـان کـرد لـەو غـەم و پـەژارەو بەڵایەی تێی کەوتبوو ، ئاوەهاش ئیمانداران رزگار دەکەین لەبەڵاو موصـیبەتان ئەگـەر رومان تێبکەن و لەبەرمان بپاڕێنەوە تەوبەو پەشیمانی دەربڕن .

هەروەها خوای باڵادەست و موجیـب و شـکۆمەند دوعـاو نـزای خواپەرسـتانی مێـژووی قـەبوڵ کـردووە ، وەئەگـەر بـەووردی سـەیری سـیرەی ژیـانی پێغەمبـەری خۆشەویستمان بکەین (ﷺ) دەبینین خوای ئازیز هەردەم موجیب بووە بەوەڵامی دوعـاو نزاکانی هاتۆتەوە .. هەروەها بەوەڵامی ئیماندارانی خواپەرستی ئوممەتی (محمـد)یـش (ﷺ) هاتۆتەوە ، کاتێ کە شەرت و شروتی دوعایان تەواو بووبێ .

بەڵێ بەوەڵام هاتنەوەی خودای موجیب و مـەرجانی خـۆی هـەن وەکـو ئیمـانی بێگەردو پاك و خاوێنی دڵ و دەروون و دەووری لەپیسی و حەرامی ماددی و مەعنەوی .. هتد کەبەدرێژی لێرەدا جێگەی نابێتەوە، بەڵام ئاماژەتان دەکەم بۆ کیتابی (سـبحانك اللهم) کەدانراوی (جمیل ابراهیمە) کەزۆر بەدرێژی باسی دوعاو مەرجەکانی کردووە .

جا ڕوو لەخودای موجیب دەکەین :

خودایە گیان یارمەتیمان دە ، بۆ دوعایـانی چـاك مۆڵـەتمان دە ، تـۆ بیسـەری نزایان و هاوارانی ، تۆ موجیبی لێقەوماوو ناچارانی ، ئەوەی روو لەتۆکە پەشیمان نابێ ، لەدونیاو قیامەت شەرمەزار نابێ ، هاوارمان هێنایە قاپی رەحمەتت ، رومان تێبکات لوتفی کەرەمت ، ئێمەین لەدونیا غەریبین هەردەم، هەرتۆمان هەیە بەسـیت بـۆ گـشت دەم، توانامان بدە زاناو هۆشیارین، لەبەندایەتیت گشت کات بەکارین ، دەرونمان پاککـە نیەتمان چاککە، هیچ بێی تۆ ناکرێ ئەی خاوەن چاکە، لەدونیاو قیامەت بەهرەمەندمان کە ریزوان و رەحمەت پێمان عەتاکە .

ئەگـەر سـەیرێکی مێـژوو بکـەین چـەندەها وانـەمان فێردەکـات لەچـۆنیەتی سونەنەکانی پەروەردگاری فراوانکار وەك زاتی باڵادەست و ئازیز دەفەرموێ : ﴿قَدْ خَلَتْ

مِنْ قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُروا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ ال عمـران: ١٣٧ .

واته لەپێش ئێوه لەمێژوودا سونەنانی خودای گەوره تێدا حوکمی کـردو رابـورد جا فەرموون بگەڕێن لەسەر زەویدا مێژوویان سەیرکەن و ئاسـەواریان ببیـنن چـۆن بـوو چارەنووسی درۆزنان و بێباوەڕان، ئاوەها زاتی شکۆمەند دەسەڵات و سونەنانی فراوانـی ئەو هەموو کون و قوژبنێکی گرتۆتەوه، هیچ کـەس و شـتانێکی فـەرامۆش نـەکردووه، گشتیانی گرتۆتەوه خۆو وەدەیان گرێتەوه خۆی ، وەلەڕووی دارایی و سامان و دەسـەڵات و مولکیشەوه زاتی فـراوان کـار لەسـورەتی (البقـره)دا لەئایـەتی ٢٤٧ دا دەفـەرموێ ﴿..وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ .

زاتی (الله) پەروەردگاری مەزن دەوڵەمەندی بێـسنور خـاوەن هـەموو مولـك و سەروەتەکان هەر خۆی ئیدارەی مولکایەتی لەدەسـتەو حیکمـەت و دانـایی ئـەو حـوکم دەکاو، مولك و سامان و دەسەڵات بدات بەکێ پێی دەداو ، ئەم زاتە (الله) یـە خـودای بێ هاوتایەو خاوەن زانست و زانیاری فراوانە بەماهیەت و زانـست و نـاوەڕۆکی هـەموو شتێ دەزانێ .. زاتی پەروەردگار سیاسەت و پیلانێکی شەیتانمان بۆ ئاشکرا دەکاو وادەو سونەنێکی خۆیمان بۆ روون دەکاتەوه وەك لەسورەتی (البقره)دا لەئایەتی (٢٦٨ ـ ٢٦٩) دا دەفەرموێ : ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمْ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُمْ مَغْفِرَةً مِنْـهُ وَفَضْلاً وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ(٢٦٨)يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ﴾ واتـه: شـەیتان وادەی فـەقیری و هـەژاریتان پێدەدا بەو هۆیـەوه دەتـان ترسـێنێ و ، لەحـەق دەتـان ترازێنـێ و ئـەمرو فـەرمانتان پێـدەکات بـەکارانی نـاڕەواو فاحیـشەو ناهـەموارەوه .. وەخـودای شـکۆمەند وادەی مەغفیرەت و لێبوردەییتان پێدەدات لەگەڵ فەزڵ و بەهرە لەلایەنی خۆیەوه ، وەخـودای ئازیز زانست فراوانـە هـەموو کـارێکی رەوانـە ، حیکمـەت و مەعریفـەت و دانـایی و کارچاکی دەبەخشێ بەخواستی پڕ لەحیکمەت و دانایی خۆیەوه ، جا ئەوەی حیکمـەت و

دانایی و مەعریفەتی پێبەخشرابێ ئەوە بەڕاستی و بێگومان خێرو بەهرەیەکی زۆری پێدراوە ، بەلاّم کەسێ لەم ناوەرۆکە حەقیقەتیانە بیرناکاتەوە لێی تێ ناگات و بیری لێ ناکاتەوە ئیللا خاوەن مێشك و عاقڵ و ژیرمەندەکان نەبێ ، هەروەها زاتی فراوانکار لەسورەتی (آل عمران) دا لەئایەتی (٧٣)دا دەفەرمومێ : ﴿قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری رابەرو سالار (ﷺ) بفەرموو بلّێ بەڕاستی فەزڵ و کەرەم و بەخشش و بەهرە گشتی بەدەست زاتی (الله)یە بەخواستی پڕ لەحیکمەت و دانایی بەهەر کەسێ ببەخشێ ،دەیبەخشێ زاتی خوا زانست و زانیاری فراوانەو بەهەموو کارو دانایی دەزانێ .

## ٤٥ ـ الواسع

ناوێکه لەناوە جوانەکانی خوای وەلأمدەر ، ئەم ناوە (٧) جار لەقورئانا هاتووە ، بنچینەکەی (سعی)یە واتە فراوان و بلاو .

الواسـع : واتـە ئـەم خوایـە پـەروەردگارێکی فراوانـە لەدەسـەلآت و بـەزەییو بەخشندەیی و زانیاریو دانایی و هەموو شتێ ..

فراوانێتی خوای گەورە لەهـەموو لایەنەکانـەوە سـنورێکی بـۆ نیـە کارلێکـەرو پرسـیار لێکراوێکـی لەسـەر نیـە ، بـەڵکو سەربەسـت و دڵنیایـە بەخواسـتی خـۆی ، وەفراوانی دەدا بەهەر شتێ کەبیەوێ ، بەخـشش و زانیـاریو دەسـەڵاتی خـوای گـەورە هەموو شتێکی گرتۆتەوە ، بونەوەرەکانی شایەدن و گەواهی لەسەر ئەم راسـتیە دەدەن ، وەکو خوای گەورە بەزمانی فریشتەکانا دەفەرموێ : ﴿ .. رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَحْمَةً وَعِلْمًا ..﴾ غافر :٧ هەروەها دەفەرموێ ﴿ .. وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ ..﴾ بقرە:٢٥٥ .

بەخشش و فراوانێتی خوای گەورە جۆرەها حیکمەتی زانایی تیا نواندووە ، تاکو ئادەمیزادەکان سەر لێشێواوو سەرگەردان نەبن ، وەبەچاوی ژیری بڕواننە هەر یەکێ لـەو هەزارەها بونەوەرە بەخشش و فراوان پێدراوە ، تـا ڕاسـتیان بـۆ دەرکـەوێ و دڵ ڕۆشـن کەنەوە بەچرای ئیمان ، وەئەمانیش ئەم سیفەتە لەبەینی خۆیانا بهێننـە دی ، هـەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ الذاريات : ٤٧ .

واتە : خوای گەورە ئاسمانی بەدیهێناوە بەهێزو دەسەڵاتی فراوانـی ، وەبـەردەوام لەگەورەکردن و فراوانیدایە ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَمَنْ يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ﴾ النساء: ١٠٠ .

ئەم ئایەتە مزگێنی و موژدەیەکی گەورەیە بۆ ئیمانداران ، واتە ئەوەی کۆچ بکا لەرێگەی خودا ، بەدەستی دەکەوێ بەرەکەت و فرانیەکی زۆر ، ئەمەش سەرەڕای ئیمـان بەرزی و پلەو پایە ، هانی موسڵمانان دەدات بۆ هیجرەت و کۆچ کـردن کـاتێ کەلـەژێر

دەستی ستەمکارانا ئەچەوسێندرێنەوە ، بۆ ئەوەی رازی نەبن بەچەوسانەوەو فەزڵی کۆچ کردن بدەن بەسەر ئەو زەلیلیەدا هەروەك لەم ئایەتەشدا دەفـەرموێ : ﴿يَاعِبَادِيَ الَّـذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ ﴾ العنكبوت : ٥٦.

واتە : ئەی خواپەرستانی خاوەن باوەڕ بێگومان زەویمان فراوان خـەلق کـردووە ، تەنها بەندایەتی بۆ من بکەن .

زاتی ئازیزو شکۆمەند ئیداو بانگەوازێ رادەگەیـەنێ بـەگوێی ئیماندارانـداو دەفەرموێ : ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لاَئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ المائده : ٥٤ .

واتە : ئەی ئەو کەسانەی کەئیمانتان هێناوە بێدارببنەوەو حاڵی بن ئاینی خـودا پەکی بەئێوە نەکەوتووەو ناشکەوێ خوای گەورە خۆی قیادەو سەرکردایەتی دەکـات جـا هەریەکێ لەئێوە هەڵگەرێتەوە مورتەد بێت لەئاینەکەی ئەوە خودای باڵادەسـت لەپاشـا گەل و قەومانێ تر هیدایـەت دەدات دەیـان هێنێتـە کایـەوەو لەمەیـدانی خواناسـیندا حاڵییان دەکاو عاشقیان دەکات بەخۆی و بەرنامەکەیەوە، خـودا ئـەوانی خـۆش دەوێ و ئەوان خودایان خۆش دەوێ ، ملکەچی ئیمانداران دەبـن و سـەمع و طـاعـەیان دەبـێ و گوێڕایەڵ و دڵسۆز دەبن، بەم ئیمان و سیفەتە بەرزانە یەکێتی و تـەبایی‌و هێزیـان دەبـێ پێیەوە خاوەن عیززەت و دەسەڵات دەبن بەسەر کافران و بێباوەڕان ، جیهادو تێکۆشـان دەکەن لەپێناو رێگەو دیـن و بەرنامـەی خـودا وەناشترسـن و ناسـڵەمێنەوەو نـاڕوخێن بەلۆمەی لۆمەکاران .. بەڵام ئەمە فەزڵ و بەهرەیـەکی خـودای شـکۆمەندە شایەسـتەی هەموو کەسێ نیەو بەڵکو خودای ئـازیز دەیـدا بەکەسـانێ کەئـەهل بـن و حیکمـەت و دانایی ئەو بیخوازێ ، وەخودای گەورە زانست و زانیاری گەلێ فراوانە دەزانێ کێ پـشت هەڵدەکاو کێش پشت لەدین و ئاینەکەی هەڵناکاو کێش شایەستەی فەزڵ و هیدایـەت و رەحمەتە ، بەڕاستی مێژوو ئەم ئایەتانەی تەفسیر کـردووەو بـەواقیع ، لاپـەڕانێکی زۆری

خستۆته ڕوو لەروون کردنەوەی سونەنانی خودایی، جا ئادەمیزادی ئیماندار پێویستە هۆشیارو بێداربێ بەهەمیشەیی بشزانێ شەیتان هەردەم بۆی لەکەمین دایە تاکو هەڵی گەڕێنێتەوە لەئاینەکەی، ئیتر بابەوە خۆی هەڵ نەخەڵەتێنێ کەموسڵمانەو ئیتر تەواو ..

هەروەها خودای فراوانکار لەبارەی چاوچنۆك و بێ قەناعەتی بێ متمانەیی کەسانێ بەرازیقایەتی خودا کەبونەتە بەر بەست لەپێش دروست بوونی خێزانانی نوێ ، وەکو بەشودان و ژن هێنان بێ ، دەفەرموێ : ﴿ وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ النور : ٣٢ .

ئەو ئافرەتانەی کەبێمێرد ماونەتەوە بیان دەن بەشوو بەخاوەنیان کەن هەروەها ئەو بەندەو جارییە باشانەتان ژنیان بۆ بهێنن و بیان دەن بەشوو ، وەئەگەر ئەو کەسانەی داوای ژنتان لێدەکەن فەقیرحاڵ و هەژارو گەدا بوون وەژنیان پێنەنەدان ، یا ئەو ژنانە کەماریان دەکەن بۆ داخوازیان هەژارو گەدابوون جالەبەر فەقیرو هەژاری و کەس نەدەهات ماریان بکات ، ئەوە مەکەن بەهۆی تەرکی ئەو مارەکردنەو ئیعتیمادو تەوەککولتان لەسەر کەرەم و بەخشش و ڕەحمەتی خودابێ .. ئەوانە هەرچەند فەقیرو هەژارین ئەوە خودای گەورە بەفەزڵ و کەرەم و میهرەبانی خۆی دەوڵەمەندیان دەکا دارایی فراوان و گوشادەو خاوەن زانست و زانیاریشە بەحاڵ و ئەحواڵی ئێوە دەزانێ، رزق و رۆزی زیاد و کەم دەکا بەگوێرەی حیکمەت و دانایی خۆی ..

لەواقیعدا ئەگەر موسڵمانان لەهەموو چەرخ و زەمانێکا پەیڕەوی ئەم ئایەتەیان بکردایە ئەوە گەلێ کەس دادەمەزران و لەسەدان تاوانباری و گیروگرفت و ئاشوب دەپارێزران .

هەروەها زاتی شکۆمەند و ئازیز لەسورەتی النجم دا لەئایەتی (٣٢) دەفەرموێ : ﴿ .. إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلاَ تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ اتَّقَى ﴾ .

واتە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ مەغفیرەت و لێبوردەیی فراوانە خۆی لەهەموو کەسێ باشتر دەتان ناسێ لەو کاتەی ئێوەی لەسەر زەوی بەدیهێناوە وەلەو کاتەی کەئێوە کۆرپەلە بوون لەزگی دایکتانا ، جا مەردی خوابن بەپاکیو چاکی ڕوویکەنە خودا خۆ هەڵنەکێشن، خوای گەورە خۆی لەهەموو کەسێ باشتر دەزانێ کێ لەخوا دەترسێ و تەقوای خوا دەکات ..

هەروەها خوای بالآدەست لەسورەتی النساء دا لەئایەتی (١٣٠)دا دەفەرموێ ﴿ .. وَكَانَ اللّٰهُ وَاسِعًا حَكِيمًا ﴾ واتە بەڕاستی خوای گەورە حیکمەت و دانایی گوشادو فراوانە هەموو لایەنەکانی بونەوەری گرتۆتەوە ..

جا زاتێك فراوانی و گوشادی بەهەموو شتی دابێ، بەعیلم و ڕەحمەت بەمەغفیرەو حیکمەت نیداراتی کارفراوانی هەموو لایەنەکانی لەدەست خۆیا بێ، شایەستەی پەرستن و مل بۆ کەچ کردنە شایەستەی ڕوتێ کردن و خۆشویستنە ، جاڕووەو زاتی فراوانکار دەڵێین :

پەروەردگار فراوان کار، خۆشەویستی دڵی هۆشیار، گوشادی دەدەی بەشتان، ڕەحمەت دەدەیتە بەهەشتیان ، ئێمەش هیواو گشت مەبەستمان، ڕەحمی تۆیە بێتە دڵمان، بەئومێدی ئەوە دەژین لەخزمەتدا ڕوو سپی بین ، ئەو ئومێدە جێی مەبەستە سەرەنجامی هەر بەهەشتە، ئەوەی خاوەن هەست و نستە هەر ئەم ڕێیەی خۆشەویستە ، چی لەدونیای وافانی کەین گەر بۆ خودا چاکی نەکەین ، وا خەریکە لێی باریکەین ڕووەو خوا مل هەڵ بکەین .

## ٤٦ ـ الحكيم

ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای فراوان کار ، (٩٧) جار ئەم ناوە هاتووە لەقورئانی پیرۆزدا کە (٩٣) جاریان مەبەست سیفەتی خوای گەورەیە ، بنچینەی ئەم ناوە (حکمە) واتە کارو فەرمانی رێك و دانایی .

الحکیم : واتە خوای میهرەبان زۆر دانایە لەهەموو کارو فەرمانەکانی ، وەهیچ بونەوەرێك نیە کەسەرتاپای لەداناییدا دانەرێژرابێ ، وەداناییەکەی خوای گەورە لەپاڵ دەسەڵات و زانیاری بێسنوورەوەیە ، وەك دەفەرموێ : ﴿ ..فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ البقرە : ٢٠٩ . واتە بزانن بێگومان خوای بێهاوتا دەسەڵاتی بێ سنورو دانایە .. هەروەها لەسەر زوبانی فریشتەوە دەفەرموێ : ﴿..إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴾ البقرە : ٣٢. هەروەها دەفەرموێ ﴿..لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ ال عمران :١٨ .

هەتا بەدیهێنراوەکان و دروست کراوەکانی خوای گەورە لە ئەتۆمەوە بۆ کەشکەشان ، ئاشکرا ترو رونترین بازاڕی گەورەییو دانایی خوای مەزن زیاتر خۆی دەنوێنێ ، وەهەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە پاکێتی و دانایێتی خوای گەورە ئەنوێنن وەك دەفەرموێ : ﴿..يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ الحشر:٢٤ .

وەهەرچی ڕووداوەکانی قەزاو قەدەرە گشتی پڕ حیکمەت و دانایین ، گەرچی ئێمەش سەرمان لێ دەرنەچێت ، هەروەها یاساو بەرنامەکەی حیکمەت و داناییەکەی لەژمارە نایەن ، وەگشتیان بۆ بەرژەوەندی نادەمیزادە وەیەك پارچە بەخشش و بەزەییە ، جائەوەی بەدڵ و بەگیان پەیڕەوی لێبکا ئەوە خۆی لەبەخشش و بەزەیی خوا هەڵێنجاوەو بەختیاری و ئاسودەیی لەگشت لاوە چاوەڕێی دەکا ، وەئەو کەسەی پشتی تێبکاو خۆی لێبێ ئاگا بکا ئەو پەڕی ڕەزالەتی و دەردی سەری بەسەریەوە کۆنەبنەوە لەدونیاو قیامەتدا ..

خوای گەورە لەداناییەکەی بەرپرسیار نیە لەهیچ روو لایەنێکەوە ، هەروەها

لەهەموو سیفەت و کارو فەرمانیدا ، وەك دەفـەرموێ : ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَـلُ وَهُـمْ يُسْأَلُونَ﴾ الانبياء:٢٣.

بەڵام بەدیهێنراوەکانی بەتایبەتی ئادەمیزادو پـەری (الجن) بەرپرسـیارن لەهـەر نیازو کارێکا کەئەنجامی دەن ، ئەمەش لەبەر چەند هۆیێ ، یەکێ لـەم هۆیانـە ئەوەیـە خوایەتی خوا مانای ئەوە دەگەیەنێ کەبەر پرسیار نەبێ و پرسیاری لێنەکرێ و رەخنـەی لێنەگیرێ ، ئەگینا مانایەتی خوا ناگەیەنێ ، سبحانه وتعالی ..

وە دووەمیان خوای گەورە زانیـاری و زانـستی هـەموو شـتێکی هەیـەو لەلایـە بێهیچ کەم و کورِیـەك ، دەی کەواتـە لـەکارو فەرمانـەکانی و سـیفەتەکانیدا نـەنگیو ناتەواوی روونادا ، وەك کەروی نەداوە .. بەڵام ئادەمیزاد لەزانست و زانیاری زۆر هەژارە ، لەهەموو کارو فەرمانێك و ئیشێکا نزیکە لەکارنا بەجێی .. هەروەها خـوای گـەورە لەئیمانداران دەگەیەنێ کەهەرچی وا لەئاسمانەکان و زەویـدان سـەربازی دڵـسۆزی خـوای دەسەڵات دارو دانـان ، وەهەرچـەندە ئادەمیزادەکـان پـشت لەیاسـاکەی بکـەن ، ئـەوە بێگومان لەدەسەڵات و دانایی خوا کەم نابێتەوە ، وەك دەفـەرموێ : ﴿وَلِلَّـهِ جُنُـودُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ الفتح :٧ .

خودای باڵادەست و شکۆمەندو دانا وەك لەهـەموو کارەکـانی دانـابوەو دانـاش دەبێ ، وەکاری بێ دانایی ئەنجام نەداوەو ئـەنجامیش نـادات ، هەرخۆیـەتی شایەسـتەی حوکم کردنەو هەر بەرنامەکەی ئەو کیتابەکەی ئەو لایەقی پێشوازی کردەنەو گوێرِایـەڵی بۆ کردنە ، چونکە وەکو خۆی حەکیم و دانایـە ئـاوا کیتابەکەشـی سـیفەت و کـەلامی خۆیەتی ، چونکە دانایەو حەکیمە وەکو خۆی دەفەرموێ : ﴿الر تِلْكَ آيَـاتُ الْكِتَـابِ الْحَكِيمِ﴾ یونس :١ .

جا هەرکەسانێ دەسـت بـەم کیتابـە حەکیمـەوە بگـرن ئـەوە کـارو بارەکانیـان لەهەموو روولایەنەکانی ژیانەوە بەداناییو حەکیمیەوە بەسـەر دەچـێ بـێ هـیچ شـك و گومانێك گەر ئادەمیزادیش لەهەندێ لایەنەوە سەری لێدەرنەچێ..

لە (٩٣) ئایەتدا سـیفەتی حەکیمایـەتی و دانـایی خـودای شـکۆمەند هـاتووە

لەقورئانە ، جا ئەگەر هەر ئەوەدو سێ ئایەتەکە بێنینەوە رونی کەینەوە لەگەڵ ئەو باس و خواسەی کەتیایاندا هاتووە ئەوسا کەمێ لەحەقی باسی حەکیمایەتی خودای دانا نەزیك دەبینەوە ، هەروەها ئەگەر بۆ مێژوو ئێستای دونیا بڕوانین بەهەموو مەخلوقەکانیەوە بەگیانلەبەرو بێگیانیەوە بەبەرزو نزمیەوە بەرەش و سپیەوە بەگەورە و بچوکیەوە ، ئەو کاتە بۆ چاوی ژیری و بیرمان رون دەبێتەوە کەخالیقیان پەروەردگارو بەڕێوەبەریان زۆر حەکیم و دانایەو کاری بێ دانایی ئەنجام نەداوەو ئەنجامیش نادا، یا بەمانایەکی‌تر بڵێین تیشکی حەکیمایەتی خوای دانا لەهەموو روو لایەنێکی ئەم کەون و بونەوەرە دەدرەوشێتەوەو هەموو پێچ و پەنایێکی گرتۆتەوە..

لەو کاتەی کەزاتی دانا بەفریشتەکانی راگەیاند کەلێرە بەو لاوە ئادەمیزاد بەدی دەهێنم و دەیکەم بەخەلیفەو جێنشینی خۆم لەسەر زەویدا ، فریشتەکانیش ووتیان پەروەردگارا حیکمەت چییە لەم کارەتدا ، بۆ ئێمە ناکەیت بەخەلیفەو جێنشین لەسەر زەویدا کەئێمە تۆ بەپاك رادەگرین و ستایش و تەقدیسی تۆ دەکەین ، کەچی ئادەمیزاد سیفەت و حاڵی وەهایە بەدکاریەو فەسادی دەخاتە سەر رووی زەوییەوەو خوێنی تیا دەرێژێ و زوڵمی تیا دەکاو .. جاخودای دانا وەڵامیان دا فەرمووی من لەهەموو کەسێ زاناترم و وەئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن جا خوای گەورە ئادەمی فێرە مەعریفەت و زانیاری کرد هۆش و بیری پێداو فێرە ناوەکانی گشت بەدیهێنراوەکانی تری کرد، پاشان بەدیداری فریشتەکانی شاد کرد ، وەحاڵی کردن ئەگەر زۆرێك لەئادەمیزاد حاڵ و سیفەتی وایە خوێنڕێژی و فەسادی دەکات بەڵام زۆرێکیش هەن خوێن رێژی و فەسادی بنەبڕ دەکەن و شایەستەی رێزو حورمەتن ، ئاخەلق کردنیان لەگەڵ ماناو کارو سیفەتانی خودای دەگونجێ و جێگەی حیکمەت و داناییە وەکو سونەتی خوای گەورە وایە ( هەزار دانە زیوان بەهۆی دەنکە گەنمێکەوە ئاو دەخواتەوە ) .

جا پاش ئەوەی کەخودای دانا حەزرەتی ئادەمی شاد کرد بەدیداری فریشتەکان جا فەرمووی ئەی فریشتەکان ئەگەر ئێوە راست دەکەن بەوەی کەلایەق ترین بۆ جێنشینێتی لەسەر زەویدا فەرموون ئێوەو ئادەم لەمەعریفەت و هۆش و بیردا، فەرموون

ئێوە ناوی ئەو کەسانەمان پێڕاگەیەنن ، وادیـارە خـودای دانـا ئـەو هەسـت و نـست و زانیاریەی داویە بەئادەم نەیداوە بەفریشتەکان ، ئەو کاتە فریشتەکان باشتر حـاڵی بـوون لەوەی کەحەزرەتی ئـادەم لایـەقترە بەجێنـشینی بۆیـە بێـسێ و دوو ووتیـان ﴿قَـالُوا سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴾ البقرة : ٣٢ .

پـاکیو بێگـەردی دوور لەکـەم و کـوڕی شایەسـتەی تۆیـە ئـەی پـەروەردگار، بەڕاستی ئێمە هیچ عیلم و زانیاریـەکمان نیـیە ئـیللا ئەوەنـدە نـەبێ کـەخۆت فێـرت کردووین ،بەڕاستی و بێگومـان تۆ بەهەموو شتێ زانای لەهەموو کارێ دانای ، وەکـارت بێحیکمەت نیـیە جا فریشتەکان گیانانی پاك و بێگەردن ، نەفسی ئـەمارەو شـەیتانی لەعین کاریـان تێناکـات چـاویان غیـشاوە دای نەپۆشـیوە گوێیـان گرانیـو ثقلی تیـا نەکەوتووە، دڵیان رەق و رەش نیەو خەتمی لێنەدراوە ، فیترە پاك و گیـان پـاك و ووتـار پاك و راستن، وەلەناسینی خودای گـەورەو سـیفەتەکانی شـارەزان ئائەوەتـە شـاهێدی و گەواهی دەدەن لەسەر زانایێتی و دانایێتی خودای حەکیم و کارلەجێ .. ئا بەم ئیمانەوە رازین بەوەی خوا تەقدیری کـردووەو دەزانـن کـاری بێحیکمـەت ئـەنجام نـاداو سـیقەو متمانەیان بەخوای خۆیان هەیەو ئیعتیمادو تەوەککولیان لەسەریەتی ، هەروەها خـودای حەکیم و دانا لەسورەتی (ال عمران)دا لەئایەتی (١٨) دا دەفەرموێ :﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُوا الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ .

خودای حەکیم و دانا شـاهێدەو شـاهێدی داوە کـەخۆی تاکـە پەرسـتراوە هـیچ پەرستراوێ نیـیە بێجگە لەخۆی، وە فریشتەکان و خاوەن زانیاریەکان گەر بەدادپـەروەری بڕیاردەن ئەوانیش گشتیان شاهێدن و شاهێدیان داوە کەهیچ پەرستراوێ نیە تەنها زاتـی شکۆمەندی حەکیم و دانا نەبێت ، ئەی حەکیمی حەکیمان تاکە پەرستراوی جیهـان، تـۆ سەرچاوەی داناییانی تۆ بەگشت شتان دەزانی، کوانێ زانین کوا دانایی گـشت ئـی تۆیـە بەتێکڕایی، بکە رەحمەت بەمەی هەژار ئەتۆ زانای مە کۆڵەوار ..

## ٤٧ ـ الودود

ناوێکە لەناوە خۆشەویستەکانی خوای دانا ، ئەم ناوە (٢) جار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە ، بنچینەکەی (ودّ)ە واتە سۆزو خۆشەویستی .

الودود : واتە ئەم خوایە پەروەردگارێکە سۆزو خۆشەویستی زۆرە بەرامبەر بەمەخلوقەکان و دروست کراوەکانی بەتایبەتی بەندە دڵسۆزەکانی .. وەخۆیشی خۆشەویستە بۆیان و لەلایان، سۆزو خۆشەویستی خوایە نازو نیعمەتی ڕژاندوە بەسەر خواناساندا کەپەرەکانی دڵیانی پڕکردووە بەخۆشەویستی خودایی‌و، کارو کردەوەیان گشت بۆ ڕەزای ئەوەو هەموو کات هەست بەنزیکیەوە دەکەن و دەزانن خوای گەورە دۆست و یارمەتی دەریانە ، ئەمەش نیعمەتێکی زۆر گەورەیە بۆ بەندە پاك و بێگەردەکانی ، وەهەموو موڵك و سامانی دونیا شەرم دەکاو دەتوێتەوە لەبەر نرخی ئەم بەخششەو رووی نایێ نرخێکی کەمیش بۆ خۆی دابنێ لەئاستیا ..

خوای گەورە لەسەر زومانی حەزرەتی شوعەیب ڕووبەڕووی گەلەکەی دەفەرموێ : ﴿وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ هود : ٩٠ .

واتە داوای لێخۆش بوون و چاوپۆشی لەپەروەردگارتان بکەن و تۆبەو پەشیمانیتان بۆلای ئەو بێ، بەڕاستی پەروەردگارم میهرەبان و خۆشەویستە ، هەروەها دەفەرموێ : ﴿ إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ(١٣)وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ﴾ بروج : ١٣ ، ١٤ .

واتە : بێگومان ئەو خوایە خۆی نادەمیزادی بەدیهێناوەو هەر خۆشی جارێکیتر زیندووی ئەکاتەوەو ، لێخۆشبوو خۆشەویستیە .. خاوەن باوەڕان دەبێ بەم سیفەتە خۆیان برازێننەوە ، بەرامبەر بەیەك بەسۆزو خۆشەویستی بن ، بۆشاییەکانی دڵیان بەخۆشەویستی دوژمنانی خواو پێغەمبەر پڕنەکەنەوە خوای گەورە ئەم جۆرە کەسانە نەداتە بەر هێرش وەك دەفەرموێ : ﴿ لاَ تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ..﴾

المجادلة : ۲۲ .

واته بەدەستت ناكـەوێ و نابینێتـەوە گـەلێك ئیمانیـان بـەخواو رۆژی دوایـی هەبێت دڵ گۆڕكێ بكەن بەخۆشەویستی و دۆستایەتی لەگـەڵ ئەوانـەی دژایـەتی خـواو پێغەمبەر دەكەن ، جا ئەگەر بـاوو باپیرانیـان بـن یـا نـەوەو رۆڵـەكانیان بـن یـا بـراو دۆستەكانیان بن یا تیرەو عەشیرەتیان بن ..

خوای گەورە موژدەو مزگێنی دەداتە خاوەن باوەڕانی چاكەكار بـەوەی كـەدەیان خاتە ناو خۆشەویـستێتی خـودایی وەك دەفـەرموێ : ﴿ إِنَّ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمْ الرَّحْمَانُ وُدًّا ﴾ مريم : ٩٦ .

ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە كارچـاكیان ئـەنجام داوە ئـەوە خـودای میهرەبـان شكۆمەندی رەحمان دەیانخاتـە دونیـای خۆشەویـستی خوداییـەوە ، دونیـای بێـداری و هۆشـیاری ، ناسـۆی شـیرینی ئیمـانی رێـی ناسـودەیی و كامـەرانی تاكـە رێگـەیێ كەنادەمیزاد بەبەرزیو پیرۆزی بگەیەنێ ، تاكە عیشقێ كەمرۆڤ رازی كاو دڵشادی كات ، هەڵوێست و كارێ كەسـتی و پەشـیمانی بـەدوا نـەیێ ، تاكـە دەرگـایێ كەشـیرینی حەلاوەی ئیمانی زۆر تیا برژێ هەر دونیای خۆشەویستی خوداییە هەر دونیای عیـشقی رەحمانیـیە ، هەر دونیای ویست و سۆزی میهرەبانیـیە ، سوپاس و ستایشێكی بێپایـان بۆ زاتی وەدودی خۆشەویـستی جیهان و جیهانیان كەدەرگای خۆشەویستی لەبەینی خـۆی و بەندەكانی ئاوەڵاكرد ، كەرێگای پاكیو پیرۆزی و دڵسۆزی بەوەفایی خستە سەرپشت ، دوا رێچكەی خۆشەویـستی پێیانەوە بەند كرد ، هەر كەرەم و مەوەددەیی خوایە تیشكی داوەتەوە لەپەیوەست كردنی هاوجووتا بەیەكەوەو رەگی لەسـەر داكوتـاوە ، وەكـو زاتـی وەدود ئاشكرای كردووەو دەفەرموێ : ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًـا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم : ٢١ .

واتە لەنیشانەكان و بەڵگان و دەلیلانی خودای وەدودو میهرەبان و خۆشەویـستە

کەلە نەفس و گیان و رەگەزو جنسی خۆتانا هاوجووتی بۆتان خەلق کردووەو بەدیهێناوە کەمایەی ئۆقرەبوون و هۆگری و تەسکینی دڵ و ژیانتانە سەرەڕای ئەم نیعمەتانەش مەوەدەو سۆزو خۆشەویستی گێراوە لەبەینتانا لەگەڵ بەزەیی‌و رەحم و تەبایی‌یەوە ، ووردبونەوە لەم راستیانە بەڕاستی نیشانان و بەڵگان و دەلیلانی زۆری تیا هەن لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی بێ‌پایانی خودای بێ‌هاوتا لەسەر سۆزو خۆشەویستێتی خودای باڵادەست لەسەر بەزەیی و رەحمی خودای میهرەبان لەسەر سیفاتی بەرزی خوای جوان لەسەر وەدودی و سۆزی پەروەردگار ،بەڵام بۆ کێ ، بۆ کەسانێ بیر ووشك ؟ بۆ کەسانێ بێ‌فکر ؟ بۆ کەسانێ بێ‌هۆش و بیرتەسك ، نەخێر نەخێر بۆ کەسانێکە هۆشیارو بێدارن خاوەن هەست و هەستیارن ..

ئەوانەی سۆزو خۆشەویستێتی دەگرنە باوەش لەرێگەی عاتیفەو ئەهوائەوە لەرێگەی کوێرەواری و نەفامی‌یەوە بۆ بت و سەنەمەکانیانەوە ،بەزەنی نادروست و نالەجێیان گێڕاویانە بەمایەی خزمایەتی و دۆستایەتی سۆزو تەبایی‌یەوە پێی بەختەوەرنابن ، لەرۆژی دواییشدا گشتی بەپێچەوانەوە هەڵدەگەڕێتەوە ، وەکو خودای باڵادەست و شکۆمەند بۆمانی روون کردۆتەوەو دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُمْ بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُمْ بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ نَاصِرِينَ ﴾ العنكبوت :٢٥ .

خوای گەورە روون کردنەوەکەی حەزرەتی ئیبراهیم (علي نبينا وعليە الصلاة والسلام) بۆ گەلەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە ، ئەو حەزرەتی ئیبراهیمەی پێشەوای خۆناسان و دۆست وخەلیلی خودای میهرەبان شارەزاو زانا بەهەڵوێستانی نالەبارو نادروست و نارێك، رووەو قەوم و گەلەکەی فەرموویەتی : ئێوە بێجگە لەخودا بت و سەنەمانتان گرتووە بەمایەی مەوەدەو سۆزو خۆشەویستی‌یەوە لەبەینی خۆتانا لەژیانی دونیاییتان وەکردوتانە بەمایەی تەبایی‌و یاری کاری و دەورە لێك دانەوە ، پاشانیش لەرۆژانی مەحشەرو قیامەتدا بێ‌باوەڕ دەبنەوە هەندێکتان بەهەندێکی‌ترتان ، یەکتر بە نەفرەت و

لەعنەت دەکەن وەسەرەنجام مەئواو چارەنوسیشتان جەهەندەمەو ئـاگرە ، کەسێکیـشتان بۆی نیەیەو نابێ سەرتان خاو نەجاتتان بدات .

ئەوەی فیترەو عـەقڵ و سروشـتی خـۆی فاسـید بکـات بـەوەی دەرگـای سـۆزو مەحەببەت لەگەڵ خودا دا بخات و لەگەڵ غەیری خوادا بکاتەوە ئەوە حەزرەتی ئیـبراهیم (علیه السلام) لەپێشیندا رونی کردۆتەوە چارەنووسی چۆنەو چۆن دەبێ .

هـەروەها خـودای بالآدەسـت و شـکۆمەند لەسـورەتی (الممتحنـة)دا لەئایـەتی یەکەمدا دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُـونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ ﴾ .

ئەی کەسانێ کەئیمانتان هێنـاوە دوژمنـی مـن و خۆتـان مـەگرن بەدۆسـتان و لایەنگران، دەرگای سۆزو خۆشەویستیو مەوەددەت لەگـەڵیانا مەکەنـەوە مـادام ئـەوان بێباوەڕبوینە بەو حەق و بەرنامەیەی لەلای خودای گەورە بۆتان هاتووە ، چـونکە خـودا وەدودە خودا شایەستەی ئەوەیە دەرگای مەحەببەت و سۆزی ئـەو بخەیتـە سـەر پـشت ، ئێمەی ئیمانداریش پێویستە لەئاست یەکا بەم سیفەتەوە رووەو یەك ببینەوە لەگەڵ یەکا خاوەن سۆزو خۆشەویستی بین دژی دژایەتی و ناکۆکی و ناتەبایی بین..

جا ڕوو لەخودای وەدودو خۆشەویست دەکەین و دەڵێین :

ئەی زاتی پاکی وەدوود، تۆی خۆشەویستی بەسـوود، رووم کـە دەرگـای سـۆزی پڕنور، تۆی شکۆمەندی شەکوور، لەرەحم و سۆزت مەمکـە دوور، تـۆی رەشـیدی هـەم صەبور، بێ سۆزی تۆ ژین ژەهرە، دوری لەتۆ هەر قەهرە، بەدبەختـە ئـەو کەسـەی بـێ سۆزە لەسۆزی تۆوە بێڕزق و رۆزە، فریامان کەوە زاتی بەخشندە، دڵ و دەروونمان بەخۆت کە بەندە.

## ٤٨ ـ المجيد

ناوێکە لە ناوە بەرزەکانی خوای خۆشەویست ,ئـەم نـاوە (٤) جـار لـە قورئانـا هاتووە تەنها دوو جار مەبەست سیفەتی خوای میهرەبانە , بنچینەی ئەم ناوە -مجد-ەواتە بەرزیو بڵندی .

المجید:-واتە ئەم خوایە میهرەبانە لەو پەری بڵندیو بەرزی وپایـە داری دایـە ,هـەروەها خوای گەورە بەرزی دەبەخشێ بە هەر کەسێ کە بیەوێ جا لە پلەو پایە بێ یا لە زانست و زانیاری بێ یا ماڵ و دارایی بێ یا دەسەڵات و هێز بێ...

ئەم هەموو بوونەوەرە کەمێ لە بەرزیو پایە دارێتی خوای گەورەی لـە بـاوەش گرتـووە ,کە هەموو زانایان و هۆشیاران و بیر تیژان لە ئاستی یـەوە سەرسـام ودەسـتە وەسـتانن ...وە لە کاتێکا کە فریشتەکان موژدە بە سارا خـاتوونی خێزانـی حـەزرەتی ئیـبراهیم دەدەن (کە نەزۆك و بە ساڵا چوو بووە ) , بە بوونی حەزرەتی ئیسحاق، ئەویش سەرسـام دەبێ و دەڵێ : مـن پـیرە ژنێکـی نـەزۆکم و مێردەکـەم پـیرە , ئـەوانیش لـە وەڵامیـا دەفـەرمون ﴿ قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ رَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْـتِ إِنَّـهُ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ﴾ هود: ٧٣ . واتە :- ووتیان سەرسامی لە کارو فەرمانی خوا دەکـەی , بە ڕاستی خوا ستایش بۆ کـراو و پایـە دارو بـەرزو باڵایـە ...وەك دەفـەرموێ:- ﴿ ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيـدِ ﴾ ق .واتـە -قـاف وە قەسـەم بـە قورئـانی پایـە دار , هـەروەها دەفەرموێ:- ﴿ بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ (٢١) فِي لَوْحٍ مَحْفُـوظٍ ﴾ الـبروج :٢١ , واتـە- ئەوەی فرستادە دەخوێنیتەوە دوورە لە هەموو کەم و کورییەك بەڵکو ئەوە قورئانی پایـە بەرزە لە تەختی پارێزراوە، لەگەڵ عەرش و تەختی و عەزەمەت وپایە داری خۆیـدا ئـەو ناوە دەفەرموێ ﴿ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ ﴾ البروج :١٥ . واتە ئەم خوایـە خـاوەن عەرشـە پایەی بەرزەو مەجیدە , وە لەسەر خاوەن باوەڕانە کە پڕ بە دڵ وبـە گیـان دان بنـێن بـە پایە دارێتیو شکۆی ئەم میهرەبانە تاك و تەنیایە ... زاتی خواوەندی مەجید بـەرزیو بڵندی و پایە داری تەنها لەدەست خۆیەتی، تەنها لە دەست تاکی پاکی بـێ هاوتایـە وە

به خواستی پڕ حیکمەت و دانـایی بیـدات بـە کـویێ دەیـدات وە لـە کـویێ بـسێنێتەوە دەیسێنێتەوە وە نەیدا بە کویێ نایدا وە کەسێ نیە یـا بـۆی نیـە موحاسـەبەی بکـات , چونکە زاتی مەجید وەك و بەرزو بڵندە داد پەروەرو زاناشە وەك و حەکیم و داناشە , وە دوورە لە هەموو کەم و کوڕییێ، زاتی مەجید پایە بەرزی باڵا دەستی بـێ وێنـە , کـارو سیفەت وسونەتی وایە بەندە چاکەکان و خوا پەرستەکان سەر بەرزو پایە دار دەکات چ لە دونیادا وە چ لە ڕۆژی دواییدا ....بەڵام ئادەمیزادی لە خوا بێ ئاگاو سـتەمکار نـزم و ریسوا دەکا لە دونیاو قیامەتدا وە ئەگەر لە دونیا بۆ مـاوەیێ بـە ڕوالـەت دەسـەڵات و ماڵی پێ بدات ئەوە لە قیامەتدا زیاتر لە نزمایی ڕیسوایی دەی باتە خـوارەوە ئەمـەش حیکمەت ودانایی خوادیی زانا دەور تێیدا دەبینی ... زاتی مەجید شـکۆمەندی بـەرزو پاك لە بارەی سەر خستنی و بەرز کردنەوەی خاوەن باوەڕانی چاکەکار دەفەرمویێ ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْـتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْـدِ خَـوْفِهِمْ أَمْنًا...الخ ﴾ النور :٥٥ . واتـە خـودای بـاڵا دەسـت وادەی داوە بـە خـاوەن بـاوەڕانی ئیمانداری چاکەکار لە ئێوە وە سەریان بخاو عیززەت و بـەرزیان پـێ ببەخـشێ و توانـاو دەسەڵاتیان پێ بداو شوێن پێیان بۆ بکاتەوە, وەکو سونەتی لە مێژوو هەروا بـووە، خـوا پەرستانی چاکە کاری سەر خستووە دەسەڵات و بەرزی پێ بەخشیون.. وە ئاینە کەیانیان بۆ جێگیر دەکات ئەو دین و ئاینەی کە مایەی ڕازی بوون و بەرزیو پیرۆزیانە باری ترس و نائەمینیان بگۆڕێتەوە بەئەمن و ئاسایش و دڵنیایی ..لەم ئایەتـەدا دەردەکـەویێ کـە ئیمانی ڕاست و دروست لەگەل کارو کردەوەی چاك مایەی سەرکەوتن و بـەرزیو پـیرۆزی یە ,وەکو مایەی دەسەڵات و ڕەزامەندی خودای مەجیدی تاك و پاکە — هـەروەها زاتـی مەجید پەروەردگاری باڵا دەست لە بارەی لە خوا بێ ئاگایانـەوە دەفـەرموێ:-﴿ وَمَـنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى(١٢٤)قَـالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا(١٢٥) قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ

الْيَوْمَ تُنسَى ﴾ طه: ١٢٦ . واته-ئەوەی پشت بکا له کیتاب و بەرنامەو یادی مـن بـێ گومان دەبێته خاوەن ژیانێکی نارەحەت و سەخەلەت و تەنگە لانە , پێیەوە سووك و نزم و ریـسوا دەبـێ و , وە لـە رۆژی قیامەتیـشدا بـە کـوێرەیی حەشـری دەکـرێ دەڵێ پەروەردگارم لەبەر چی وابە کۆرەیی حەشرم دەکەی کەچی کاتی خـۆی مـن خـاوەن چـاو بووم؟! پەروەردگاری مـەجید پێی دەڵێ ئایات و نیشانەکانی ئێمەت بۆ هات فەرامۆشت کردو پشت گوێت خست، ئا ئاواش ئەمرۆ فەرامۆش دەکرێی‌و شایانی ڕەحم پـێ کـردن نائیت و دەبێ کۆرە بیت .. وەکو قورئان شاهێدە کە زاتی پەروەردگار مـەجیدە , فیطرەو سروشتی ئادەمیزادیش هەمان شاهێدی دەدات لـە کاتێکـا تەنگـە تـاوێ و ڕووی تـێ دەکات بێ هیوا دەبێ له دەورو بەری مادیاتی کە بە هانای بێ، یەکسەر ڕوەو خـالیقی بالاّ دەستی دەبێتەوە هەستی پێ دەکاو دەیسەلمێنێ کەوا خالیقە کەی بالاّ دستە خـاوەن هەموو دەسەلاّتێکە بەرزو شکۆمەندە بەرزیو پیرۆزی هەر لە دەست خۆیەتیو هەر هێزو ئیرادەی ئەوە ئەو کەونە دەگێڕێو خاوەن هەموو دەسەلاّتێکە تـاك و پـاك بـەرزو بلنـدو ئاگادارو زانایە -مەجیدو ماجیدو واجیدە -..

هەروەها ئەم کەون و بوونەوەرە بە ئێـستاو ڕابـردووی و مێـژوو شـاهێدیان داوەو شاهێدن لەسەر بەرزیو بلندی پەروەردگار، لە چەندین فەرمـوودە هاتووە صلوات لێ دان لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە چەند جار تەئکیدی لەسەر کراوە چەند بارە بۆتـەوە داوا کراوە لە موسوڵمانان کە لە (التحیات)دا بخوێندرێ کە کۆتاییەکـەی دێ بـە ( انـك حمید مجیـد ) واتە پەروەردگارە بە ڕاستی تۆ ستایش بۆ کراو بەرزو بلندی, ئەمەش لەلای هەموو موسوڵمانان ڕوون و ئاشکرایە , ئەم صلاواتەش کەبەباشترین صەڵەوات هـاتووە ، کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمەوێ : اللهم صل علی محمد وعلی ال محمد کمـا صـلیت علـی ابراهیم وال ابراهیم انك حمید مجید.. اللهم بارك علی محمد وعلی ال محمد کما بارکت علی ال ابراهیم انك حمید مجید ) متفق علیه ئیمامی موسلم و بوخاری ریوایەتیان کردووە - تەنها لەم فەرمودەیەدا دوو جار ناوی (انك حمید مجید) هاتووە — وە گەلێ فەرمودەی تر

هاتووه بۆ صەلەوات لێدان صیفاتی جیا جیا کە کۆتاییـان پـێ هـاتووه بـە انـك حمیـد مجید...لە کاتی صلوات لێ داناو لە تەحیاتی نوێژا ڕۆژانە چـەند جـاره ئـەم سـیفەتەی زاتی مەجید چەندباره دەکەینەوه تاك و ئادەمیزاده خـاوەن باوەڕەکـان بـە هەمیـشەیی بەرزی بڵندییتی خوای باڵا دەست فەرامۆش نەکەن ،وه دەسەڵات و بۆره پیاوانی شەیتان سیفەتان، چۆکیان پێ شل نەکاو وورەیان نەروخێنێ ئەژنۆیان نەشکێنێ ، هەردەم بیریـان خاتەوه خودای باڵا دەست لە هەموو بەرزان بـەرز تـره وەلـە هـەموو بڵنـدان بڵنـد تـره عـاقیبەت و چارەنوس و سەرەنجام هەر بۆ لای ئەوەو هەر لە دەسـت ئـەوه کـە حەمیـدو مەجیده – سبحانه وتعالی -...

## ٤٩ - الباعث

ناوێكە لە ناوە جوانەكانی خوای پایەدار بنچینەكەی - بعث-ە واتە بەرپا كردن وناردن و بوژاندنەوە ...الباعث-واتە ئەم خوایە پەروەردگارێكی زیندوو كەرەوەیە بۆ هەر شتێ و هەر كەسێ لە نەبوونەوە بۆ بوون , یا بە مانایەكی تر واتە خوای گەورە زیندوو كەرەوەی گیان لەبەرە كانە پاش ئەوەی لاشەیان رزیوو ووردو خاش بوو لەمانەش بەتایبەتی ئادەمیزاد و جنەكان ...هەروەها واتە خوای گەورە نێنەری خۆشی و كامەرانیە یا نێنەری نەخۆشی و دەردو بەلایە یا زانست و زانیاری یە یا پێغەمبەران و پایە دارانە ,یا زیندو كەرەوەی ئیمان و باوەڕە لە دڵە رەش و مردووە كانا , ئەمانەش هەمووی بە پێی خواست و ئیرادەی خۆی كە زانایی و دانایی و دەسەلاتی , فەرمان رەوایە، وەك دەفەرموێ :- [ كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ...] البقرة (٢١٣) واتە- مەردووم لە سەرەتاوە یەك كۆمەڵ و نەتەوە بووە , خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ ناردوون بە موژدەدەرو ترسێنەر .هەروەها دەفەرموێ :- ﴿ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ ...﴾ ال عمران :١٦٤ ، واتە-بێ گومان خوای گەورە منەتی هاوێشتۆتە سەر ئیمانداران بەوەی بۆیانی رەوان كردووە فرستادەیێ لە نەفس و رەگەزی خۆیانا ...هەروەها دەفەرموێ :- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنْ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ...﴾ نحل :٣٦ ، واتە بەراستی ناردمان بۆ هەموو نەتەوەیێ فرستادەیێ كە بەندایەتی خوا بكەن ودوور بكەونەوە لە هەرچی شەیتانە كان و هاوەڵەكانیانە ...هەروەها دەفەرموێ:- ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمْ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا ...﴾ واتە- رۆژێ خوا گشتان – ئادەمیزادەكان و جنەكان – زیندوو دەكاتەوە وە هەواڵی كردەوەكانیان پێ دەداتەوە ...ئادەمیزادە لە خوا بێ ئاگایەكان رۆژێ كە زیندو دەكرێنەوە وە بە سەرسامی یەوە دەڵێن هاوار بۆ خۆمان كێ ئەمەی زیندوو كردەوە لە گۆرەكانمان , جا هەندێكیان وەبیریان دێتەوە و دەڵێن ئەمە بەڵێنەكەی خواو پێغەمبەران بوو هەروەها هەندێكی تریشیان فریشتەكان ئەم وەلامەیان

دەدەنەوە ,وەك خوای گەورە ئەم ڕاستیەمان تێ دەگەیەنێ و دەفەرموێ ...﴿ قَالُوا يَاوَيْلَنَا مَنْ بَعَثَنَا مِنْ مَرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَانُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ ﴾ یس :٥٢ ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:- ﴿ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ لَنْ يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ التغابن :٧ ، بێ باوەڕان گومانیان وا برد كە هەرگیز زیندوو ناكرێنەوە پێیان بلێ قەسەم بە پەروەردگارم زیندوو دەكرێنەوە پاشان هەواڵی كردەوەكانتان پێ دەدرێتەوە , ئەمەش لەلای خوای گەورە زۆر ساكارو ئاسانە ,- هەموو ساڵێ شینایی‌و دارو بارەكان هەر یەكەیان لە شوێن خۆیا شاهێدی‌و گەواهی چەند بارە دەكەنەوە لەم سیفەتەی پەروەردگاریانا كە بوژاندنەوەو باعثی بێ گیان و مردووەكانە، ئیرادەو دەسەڵات و تواناو قودرەتی خۆیەتی، لە بوژانەوەو هێنانا كایەوەو بەرپا كاری هەموو قەوم و نەتەوەیێ، هەموو خانەو زەرەرێ، هەموو بینەو بەردەیێ، هەموو پلەو وپایەیێ، هەموو كارو پیشەیێ، گشت نیعمەت و نیگبەتێ .بە كورتی‌و بە كوردی هەر خۆی تەنها باعث و هێنانە كایەوەو بەرپا كاری هەموو شتێكە .ئەگەر بە ڕواڵەت هەندێ بەرپا كردن و بوژاندنەوە بە دەستی مەخلوق بەرپا دەبێ , ئەوە لەناو بازنەی ئیرادەو قودرەتی خودای گەورە دایەو لێی دەرناچێ هەر حیكمەت و دانایی خودای حەكیمە تێی دا دەور دەبینێ , هەر سونەنانی خودای شكۆمەندە حوكم دەكاو بەسەر هەموو كەون و بونەوەرا جاری دەبێ وەك و قورئان و كتابی كەون ومێژوو فیطرە و سروشتی ئادەمیزادو هەرگشتیان پرشنگ و تیشكی باعیثیتی بوژاندنەوەو هێنانە كایەوەو بەرپا كردنی تیا ڕەونەق دارە، لە كارو سیفەتی ئەم پەروەردگارە، ئاواش ئاماژە دەكات و نیشان دەدات و دەری دەخات و ڕونی دەكاتەوە ﴿ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ ﴾ الحج : ٧ ، بێ گومان رۆژی دوایی هاتووەو وا لە رێگایەو شك و گومانی تیا نیە، خوای گەورە قیامەت بەرپا دەكاو دەی هێنێتە كایەوەو حەق تێیدا حوكم دەكاو هەموو كەسێ مافی خۆی چەنگ دەكەوێتەوە ..ئەوگۆڕستانە جێگەی هەمیشە مانەوە نیەو خوای گەورە زیندویان دەكاتەوەو موحاسەبەیان دەكات لە سەر بیرو باوەڕو كارو كردەوەیانەوە- ئەمەش لای خوای گەورە

ئاسانە وەك دەفـەرموێ :- ﴿ مَا خَلْقُكُمْ وَلاَ بَعْثُكُمْ إِلاَّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَـمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ لقمان : ٢٨ واتە خەلق کردنتان و زیندوو کردنەوەتان لای خوای گـەورە ئاسـانە وەك و نەفسێ وایە کە خودای بالاّ دەست خەلقی بکات و زیندووی بکاتەوە، بـە ڕاسـتی خوای گەورە بیسە رو بینایە - هەروەها خوای گەورە لە سورەتی حەج دا روەو کەسـانێ کەشك و گومانی هەیە لە زیندو بونەوە لە ئایەتی (٥) دادەفـەرموێ ﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِنْ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُـمَّ مِـنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُـمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلاَ يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَـاءَ اهْتَـزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ﴾..واتە : ئەی کۆمـەلاّنی خـەلك و مـردووم ئەگـەر ئێوەوان لە گومان و شك و دوو دلّیدا لە زیندو بونەوەتان هاتنی ڕۆژی قیامـەت , ئـەوە خۆمان بەدیمان هێناون لە گلّ و پاشانیش لـەئاوی مـەنی پاشـانیش لـە پارچـە خـوێنێ پاشانیش لە پارچەیێ گۆشت جا بازێکی تەواو ڕەسایە ئەو منالّە لەو دروست دەبـێ, وە بازێکی ناتەواو ناڕەسایەو مندالّە کەیش ناتەواوە , تاك وحالّی بن و تێ بگەن ئەو خوایە دەتوانێ گل بکا بە ئاوو ئاو بکا بە خوێن و خوێن بکا بە گۆشت لـەو گۆشـتە دەمـار و ئێسقان ئەندامانی جیا جیا دروست بکات , وە ئەشتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە ..

ئەوسا رای دەگرین و دەیهێلینەوە لەناو مندالّدانی ئافرەتـا تـا دەگاتـە ئـەو وادە دیاری کراوە بۆ دەرچوونی , پاشان دەری دەکـەین بـە منـدالّێتی بـۆ ئـەوەی بگـەن بـە ڕەسایی هێزو تواناکانی خۆتان , جا لە ئێوە ئەوەی دەمرێ و ئەوەی دەگات بـە عـومری پیری و کە نەفتی وای لێ دێ زین و زاکیرەی هور ببێ هیچ نەزانێ زانیاری بیر چوویێتەوە — لە لایەکی تریشەوە زەوی دەبینی بە مردوویەو بە ووشـکی جـا کـاتێ ئـاوی بارانمـان داپەراند بە سەریان دەجولێتەوەو بای تیا دەچێو بەرز دەبێتەوە دەروێنی لە هەموو جۆرە گیایەکی جوان و کارامەو ڕەنگاو ڕەنگ، ئەو جۆرەها دانەوێلّەی سالاّنە بە وشـکیو بـێ گیانی دەخرێنە ژێر خاکـەوە بـە ئومێـدی چـاندن و شـین بوونـەوە , گـشتیان دیـاردەی

باعیشیتی پەروەردگارن ڕوانگەی بوژێنەرەوەو زیندو کەرەوەی دەستی لە بن نـە هـاتووی خوای میهرەبانن..

هەندێ کەسانێ تووشی سەر لێ شێواوی هاتوون و بێ باوەر بوونە بە ڕۆژی زیندو بوونەوە لە ئەنجامی هەڵوێستانی نا لە بارو نارێك و ناتەواوەوە بـۆ نمونـە کەسـانێ هـەن زیندو بونەوەو بەرپا کردنی ڕۆژانێ قیامەت لە ڕوانگەی تواناو دەسەڵاتی خۆیان دەروانن یا کەسانێ وەك و خۆیـان , جـا کـە بـیری لێ دەکەنـەوەو تێـی دەگـەن لـە ئیمکـان و دەسەڵاتی وان شتێکی مەحالە , جا لایان وایە کارەکە بەوان سپێردراوە یا بـە کەسـانێ وەکو خۆیان بۆیە لە ئەنجامی ئەم بیر کردنەوەیـە نـا لەجێیـە سـەریان لـە بـێ بـاوەڕی دەردەچێ ...لەبیریان چۆتەوەو لێی حالی نەبوونە کـە خـودای گـەورە خـۆی باعـث و زیندوو کەرەو بوژێنەرەوەی ئادەمیزادەکانە .. ئەو زاتـەی ئـەم کـەون و بونـەوەرەی پـێ خەلق بکرێ و پێی بهێنتە کایەوە , ئەو زاتەی ئەم هەم و مەجـەڕەو کەشکەشـانەی بـەو هەموو یاساو جوان و قەشەنگانە دابمەزرێنێ و بەرێوەیان ببات , ئەو زاتەی ئەم هـەموو جۆرەها مەخلوقی لەسەر زەوی بەدیبهێنێ بەرێوەیان ببات , ئەو زاتەی کە هەموو ساڵێ ئەو هەموو جۆرەهایە لە دارو بارو شـینایی‌یەکان زینـدو بکاتـەوەو سـەرلە نـوێ بیـان بوژێنتەوە توانا دارەو لای ئاسان و زۆر سـاکارە جـارێکی تـریش ئادەمیزادەکـان زینـدو بکاتەوە هەواڵی کارو کردەوەیان پێ بداتەوە و لەسەریا موحاسەبەیان بکات ...خـودای باڵا دەست و شکۆمەندو ئازیز لە کیتابـە پیرۆزەکەیـدا شـاهێدە لەسـەر ئـەم سـیفەتەی خۆیو وە بۆمانی ڕوون کردۆتـەوە , هـەروەها مـەخلوق و بـەدیهێنراوەکانی لـە مێـژوو ئێستادا هەمان شاهێدی دەدات , وە فیطرەو سروشتی ئادەمیزاد بەم بـاوەڕە ئاسـوودەو بەختەوەرە , وە عەقل و ژیری دانی پیا ئەنێ و گەواهی لەسەر دەداو , هەروەها لە نەقل و گواستنەوەو ووتارە شیرینەکانی پێغەمبەران ( علیهم الصلاة والسلام ) دا هاتووە کـە زاتی پەروەردگار باعیشـە و زیندو کەرەوەی مردووانە و بە ئەنجامی کـارو کـردەوەو بـیرو باوەری خۆیان دەگەیەنێ ..ئەگەر سەیرێکی ووردی کتابە پیرۆزەکەی خودای میهرەبـان و باڵا دەست بکەین بە تایبەتی لە بارەی باعثیتی خودای کردگارەوە، وە بـۆ ئـەو هـەموو

ئایەتانە بڕوانین کە ووشەی ( بعث )و موشتەققەکانی تیا هاتوون , بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە زاتی شکۆمەند تەنها باعثیکە و بوژێنەرێکە , هەر دەسەلآت و ئیرادەی خۆیەتی ئەم هەموو کەون و بونەوەرەی بە گشت مەخلوقاتەوە بوژاندۆتەوەو خەلقی کردووە هێناوێتیە کایەوە , هەر دەسەلآت و ئیرادەی خۆیەتی پێغەمبەرانی (علیهم صلاة والسلام ) ڕەوانی کردووەو بوژاندویتەوە واتە وەکو بوژێنەرەوەی ماددیانـە هـەر خۆشـیەتی بوژێنـەرەوەی مەعنەویاتە هەر دەسەلآت و ئیرادەی خۆیەتی هەموو ئان و کـات و زەمـان و مـەکانێ دەبوژێنیتەوەو بەرپای دەکاو دەی هێنیتە کایەوە ......

## -٥٧ـ الشهيد-

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای ژێنەرەوە, بنچینەی ئەم ناوە –شهادة- یە واتە شایەدیو گەواهی دان...

الشهید-واتە ئەم خوایە پەروەردگارێکی زانایە بە هەموو شتێك و شایەدە لە سەر هەموو شتێ , وە هیچ شتێکی لێ وون نابێ لە ئاسمان و زەوی دا , گەورەییو بچووکی , یا تاریکیو ڕووناکی و دیاریو نا دیاری ڕێ لەم سیفەتەی خوا ناگرێت و بەسەر بە دیهێنراوەکانیەوە , زانیاری و ئاگاداری تەواوی هەیە بەسەر دروست کراوانیدا وەك دەفەرموێ :- ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴾ النساء (٣٣) واتە بێ گومان خوای گەورە بەسەر هەموو شتێ زاناو ئاگادارو شاهێدە، هەروەها خوای گەورە هەر خۆی فریشتەکان و زاناکانی کردووە بە شاهێد لەسەر تاك و تەنیایی خۆی وەك دەفەرموێ :- ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُوا الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ﴾ ال عمران :١٨ واتە- خوای گەورە شاهێدی داوە کە هیچ پەرستراوێ نیە تەنها زاتی ئەو نەبێ هەروەها فریشتەکان و زانایەکانیش گەر هەڵسن بە داد پەروەری هەروەها خوای گەورە پێغەمبەری ناردووە بەسەر ئومەتەکەیەوە بە شایەدو مزگێنی دەرو ترسێنەر وەك دەفەرموێ :- ﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾ الفتح (٨) واتە- ئەی پێغەمبەری خۆشەویست و سالار (ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوان کردووە و ناردووە بە شاهێد و مژدەدەرو بێدار کەرەو ترسێنەر، هەروەها خوای گەورە ئیمان دارانی کردووە بە شایەد بە سەر نەتەوەکان "بەهۆی ئەو زانیاری‌یەی کە لە خوایەوە پێیان دراوە "وەگێڕاویانی بە نەتەوەیەکی مام ناوەندی , وە فرستادەکەی کردووە بە شایەد بەسەریانەوە، وەکو خوای گەورە ڕوو لەئیمانداران دەکاو دەفەرموێ :-﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ البقرة (١٤٣) واتە ناوەها ئێوەمان گێڕاوە بە کۆمەڵ و نەتەوەیەکی میانە ڕەو بۆ ئەوەی ببن بە شاهێد لەسەر خەلکان، وە پێغەمبەریش (ﷺ) ببێ بە شاهێد لەسەر ئێوە..

هەروەها خوای گەورە دەست و زمان و قاچەکانی ئەو کەسانەی کە سەرپێچی دەکەن بە کارە ناڕەواکانیان کردەوە بە شایەد بەسەریانەوە , لەسەر ئەو کارانەی ئەنجامیان داوە وەك دەفەرموێ :- ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ النور (٢٤) واتە- ڕۆژێ کافران و بێ باوەڕان و زاڵمان ئینکاری کارە ناڕەوەکانیان دەکەن لە ڕۆژانی قیامەتا , لایان وایە وەکو دونیاو زۆرێك لە کارو کردەوەیان بەدرۆ دەچێتە سەر , جالەو ڕۆژەدا خوای بالا دەست وا یان لێ دەکا زمان و دەست و قاچیان شاهێدیان لەسەر بدات..

لەسەر ئیماندارانە بە پیر ڕاستیەوە بچن وشایەدی لەسەر بدەن , بە تایبەتی شایەدی دان لەسەر ڕێگەی خوای گەورە بە ماڵ و بە گیان , یا بە مانایەکی تر خۆی بکاتە شاهێدی هەمیشەیی لە دونیاو لە قیامەتدا , بە گیان بەخشینی لە ڕێگەی خوای میهرەبان , کە گەورەترین شایەدی دانە لەسەر ئەم ڕێگەیە , ئەو کاتە دەبێت بە شاهید وە بێجگە لە خوا کەسێ نازانێ پلەو پایەی چەند بەرزو گەورەیە , پێغەمبەری خۆشەویست - ﷺ- بەرامبەر بە شاهیدای ئیمانداران , ڕوو لە برایانی جەنگاوەری شەڕی ئوحد دەکا و دەفەرموێ :- (عن ابن عباس – رضي الله عنه – قال – قال رسول الله –صلى الله عليه وسلم –لما اصيب اخوانكم باحد جعل الله ارواحهم في جوف طير خضر ترد انهار الجنة تأكل من ثمارها وتأوي الى قناديل من ذهب معلقة في ظل العرش , فلما وجدوا طيب مأكلهم ومشربهم ومقيلهم قالوا : من يبلغ عنا اخواننا انا احيا في الجنة نرزق لئلا يزهدوا في الجهاد ولا يتكلوا عند الحرب ؟! فقال سبحانه , انا ابلغهم عنكم فانزل الله [ وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ(١٦٩)فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ] رواه ابو داود باسند صحيح ...

واتە:- کاتێ براکانتان لە ڕووداوی ئوحدا تووش بوون و شەهید کران خوای گەورە گیان و ڕوحەکانیان خستە ناو لەشێ لە وێنەی باڵندەی سەوزدا , هاتن بۆ سەر جۆ باری بەهەشت و لە میوەی بەهەشتیان دەخواردو دەگەڕانەوە بۆ چەند تەپۆلکەیەکی زێرینی

هەڵواسراو بە عەرشا , جا کاتێ ئەم خواردن و خواردنەوەو شوێنە جوانە بەرزەیان دەست کەوت ووتیان : ئەبێ کێ هەبێ ئەم بەسەر هاتەی ئێمە بگەیەنێ بە براکانمان لە دونیــادا وەهەواڵیان پێ بدا کە ئێمــە زینــدوین و رزق و رۆزیمــان پــێ دەدرێ لــەم شــوێنە بــەرزو پیرۆزەدا، وە با بزانن بۆ ئەوەی واز لە جیهادو تێکۆشان نەهێنن و بــێ دەنــگ نــەبن لــە جەنگ کردن ؟! خوای گەورە فەرمووی من ئاگاداریان دەکەم و جا ئەم ئایەتانەی ڕەوانەی خوارەوە کرد کە تێــی دا دەفــەرموێ :-" گومــان مەبــەن و واحــسێب مەکــەن ئــەوان کەسانەی کە لە ڕێگەی خوا کوژراون و مردوون , ئیتر مردن و فەوتان و نەمان ؟ نــەخێر بەلکو زیندوون و لەلای خوای پەروەردگاریانا رزق و ڕۆزیان پــێ دەدرێ ,وە شــادومان و دڵ خۆشن بەوەی کە خوا بەفەزڵی خۆی پێیانی داوە , وە بەشارەت و موژدە بەو کەسانە دەدەن کەهێشتا نەگەیشتوون پێیان و هەروا لەدواوە بەڕێگەوەن،و ئەوانەی ژیانیان لەسەر بەرنامەی خوای شەهید و ئاگار دەڕازێننەوەو، ڕۆژان و شەوی لە سەر بــەڕێ دەکــەن لــە مانای ژیانی خۆیانە دەی سەلمێنن شاهێدن لە سەر ڕاستە شــەقامی خــودای، کــە تاکــە بەرنامەیەکە ژیانی شەق دەکاو بەرێی دەکا، لەسەرە نجامیشدا گیانی خۆشیان دەبەخشن هەر بۆ ئەم شاهێدیەیە، ئەمانە ناسناوێکی خودای شەهیدە بۆ خۆیان دەقۆزنەوەو دەگەن بە پلەی لای خوداو خاوەنی نوورو پاداشی خۆیان دەبن، وەك زاتی شــەهید لــە ســورەتی (الحديد) دەفــەرموێ ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَاءُ عِنْدَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِــيمِ ﴾ الحديد :١٩ واتە- ئەوانەی ئیمانیان هێناوە خاوەن ئیمانن بە زاتی (الله ) خودای پاك و تاك هەروەها بە پێغەمبەرانی ئەو زاتــە گەورەیــە , ئەوانــە لەســەر ریگــەی ڕاســت و دروستن و ڕاستی و حەقیان پێکاوە , وە ئەوانەی شەهیدو شاهێدن لەسەر ئەم ڕێگەیە بــە گوفتارو بەکردار، لای پەروەردگاری خۆیانن خاوەن ئەجرو پاداشی خۆیــانن , یــا ئــەجرو پاداشی خۆیانیان پێ دەدرێ و لەگــەل نــوورو رەحمــەت و بــەهرەیی خودایــە، بــەلام ئــەو کەسانەی کەبێ باوەڕو کافر بوینە ژیانیان نــە نەخــشاندووە لەســەر یاســاو بەرنامــەی خودا، ئایات و نیشانان و بەڵگانی ڕێگەی خودایان بــەدرۆ زانیــوە، ئەوانــەن هــاوەڵانی

ئاگری جەهەندەم و دۆزەخ، وەکو کیتابە پیرۆزەکەی خودای شکۆمەند شاهێدە لە سەر شاهێدێتی خودای گەورەو شەهید، ئاوەهاش کیتابە کەونەکەی خوای باڵا دەست ڕوانگەی دیاردەکانی شاهێدن لە سەر ئەم سیفەتەی زاتی شەهید , هەروەها سروشت و فیطرەی ئادەمیزادیش شاهێدە لەسەر شاهێدیتی خواوەندی هەمیشە زیندوو ، بەد بەختە ئەو کەسەی نەزانێ و خوا ئاگادارە ، هەم شەهیدە هەم شاهێدە لە ئاست گشت کارو بارە ، شەرت وایە بە دڵ بێدار بێ و بیزانێ ، نەك بە دەم بڕیاردەو هەستی بۆی نەڕوانێ ، ئەوەی تێ گەیشت هەردەم خواوەندی بۆی دەروانێ ، بۆ ئەنجامدانی کارانی خەراپە هەرگیز ناتوانی.

## ٥١ـ الحق

ناوێكه لەناوە جوانە دادپەروەركانی خوای شاهید, بنـچینەی ئـەم نـاوە –حـق-ە واتە حەق و ڕاستی :-الحق- واتە ئەم خوایە پەرسـتراوێكە حیكمـەت و دانـایی وە هـەر چییەك كە بیەوێ ئەی هێنێتە كایەوەو وە هەموو كارو فەرمانێكی هەر حەق و ڕاسـتیە , وەكو خوای گەورە دەفـەرموێ ﴿...وَيُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِـرَ الْكَافِرِينَ ﴾ الانفال :٧ . واتە-خوا دەیەوێ حەق و ڕاستی بەجێ بگەیەنێ بە ووشەكانی وە پشتی كافران و بێ باوەڕان بشكێنێ وببڕێ..وە هەروەها لەم ئایەتانە هەمان مەبەست دەگەینێ كە تێیاندا دەفەرموێ:- ﴿ لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ ﴾ الانفال (٨) ویونس ﴿ وَيُحِقُّ اللَّهُ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُـونَ ﴾(٨) الـشوری (٢٤). هەروەها ڕوو لە خاوەن نامەكان دەكا ودەفەرموێ ﴿يَاأَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُوا فِـي دِينِكُمْ وَلاَ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلاَّ الْحَقَّ ﴾ النساء (١٧١)واتە-ئەی خاوەن نامەكان زیـادە ڕەوی مەكەن لەئاینتان , ووتارو كرداری پوچەڵ وبەتاڵ مەدەنە پاڵ خوای گەورە، تـەنیا حەق و ڕاستی نەبێ.. هەروەها هەرچی لە بوندا هەیە خوای گەورە بە گەمەو گاڵتە نەی هێناوەتە كایەوە بە لكو بە هەق و ڕاستی بەدی هێناون وەك دەفـەرموێ:- ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ(٣٨)مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ الدخان (٣٨-٣٩) واتە-ئاسمانەكان وزەوی ونێوانیانمان بە گەمەو گاڵتە بـەدی نـەهێناوە , بـەدیمان نـە هێنـاون تـەنها بـە حـەق و ڕاسـتی نـەبێ , بـەڵام زۆر بـەیان نایزانن...وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:- ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُـولَهُ بِالْهُـدَى وَدِينِ الْحَقِّ ﴾ الصف :٩ واتە-ئەم خوایـە حـەق پـەروەرە خـۆی پێغەمبەرەكـەی ڕەوان كردوە بە ڕێنمونەییەو ئاینی حەق وڕاست پەروەری، خوای گەورە خـۆی نـاوێكی حەقـەو هیچ شتێكی بەناحەق و بێ هودە دروست نەكردوەو بەدی نەهێناوە، وەكو ئـادەمیزادیش نیە جارجارە شەرم بیگرێ , لە هەق وڕاستی كەمێ كەم تەرخەمی بكا, وەك دەفەرموێ :- ﴿ وَاللَّهُ لاَ يَسْتَحْيِ مِنْ الْحَقِّ ﴾ الاحزاب (٢٣) واتە- بێگومان خوای گەورە شەرم لە حەق و ڕاستی ناكات بەهەر جۆرێ بێ ئەنجامی دەدات، خوای گـەورە ڕۆژی قیامـەت

بەریا دەکـا بـۆ ئـەوەی هـەق و ڕاسـتی بپـارێزێ و پـارێزراو بـێ , ئـەم بـەڵێن وادەی داوەوگومانی تیانیە , وەك دەفـەرموێ:- ﴿ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلاَ تَغُرَّنَّكُمْ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾ لقمان :٣٣ واتە- وادەی خودا کە ڕۆژی زیندو بونەوەیە ئەنجامدانی هـەق و ڕاسـتیەیە بەسەر بەندەکانا , ئینجا با ژیانی دونیا مەغروری و زیادە ڕەویتان پێ نەکاو لە هەق و ڕاستی لاتان نەدات.خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی بە هەق بەدی هێناوەو ستەم وزوڵم لە کەس ناکات — سبحانە وتعالی-وەك دەفەرموێ ﴿ فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَـيْهِمْ الضَّلاَلَةُ ﴾ الاعراف (٣٠) واتە-کۆمەڵێ لەسەر ڕێگای ڕێنمونـەیین وە کۆمـەڵێ هـەقی گومڕایان هەیە. کەواتە ئێمەی موسڵمان دەبێت هەمیشە لەسەر هەق بـین و لـە پـەنای هەق دابین و پـشتیوانی لەهـەق دا بکـەین و فیـداکاری هـەق بـین , تـاکو ئـەوێ ڕۆژێ ڕەزامەندی خوای گەورەی هەق پەروەر بەسەر ئێمە وە شایستە بێت ..

پێچەوانەی هەق زوڵم وستەمە، خودای باڵادەست و شکۆمەند حەرامی کردووە لە سەر خۆیو لە نێوان بەندەکانیا وەك لە حـەدیثیکی قودسـی دا هـاتووە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێ خوای گەورە دەفـەرموێ : [ یـا عیبـادي انـي حرمـت الظلـم علـى نفسـي وجعلته بينكم محرما فلا تظـالموا ] واتە ئەی بەنـدەکانم بـە ڕاسـتی مـن زوڵـم وسـتەمم لەسەرە خۆم حەرام کردووە وەرگێراومە بە حەرامیش لە نێوان ئێوە دا جا مەردی خودابن و ستەم و زوڵم نەکەن . دیاردەی ئەم کەون و بونەوەرە بە هەموو یاساو نیزامـە جـوان و قەشەنگە، تیـشك و پرشـنگی حـەق خـوازی لێ ڕەنـگ دەداتـەوەوە .. فـیترەو بـوونی ئادەمیزادیش شاهیدە لە سەر حەق پەروەریێتی خودای دادپەروەر، بۆیە کاتێ کە زوڵـم و ستەمی لێ دەکرێ یەکسەر ڕووەو خودای شکۆمەند بە دەستی پاڕانەوەو ئومێـدەوە ڕوی تێ دەکات، چونکە فیطرەی دەزانێ و شاهیدە کە خوداوەنـد لایـەنگری مەزلومـەو دژی زوڵم و ستەمەو حەق خوازو حەق ویـستە، لەگـەڵ ئـەوەی خـودای حـەق ویـست ، دڵ و فیترەیەکی ساف وساغ و چاکی بەئادەمیزاد داوە، ئەگەر ئەو ئادەمیزادە بە دەستی خۆی لە خۆی پیس نەکاو تێکی نەدات بەرنامەیـەکی جـوان و پوختـەو حەقیـشی بـۆ ڕەوان کردووە، کەرێکی داخوازیەکانی فیترە پاکەکەیەتی، تاکو شادومان ببێتـەوە و ئاشـنابێ

لەگەڵ پەروەردگاری , بزانی وەلێی بێ گومان بێ کە حەق چییە، وە بە حەق بجولێتەوە، تاکو دوا ڕۆژ لەجیرانێتی زاتی حەق لە بەهەشتی پڕ نیعمەتدا جێگەی ببێتەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستە زاتی حەق سنووری راستی و دروستی دیار کردووە وەك دەفەرموێ ﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ واتە ئەوەی فەرمان ڕەوایی بەو بەرنامەیە نەکات کە خودای بالا دەست و شکۆمەند ڕەوانەی خوارەوەی کردووە ئەوا سنووری حەق و راستی جێ هێشتووە و بەسەر زوڵم و ستەم هەڵگەڕاوە . جا وەك و قورئان شاهێدە لەسەر حەق پەروەرێکی خواوەندی تاك و پاك , ئاواش ئەم کەون و بوونەوەرە شاهێدە لەسەر هەمان سیفەتی زاتی حەق، هەروەها فیطرەو سروشت و بوونی ئادەمیزادیش تەصدیقی هەردوو کتابەکەی زاتی حەق دەکات چ کتابی ئاسمانی چ کتابی ئەم کەون وبوونەوەرە، زاتی حەق داوا لە ئێمە دەکات کە بەم سیفەتە خۆمان ئارایش بدەین وهەردەم حەق پەروەر بین و لێی لا نەدەین , چونکە بەرزی و پیرۆزی گەورەیی ئادەمیزاد لە هەق وویستێتی دایە , وە زاتی حەقیش بەرزی و پیرۆزی و چاکەی ئێمەی دەوێ , چونکە ئێمەی بە دیهێناوە و خۆشمانی دەوێ جا لە کۆتاییدا ڕووەو زاتی حەق دەڵێین ( اللهم ارنا الحق حقه وارزقنا اتباعه وارنا الباطل باطله وارزقنا اجتنابه يا ارحم الراحمين )

## ٥٢ ـ الوكيل

ناوێكه له ناوه جوانەكانی خوای حەق , بنچینەی ئەم نـاوه -وكـول-ه واتـه پـێ سپاردن و دانه دەست..

الوكیل:-واته ئەم خوایه جێگای پشت پێ بەستنه و پـشتی پـێ دەبەسـترێ , وه هەر كەسێ بەڕاستی و پاكی پشتی پێ ببەستێ ئەوا پشتی له زەوی ناداو زەرەرمەنـدی ناكاو, دەی پارێزێ له هەموو دەردو بەلاّو ناخۆشی و تەنگانەیی , بـێ گومـان چـاودێرو پارێزەری گشت بونەوەرەكەیەتی , بەردەوام به شـەو بـه رۆژو هـەموو كـات و سـاتێ , زیندەبوەكان ماتڵ ناكا له رزق و ڕۆزی یان , لەلاشه به هێز كردنیان, لەخەو پشوودانیان له پێداویستی ژیانیان , وەك دەفەرموێ:- ﴿ذَلِكُمْ اللَّهُ رَبُّكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُـلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ الانعام (١٠٢ ) هەروەها خوای گـەوره بـه پێغەمبەر دەفەرموێ ﴿إِنَّمَا أَنْتَ نَذِيرٌ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ هود :١٢ . واته:- تۆ بێدار كەرەوەی وه خوا خۆی پارێزەری هەموو شتێكه , وه لەسەر زومانی حـەزرەتی یەعقوب دادەفـەرموێ ﴿إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ یوسف : ٦٧ . واته:- فەرمان ڕەوایی تەنها بۆ خوایه پشتم بەو بەستووه , وه هەر كەس ئەهلی پشت پێ بەستنه با پشت به خواببەستێ, وه لەسەر زمانی پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- به گشتی دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا لَنَا أَلاَّ نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُـونَ ﴾ ابـراهیم :١٢ . واتـه چیمان دەست دەكەوێ لەوەدا كه پشت به خوا نەبەستین به راستی ڕێ نمونەیی كردوین بۆ گەلێ رێگەی وا كه بیان كەین به بەلگەی گەورەیی خوداو دڵمان پێی دابمەزرێ ؟ وه بـه ڕاستی ئێمه مادام رێگەی خوا ناسیو ڕەزای ئەومان دەستكەوێ ئیتر هەرچی بەسەرمانا بێت خۆمان نەگرین وه ئارام ئەگرین لەسەر هەر كارێ كه ئێوه ئازاری ئێمەی پێ بـدەن، وه با هەر بەخوا پشت ببەستێ ئەو كەسانەی خواستیان لەسەر پشت بەستنه. . .هەروەها خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلاً ﴾ الزمر

:٩ . واته پەروەردگاری رۆژهەلاّت و رۆژئاوایە, هیچ پەرستراویّ نیە تەنها ئەو نـەبیّ بـە پشتیوانی بگرەو پشتی پیّ ببەستە...ئەم سیفەتەی خوای گەورە دەبیّ وامان لیّ بکا بە پاریزەرو یارمەتی دەرمان بزانین وە دلّنیـا بـین کـە هەمیـشە دیّت بـە هانـا مانـەوەو پشتیوانمانە، وەك دەفەرمویّ:- ﴿وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ التوبه (٥١) واتـە- باخاوەن باوەڕان پشت بە خوابەستن... هەروەها دەفـەرمویّ: ﴿وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّـهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ﴾ الطلاق (٣ ) واتە:- ئەوەی پشت بە خوا ببەستیّ , ئەوە خوای بەسە بـۆ هەموو شتیّ ، ئەو سیقە و متمانەیەی کەلای عەبدو بەندە دیّتـە کایـەوە بەرامبـەر بـە خودای بالاّ دەست و شکۆمەندی بۆ پشت پیّ بەستن، لە ئەنجامی حالّی بوونی لە ناسینی خودای ئازیزو بەخشندەیەتی، کەواتـە ئـەوەی پـشت بـە خوانابەسـتیّ نـا حالیـە لـە حقیقەتی سیفاتی خوای تاك وپاك و بیّ هاوتا، دەنا شتیتر نیە یا کەسی تر نیە شـایانی پشت پیّبەسـتن بـیّ یـا بتـوانیّ بـەکاری پـشت پـیّ بەسـتراویّتی هەلّبـستیّ یـا پیّـی بکریّ...پشت بەستن بە خودای بالاّ دەست کرۆکە و ناوکی ئیمانە، جا ئەوەی پـشت بـە غەیری خوا دەبەستیّ ئەوە ئیمانەکەی بیّ کرۆکە و ناوکـە، مامۆسـتا (سـعیدحوی) لـە کتابی (الاسلامدا) لە جزئی یەکەم دا لەلا پـەرەی (٧٣ —٧٤ ) دا باسـی تـەوەککول و پشت بەستن بە خوا دەفەرمویّ ئەوەی پشت بە خوا نەبەستیّ وتەوەککولی لەسـەر نـەبیّ ئەوە شایەدمانەکانی بەتال و پوچەلّ دەبیّتەوە . هەروەها دەفەرمویّ مانای تـەوەککول و پشت بەستن بە خودا ئەوە نیە واز لە کارو کردەوە بیّنی نەخیّر , بـەلّکو خـودای گـەورە دوو ئەمرو فەرمانمان پیّ دەکات ,ئەمرو فرمانیّکمان پیّ دەکات کە کارو کردەوە بکەین بە پیّی سونەنی کەونی کە بۆی رام و موسەخەر کردوین , وە ئەمرو فەرمانیّکی ترمـان پیّ دەکات کە تەوەککول و ئیعتیماد و پـشت بەسـتنمان بـەکارو کـردەوەو ئـیش نـەبیّ بەلّکو بەخودای تاك و پاك وبیّ هاوتابیّ خوای فەرمان ڕەوا ئەمرو فەرمانمان پیّ دەکـات کە کەل و پەلی جەنگی ئامادە بکەین وە لەوەی جەنگ دەیخوازیّ، لـە هـەمان کاتیـشا ئەمرو فەرمانمان پیّ دەکا کـە پـشت بـە ژمـارەو ئالـەت یـا جـۆری چـەك نـە بەسـتین

بەڵکوپشت تەنها بە خودای سەرهێخەر ببەستین، چونکە سەرکەوتن لای خودایە نەك لای ژمارەو جۆری چەك , باڵا دەستی شکۆمەند دەفەرموێ ﴿وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ الانفال :١٠ . هەروەها خوای گەورە ئەمرو فەرمانمان پێ دەکات کە ئیش وکار بکەین لە هەمان کاتدا ئەمرو فەرمانێکی ترمان پێ دەکات ئیعتیماد و تەوەککول مان لەسەر خودابێ، نەك لەسەر جۆری ئیش وکار چونکە خودای گەورە خۆی رەززاقە نەك ئیش و کار، یا کەلو پەلیان وەکو زاتی رەزاق دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ﴾ الذاريات :٥٨ . هەروەها خودای شافی ئەمرمان پێ دەکات کە بە دوای چارەی دەردو نەخۆشەکانمان کۆشش بکەین وهەوڵدەین بە دوای داو دەرمانا، لەهەمان کاتیشا لەم بارەوە ئەمرو فەرمانمان پێ دەکات کە باوەڕمان وابێ خودا خۆی شافی یەو شیفاو چارە لای ئەوە نەك لە لای داو ودەرمان، وەك زاتی شافی لەسەر زوبانی حەزرەتی ابراهیما (على نبينا وعلية الصلاة والسلام) دەفەرموێ ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِي ﴾ الشعراء (٨٠) جا پێویستە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەپێی سونەنی کەونی و هەوڵبدەین و لەهەمان کاتیشا پشت و تەوەککول و ئیعتیمادمان لەسەر خودای باڵا دەست و شکۆمەند بێ عەقلێ وژیریش پێمان دەڵێ ﴿ متوكل ﴾ پشت پێ بەستراو یا بڵێین وەکیل دەبێ زاناو تواناداروخاوەن ئیرادەو خاوەن بیناو بیسەربێ، ئەم سیفەتانەشی بە هەمیشەیی هەر لەلای خودان وهەرئی خودان، بەڵام ماددە بە هەموو جۆرو نەوعیانەوە جێگەی پشت پێ بەستن نین وە بە کەڵکی پشت پێ بەستن نایەن، چونکە خاوەنی ئیرادەو تواناو دەسەڵات وبیناو بیسەرنین..جا بەم پێ یەوە ئەوەی پشت بە ماددیان ببەستێ وپشت بە خودا نەبەستێ عەقڵی خۆی فاسید کردووە، بەگومرایی ووێڵیدا کەوتووە خودای لە خۆی رەنجاندووە..

جا لە کۆتاییدا پڕ بە دڵ وبە گیان ڕوەو خودای ئازیز دەڵێین ﴿ ربنا عليك توكلنا واليك انبنا واليك المصير ربنا لاتجعلنا فتنة للذين كفروا واغفر لنا ربنا انك انت العزيز الحكيم.

## ٥٣ ـ القوي:-

ناوێکە لە ناوە جوانە پیرۆزەکانی خوای وەکیل بنچینەکەی -قوە- واتە هێزو دەسەڵات . القوي- واتە ئەم خوایە خاوەن هێزو دەسەڵاتی بێ سنورەو کەسێ نیە لەبەر هێزی وی دەرچێ و وە هێز نیە خۆی لە ئاست و قەرە بدات . وە هەموو بونەوەرەکان جێگەی هێزی دروست کاری ئەون , وە هەر خۆی خاوەن هێزی تەواوە وەك دەفەرموێ:- ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴾ هود(٦٦ ) واتە بێگومان پەروەردگاری تۆ خۆی بە هێزی زاڵە...هەروەها دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ الانفال (٥٢) واتە بەراستی خوای گەورە بە هێزەو سزای سەختە بۆ ئەو کەسانەی لە یاساو فەرمانی دەرئەچن...هەروەها دەفەرموێ ﴿عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى ﴾ النجم (٥) واتە: خوای بەهێزو دەسەڵات فرستادەکەی فێرە قورئان کردووە، هەروەها خوای گەورە موژدە و مزگێنی دەداتە خاوەن باوەڕان وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ الحج: (٤٠) ، واتە: بێگومان خوا ئەو کەسە زاڵ و سەرکەوتوو دەکات کە پشتیوانی ئاینی خوا دەکاو هەوڵی بەرزبونەوەی دەدات, بە ڕاستی خوای گەورە بە هێزو دەسەڵاتدارە ...وە هەرچی هێز هەیە لە کائیناتا گشتی هێزی پەروەردگارەو کەسێ خاوەن هیچ هێزێ نیە، وەك پێشەوامان ﴿ محمد - ﷺ- ﴾ دەفەرموێ ﴿ لاحول و لا قوة الا با لله ﴾ وە کافران و موشریکان یا ئیمانداران وە یاهەر مەخلوقێکی تری خوای گەورە گەر هێزێکیان هەبێ ئەم هێزە زاهیری و ڕواڵەتیەوە، لەڕاستیدا هەر خوای تاك و تەنها ئەم هێزەی پێداوە , ئەمەش لەبەر چەندەها حیکمەت کە هەر خۆی دەیزانێ , ئەم هێزانەش کەوا بە مەخلوق ودروست کراوانەوە هەن گشتیان لە ژێرخواست و ئیرادەی خوای میهرەبانە, وە بە ئارەزووی خۆی هێزو توانا بدات بە کوێ دەیداو لە کوێش بسەنێتەوە ئەنجامی دەدات، ئەم سیفەتە پیرۆزەی خوای مەزن ئەبێ هەمیشە ئەوەمان بخاتەوە یاد کە هێزی هیچ کەسێ نیە بە قەدەر خوا بە هێزو دەسەڵات بێ، دوژمنانی ئەمرۆی خوای گەورە جا چ رۆژهەڵاتیەکان بن یا رۆژئاوایی بن یا بەکرێ گیراوی ئەو لاو

ئەملای بن لە بەرامبەر هێزو دەسەڵاتی خوای گەورەدا زۆر لە ژێر صفرەوەن و سادەترین هێزو دەسەڵاتی خوا تەخت وتاراجیان تێك دەداو سەراو گومیان دەكاو ریشەیان لە بن دەردێنێ , ئەم ڕاستیەش گومانی تیا نیە، وەدەبێ وامان لێ بكا كە پشت ئەستوربین بە خوای هێز لە بن نەهاتووە تاكە هێزێ كە ئەم كەون و بوونەوەری بەدی هێنابێ و بەڕێوەی ببات هەر ئیرادەو خواستی ئەوە لە بەڕێوەبردنی گشت بوونەوەرەكان بەجنۆكەو ئادەمیەكانەوە، هەر چەندە بە ڕواڵەت وا دیارە هەندێ لە مەخلوقەكان خاوەن كەمێ هێزو بەشێ لە ئیرادەو خواستن بەڵام ئەو هێزو خواست و ئیرادەیان سنووردارە و كاتیەوە لە ژێر هێزو ئێرادەو خواستی خودای شكۆمەند بەدەر نیە، بەڵكو لە ناو بازنەی پڕحیكمەت و دەسەڵات و خواستی خوای گەورەدایە وە خودای زانا ودانا لە ئەزەلەوە بە خواست و ویست و كاری هەموو كەسێكا زانا بووەو زانایە خۆی گشتی ئەندازەیی بۆ داناوەو تەقدیری كردووە , وە بە هیچ شێوەیێ لە دەرەوەی دەسەڵات وئیرادەو هێزی لەبن نە هاتووی خودای شكۆمەند نیە ...ئەو كەون و بوونەوەرە فراوانە بە هەزارەها مەجەرەو هەزارەها ئەستێرەكانیان بەشاهێدی مێژووی دێرین و كۆنیەوە گشتیان بەدیاردەو ڕەواڵەتی دەسەڵات و هێزی خودای ئازیزو شكۆمەندن، وە دەروون وفیطرەو سروشتی ئادەمیزادیش لە هەمان شاهێدی دایە كە خودای ئازیز لە هەموو دەسەڵاتداران دەسەڵاتدارترە لە هەموو خاوەن هێزان بە هێزترە , ئەم شاهێدیەشی لەو كاتانە روون و ئاشكراترە كاتێ كە خاوەن دەسەڵاتێ زوڵم وستەمی لێ دەكات هانا بۆ زاتی خاوەندی بەهێزو توانای هەمیشەیی دەبات چونكە فیطرە و ویوونی دەزانێ دەسەڵاتی بێ پایان و هەرگیز لەبن نەهاتوو هەر ئی خودای باڵ دەست و شكۆمەندە، لەقورئانی پیرۆزدا یازدە جار (١١) ناوی (قوي) هاتووە نۆ جاریان مەبەستی سیفەتی خودای خاوەن هێزو دەسەڵاتەیەكێ لەم ئایەتانە لە سورەتی ( غافر)ە كە لە ئایەتانی (٢١ –٢٢ ) دەفەرموێ: ﴿أَوَ لَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم

مِنْ اللَّهِ مِنْ وَاقٍ(٢١)ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَتْ تَأْتِيهِمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا فَأَخَذَهُمْ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ واته ئايا نارۆن و ناگەڕێن لەسەر زەویدا بۆ مێژووەکەی ئەم زەوییە تەماشا ناکەن چۆن بوو عاقیبەت و چارەنووسی ئەو کەسانەی پێش ئەوان، کەلە کات و زمانی خۆیانا زۆر لەوان بەهێزو دەسەلاّتدارتر بوون وە خاوەن ژینگەو شوێنەواری چاك و باش بوون خوای گەورە گشتیانی تەفرو تونا کردوو بە هیلاکی بردن بە هۆی گوناهەکانیانەوە , وە لە لای خودای بالاّ دەست بۆیان نەبوو پارێزەرو پارێزراوێ - بۆیەش مالّیان وێران بوو چونکە ئەوان پێغەمبەرانی خۆیان بە بەلّگانی ڕوون و ئاشکرا ئامۆژگاریان دەکردن ورێ ڕاستی ژیانیان بۆ ڕوون دەکردنەوە بەلاّم ئەوان پێیان بێ باوەڕ بوون وگوێیان پێ نەدان، خودای بالاّ دەست خستنیە ژێر قارو قینی خۆیەوەو بە هیلاکی بردن, بەڕاستی خودای گەورە سەرچاوەی هەموو هێزو دەسەلاّتەکانە تۆلّەو عیقابی سەختە، لەم ئایەتانەدا بۆمان ڕوون بووە تەسلیم نەبوون بۆ بەرنامەی خودایی ئادەمیزاد بە دونیای گوناه و تاوان دا دەبات , گوناه و تاوانیش عەزاب و غەزەب و هەلاکەت و خەسارەت حەلاّلّ دەکات, ئەمە سونەنی خودایە لەم کەون و بوونەوەرەدا پشت گوێ خەرانی بەرنامەکەی تووشی ئەشکەنجەو عەزاب دەکات بێ نرخ و ریسوایان دەکات , بەلاّم خاوەن لوتف و کەرەمە بەئیمانداران ڕێزو پلەو پایەیان پێ دەبەخشێ , وە خۆی خاوەن هەموو دەسەلاّتێکە وەخواست و ئیرادەی ئەوە حاکم و فەرمان ڕەوایە بەسەر ئەم کەون و بوونەوەرو دونیایە، هەرخۆی سونەنەکانی نەخشاندووە بەو پەڕی حیکمەت ودانایی‌و حەقەوە، هەر هێزی ئەوە لەگەڕدایە بە هەمیشەیی .کەس بێ هێزو ئیرادەی ئەو هیچی بۆ ناکرێ گەر بیزانێ یا نەی زانێ وەك دەفەرموێ:- ﴿اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴾

## ٥٤ ـ المـتـيـن

ناوێکه لەناوه جوانەکانی خوای بەهێز، بنچینەی ئەم ناوه (متن)ە واتـه پتـەوی و بەهێزی...

المتين- واته خوای گەورەو میهرەبان ئەوپەڕی توندو تیژی وهێزو دەسەلاتی هەیه , بەجۆرێ له کارو ویستەکانیا توشی هیچ جۆره کۆسپ و ماندووبوونێ نەبووەو نابێ وەکـو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ الـذاريات (٥٨) واتـه: بەڕاسـتی خوای گەوره هەرخۆی رزق ورۆزی بەخشەو خاوەنی ئەوپەڕی هێزو دەسەلات و توانایه... هەروەها هەرەشه لەدوژمنانی خۆی دەکا-" که بریتین له بێ بـاوەڕان و هاویـەش پەیـدا کەران و لەیاسا دەرچوان"- وەك دەفەرموێ ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ القلم (٤٥ ) واتـه -مۆڵـەتیان وماوەیـان دەدەمـێ وه لەدوایـدا بەتونـدو تیـژی لێیـان دەپێـچمەوه وحیسابیان له گەلا دەکەم . بێگومان ئێمەی خاوەن باوەڕ دەبـێ لـەم سـیفەتەی خـوای گەوره تێ بگەین ودامەزراو بین چ لەرەوشت وکردەوەماندا یا لەباوەڕو عەقیدەماندا , وه لای خوای میهرەبان فەرامۆش نەکەین و تـا نەبێتـه هـۆی ئـەوەی خۆمانمـان بـێ هێـز بکەوێته بەرچاو ئەوسا وورەو تێکۆشانمان ڕوو لەساردی و کزی بکات .. قورئانی پـیرۆزو کتابی بوونەوەرو مێژوو سروشتی وفیترەی ئادەمیزاد هەر گشتیان بـه یەکـەوه شـایەدی دەدەن و دیاردەی ئەم سیفەتەی شکۆمەندی به هێزی بالا دەستی مەتینه،

. له قورئانی پیرۆزدا سێجار (٣) زاراوەی مـەتین هـاتووه کەمەبەسـت سـیفەتی زاتی ئازیزو شکۆمەنده...یەکێ لەم ئایەتانه له سورەتی الـذاريات , وەکو خوای گـەوره لـه ئایـەتی (٥٥) تـاکو (٥٨) تێـدا دەفـەرموێ: ﴿وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ(٥٥)وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ(٥٦)مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ(٥٧)إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ کورتـەی مانـای ئـەم ئایەتانه ئەوەیەکه خوای بالا دەست وشکۆمەند دەفەرموێ یادوو بەرنامەی خوداو حـەق بیری ئادەمیزادەکان بخەوه، جا بەڕاستی یـاد کـردن و باسـکردنی بەرنامـه شـیرینەکەی خـودای تـاك و پـاك سـودو قـازانج بـەخاوەن بـاوەڕان دەگەیـەنێ، وه بـزانن جنۆکـەو

ئادەمیزادم بەدی نەهێناوە تەنها بۆ بەندایەتی و عیبادەت کردنی خۆم نەبێ , واتە کارو وەزیفەی جنۆکەو ئادەمیزاد بەندایەتی کردنی خودایە، بەندایەتی بەمانایــە فراوانەکــەی خۆی، کە کورتی‌یەکەی بریتی‌یە لەدوورکەوتنەوە لەکاری بێ شەرعیو ژیــان ڕازاندنــەوەو جوان کردن و بەرەو پێش بردنی لە سایەی بەرنامەو یاسای خودای هەمیشە زیندوو بــالاّ دەست، هەروەها خودای ئازیز وشــکۆمەند ڕوەو ئادەمیزادەکــان دەفــەرموێ مــن رزق و رۆزیم لێیانەوە ناوێ بە لکو هەر کارو وەزیفەکەی خۆیان کە بەندایەتی‌یە بەجێ بگەیەنن چونکە بە ڕاستی خودای پاك و بێ باك خۆی رزق ورۆزیدەرە بۆ گشت گیــان لەبــەرێ، وە هۆو ئەسبابی رزق ورۆزی بۆ خەلق کردوون و بــەدی هێنــاوەو بــۆی رام و موســەخخەری کردوون و، وە خۆی خاوەنی دەسەلاّت وهێزو شکۆمەندی بەتینە هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُمْ مِنْ حَيْثُ لاَ يَعْلَمُونَ(١٨٢)وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ(١٨٣)أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِـصَاحِبِهِمْ مِـنْ جِنَّـةٍ إِنْ هُـوَ إِلاَّ نَـذِيرٌ مُبِينٌ(١٨٤)أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَدْ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾ (٨٥ ) الاعراف- واتە ئەوانەی نیشانان و ئایەتانی ئێمە بە درۆ دەزانــن و بــاوەریپێ نــاهێنن و گــوێ ڕایــەڵی ناکەن ئێمە وورده وورده و پلە پلە لە قولای گومڕایی و هەلاکەت نغرۆیــان دەکــەین بــە شێوەیێ کە نەیزانن و بــێ ئاگــابن لــە چــارەنووس و مەصــیریان، وە کــەمێ مۆڵــەت و درێژەیان پێ دەدەین کەماوەی پێ مەشغولّ بوون و غەفلەتیانە، ماوەی درێژەی ئەمەل و بیرنەکردنەوە نەڕوانین و پەند وەرنەگرتنە بۆیان، وە سەرەنجام تێ دەگەن خودای بالاّ دەست تۆڵەو گرتنی سەختە لە ئاست دوژمنەکانی‌یەوە، ئایا ئەو ئادەمیزادە سەر سەختە کەللە ڕەقە و بێ باوەڕانە بیر ناکەنەوە لەوەی کەبرادەرەکەیان ( محمدی کــوڕی عبداللــە ) - ﷺ - ئادەمیزادێکی شێت و گێژو جنۆکاوی نی‌یە، بەلکو عاقلّ و دانــا و زانــا و هۆشــیارو وورییــە، بــەلکو پێغەمبــەر و ڕابــەرو ســەروەری ئادەمیزادەکانــەو، بێدارکــەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕەوشەنە، ئایا ئــەو بــێ باوەڕانــە ســەیری ئــەو هــەموو مولّــك و مەخلوقانە ناکەن لە ئاسمانەکان و زەوی لەو هەزارەها یا ملیۆنەها شــتانەی کــە خــودای

خاليق به ديهێناون و خەلقی كردوون، لە ئادەميزادو مالات و بالندەو ئاوو هەواو ئەستێرەو مانگ و كێوو شاخ و دەرياو... هتد جا ئەگەر بەمە عيبرەت گر نابن و تێناگەن ئەوە ئومێد وايە نزيك بۆتەوە كاتی ئەجەل و مردنيان , جا ئەگەر بەم قورئانە پڕپەندو موعجيزەو ئامۆژگاريیە ئيمان نەهێنن، وە بەو پێغەمبەرە (ﷺ) خووڕەوشت جوان و نەرم و حەليمە باوەڕ نەكەن ئەی بە چ گوفتارو ووتارانێك باوەڕدەكەن و ئيمان دێنن...ئەی ئادەميزادی بێ باوەڕی سەرسەخت ئەوە بۆ پەردەی قەناعەت و باوەڕيت دڕاوەو پەكی كەوتووە، لە پاش ڕاستی و دروستی پاكیو پوختی چی دەمێنێتەوە گەر تۆ حەق ويستی، جا خودای بە هێزو مەتين بەم سيفەتەی خۆی هەرەشە لەبێ باوەڕان و فاسقان و ستەمكاران دەكات، هێز و توندی و مەتينی خودای بالادەست لە هەموو ڕوو لايەنێكەوە بە پێی خواست و ئيرادەی پڕ حيكمەت و دانايی خۆی لەگەڕدايەو سەرچاوەكەی هەر لە خۆيەوە دەگرێ و، كەم وكوڕی بەسەردا نايێو پێويستی بەكۆمەكی كەس نیيە، لە فەرمودەيەكی قودسی هاتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ خوای گەورەو بالادەست دەفەرموێ: **﴿يا عبادى انكم لن تبلغوا ضرى فتضرونى ولن تبلغوا نفعى فتنفعونى ...يا عبادى لو ان اولكم واخركم وانسكم وجنكم كانوا على اتقى قلب رجل واحد منكم مازاد ذلك في مولك شيئا...ياعبادى لوان اولكم واخركم وجنكم كانوا على افجر قلب رجل واحد منكم مانقص ذلك من ملك شيئا..عبادى لو ان اولكم واخركم وانسكم وجنكم قاموا فى صعيد واحد فسألونى فاعطيت كل واحد مسألته ما نقص ذلك مما عندى الا كما ينقص المخيط اذا ادخل البحر ﴾ ... رواه مسلم** ، سەر گوزشتانی مێژوو لە مەتينيی خودای بە هێز دەدوێ بۆ كەسانێ لە ئاسۆی (اولو الالباب) شوێنيان دەبێتەوە هەروەها ئەم كەون و بوونەوەرە فراوانە دياردەی مەتينیو بەتينیو هێزی خاليق و بەديهێنەرەكەيەتی، كە خودای تاك و پاك و مەزنە، هەروەها مانای بەتينی و بەهێزی و مەتينی خودای ئازيز لە دەروون وسروشت و فيطرەی ئادەميزادا دەخوێنرێتەوە...

## ٥٥ - الـولـي

ناوێکە لە ناوە جوانە دڵتەزێنەکانی خوای توندو تیژ بنچینەی ئەم ناوە -ولي-ە واتە نزیکی .......

الولي- واتە ئەم خوایە پشتیوان و دۆستی بەنـدە باوەڕدارەکانـە چـونکە نزیـك و ئاگەدارە ،سەرکەوتن وسەرفرازی و پیرۆزی دەبەخشێ بەهەر یەکێ کە بیەوێ وەیـا هـەر چەن و چۆنیەکی بیەوێ هەروەك دەفـەرموێ.. ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْـرِجُهُمْ مِـنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمْ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنْ النُّـورِ إِلَـى الظُّلُمَاتِ﴾ البقره (٢٥٧ ) واتە-خوای گەورە پشتیوان ودۆستی ئەو کەسانەیە کە ئیمان وباوەڕیان هەیە وە لە تاریکی و گومڕایی و بێ باوەڕی دەریان دەهێنـێ بـەرەو روونـاکی نور ئەیان بات , وەکۆمەڵی بێ باوەڕان دۆست و پشتیوانیان شەیتانەکانە لە نورو روناکی دەریان دەهێنێ بۆ تـاریکی وگـومڕایی...خـوای گـەورە دۆسـت و بـرادەرو پـشتیوانی ئیمانداران دیاری دەکـاو دەفـەرموێ : ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمْ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّـذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾ المائدة (٥٥) واتـە-بـێ گومـان تـەنها دۆست وپشتیوانتان خوای گەورەیە , پێغەمبـەرەکەیەتی و وە ئەمانەی ئیمان و باوەڕیـان هەیە , ئەوانەی کە نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و بەدڵ و بـەگیان مـل کەچـی ڕێگـەی خوان .. جا بەڕاستی ئەوەی ئەمانە بکات بە دۆست وخۆشەویستی خۆی نیشانەی ئیمان وباوەڕیەتی و وە ژیانی ئاسوودە و کامەران و ساکار دەبێت .. وە لـە دونیـا و قیامـەت سەرکەوتوو دەبێ بەسەر هەموو گیرو گرفتێ... ئەم ڕاستیەش خوای گـەورە ئاشـکرای کردووە وەك دەفەرموێ:-﴿ وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُـمْ الْغَالِبُونَ﴾ المائده (٥٦) واتە ئەوەی دۆستایەتی خواو پێغەمبەری و ئیمانداران بکـات , ئەوە بە ڕاستی و بێ گومان حیزبی خوا خۆیـان سـەرکەوتوون...وە ئـەم خوایـە گـەورە هەمیشە دۆست وپشتیوانی پیاو چاکان وخۆشەویستانیەتی کـە هەمیـشە بـە ئومێـدی ڕەزای ئەون , وەك دەفـەرموێ :-﴿ إِنَّ وَلِيِّي اللَّهُ الَّذِي نَزَّلَ الْكِتَـابَ وَهُـوَ يَتَـوَلَّى

الصَّالِحِينَ ﴾ الاعراف (١٩٦ ) واته بەڕاستی دۆستانی خـوان ئـەو خوایـەی کیتـابی ڕەوانەی خوارەوە کردووە خۆی دۆسـت و پـشتیوانی پیاوچـاکانە...خـوای گـەوری بـە بەزەیی و میهرەبانی خۆی دۆستانی پاراستووە لە هەرچی غەم و پەژارەو ترسـێ جـا لـە دونیادابێ یالە بازاڕی قەبرو بەرزەخ بێ یا لەگۆڕەپانی قیامەت بێ یا لە بەهەشتی بەرین و فراوان بـێ وەك دەفـەرموێ: ﴿أَلآ إِنَّ أَوْلِيَـاءَ اللَّـهِ لآ خَـوْفٌ عَلَـيْهِمْ وَلآ هُـمْ يَحْزَنُونَ(٦٢)الَّذِينَ آمَنُوا وَكَـانُوا يَتَّقُـونَ ﴾ يـونس (٦٢ ) هـەروەها ئـەوەی بـەپیر دۆستایەتی خواوە نەچێ , ئەوە کەسێکی دەسـت ناکـەوێ لـە دەسـەڵات و قـاری خـوا ڕزگاری بکاو دەری بێنێ , وە هیچ دۆستێکی نیـیـە لـە راسـتەقینەدا بێجگـە لـەخوا, گەرچی بەڕواڵەت دۆست و پشتیوانی زۆربن , وەك خوای گەورە لەسەر زوبانی جنەکانـدا دەفـەرموێ: ﴿وَمَنْ لآ يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الآرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِنْ دُونِـهِ أَوْلِيَاءُ ﴾ الاحقاف:٣٢ ، واتە ئەوەی بە وەڵامی بانگەوازی خودای ئازیز نەچێت وەگـوێ نەدات بە ئیمان هێنان و ئاسۆی خواپەرستی ئەوە پەناگەیەکی چـەنگ ناکـەوێ کـەببێ بەمایەی ڕزگار بونی لە دەسـتی خـودای شـکۆمەند , وەبێجگـە لـە خـوای باڵادەسـت دۆستانێکی تری چنگ ناکەوێ کە پەنای بداو لە گێروگرفتەکانی نەجاتی بدات...ئەوەی ڕوو لەخودای خۆشەویست بکات، بە یادیەوە سەرنجێکی ئەم زەوی یەو ئاسمانە بـدات وە بیر لەو هەموو مەجەرە و کەشکەشان و ملیۆنەها ئەستێرە بکاتەوە، لە هەمان کاتیـشا گیانێکی پاك ودڵێکی صاف و بیرێکی ئاسوودەیی هەبێت , جا لەگـەڵ هـەر هـەنگاوێ کەدەی هاوێ بەم بیرو هۆش و فیکرەوە واهەست دەکـات کـە سـەری لـە ئاسمانایـە لـە دونیای ئاسوودەیی و بەختەوەری و بەرزیدایە پێ یەکانیشی لەسەر زەویـان , سـەرتاپای گیانیشی نورو ڕەحمەتی خودا بۆتە کـاڵاو بـاڵای، هەسـت کردنـی بـە لاشـەو جەسـتەی مادێیتی لاکەم دەبێو لەپاڵ پاکی و ئەم پـیرۆزی و بـەرزی یـەدا شـیرینی ئیمـان نـۆش دەکات، هەست بە نزیکی باڵا دەستیەتی خودای بەخشندەو ئازیز دەکات ، وەك خودای دۆست و نزیکی پاك دلآن لە سورەتی (الجاثیـة) لە ئایـەتی (١٩ ) دا دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ

الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴾ واتە ستەمكاران دۆستايەتی و پشتيوانی يەكتر دەكەن بۆ زيادە بەرژەوەندی دونيای، زيادە زولّم و ستەم كردن لە چەوساوان و هەژاران و داماوان , وە خودای شكۆمەندو بەلاّ دەست دۆست و پشتيوانی نزيكی خواپەرست و موتتەقيانە، ئەو موتتەقيانە هەميشە لە هەولّ و بيری ئەوەدان كە چۆن چەوساوەو هەژاران و داماوان رزگار بكەن و، تەنگ و چەلّەمەو گيروگرفتيان چارەسەر بكەن و خۆيان بە خاوەن كەسانی بێ نەواو ستەم لێكراوان دەزانن و بە هيوای نومێدی ئەوەن ئادەميزادانی تريش بە هرەمەند بكەن بەرەحمەت و بەزەيی خودای ئازيزو شكۆمەند, ئەو ڕاستە ڕێگەی ژينەيان بۆ ڕوون دەكەنەوە, پێغەمبەری خۆشەويست (ﷺ) لە فەرمايشێكدا لە بارەی دۆستانی خودا دەفەرموێ ﴿ عن ابی هريرة (ر.ض) قال قال رسول الله (ﷺ) ان الله تعالى قال : من عادى لي وليا فقد اذنته بالحرب ,وما تقرب الى عبدي بشيء احب الي مما افترضته عليه , ومايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى احبه فأذا أحببته كنت الي مما سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصر به ، ويده التي يبطش بها ، ورجله الذي يمشي بها ، وان سألني اعطيته ولئن استعاذني لأعذينه ﴾ رواه البخاري / لە ئەبو هورەيرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێ پێغەمبەری خودای ئازيز (ﷺ) فەرموويەتی , خودای بالاّ دەست دەفەرموێ , ئەوەی دوژمنايەتی دۆستێكی من بكات بێگومان بانگەوازی شەڕو حەربی لە گەلاّ بڕياردەدەم , باشترين شتێك كە بەندە پێی لێم نزيك بێتەوە كە خۆشەويسترين كارێكبێ لای من ئەو فەرزو واجبانەيە كە لە سەرم واجب كردووە , وە بەردەوام عەبدو بەندەم لێم نزيك دەبێتەوە بە هۆی ئەو نەوافل وسوننەتانەوە كە ئەنجامی دەدات تا دەگاتە ئەو پلەيەی كە زۆرم خۆش بوێ , جا ئەگەر كارا دەبێ و پرشنگی خێرو بيرو هيدايەتی لێ ڕەونەق , بەرەكەت و نورو رەحمەتی خودا تێكەلّی گيان و لاشەو بەدەنی دەبێ , جا ئەگەر نزا بكاو دوعا بخوێنێو داوای شتێكمان لێ بكات پێی دەبەخشم و بەوەلاّمی دێمەوە، وە ئەگەر پەنام بۆ بێنێو پەنام پێ بگرێ بێ گومان ئەوە پەنای دەدەم و دەيپارێزم- ئيمامی

بوخاری ریوایەتی کردووە، ئاوەها خودای وەلی و نزیك دۆست و پشتیوانی خواپەرستان و خواناسانە و خۆشیانی دەوێ و، بەوە وەڵامی داواکارەکانیان دێتەوەو پەنایان دەداو لایان بۆ دەکاتەوەو, بە رەحمەت و نوری هیدایەت دایان دەپۆشێ ...وەکو قورئان شایەدی ئەم سیفەتەی زاتی شکۆمەندە ئاوەهاش ئەم کەون و بوونەوە شاهێدە, وە مێژووی مرۆڤایەتیش ئەم سیفەتەی تێیدا پرشنگداوە , زۆر بەزەقی و ئاشکرایی لە ژیانی پێغەمبەران و, خواناسان و خوا پەرستانا دەردەکەوێو دەدرەوشێتەوە ژیانی تاك و کۆمەڵی پێ هاوسەنگ بووە , وجڵەوی زوڵم و ستەمی سنوور بۆ کێشاوەو جار لەدوای جار بیری کۆمەڵ و هۆشیارانی خستۆتەوە کە ئەمە حەق و ڕاستیەیە، ئەمە ڕاستە شەقامی ژیان و ڕێگەی هیدایەتە...دەروون و سروشت و فیطرەی ئادەمیزادیش کاتێ بە تەگەرەو کۆسپێ دادەکەوێ و چڵك و چەپەڵ غەفڵەت وجەهالەت و مەشغەڵەت لە کۆڵی دەبێتەوەو لە کۆڵی دەکەوێ . یەکسەر بە تەنگە تاوی پەنا بۆ زاتی وەلی دەبات و دەیسەلمێنێ کە زاتی (اللە) ئاگادارو نزیکەو بەدەسەڵاتەو لەسەر هەموو کەون و بوونەوەرە لەسەر هەموو مەخلوق و بەشەرە ...هەروەها خودای تاك و پاك ومەزن لەسورەتی (ق) دا لە ئایەتی (١٦) دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ واتە, بێگومان ئێمە خۆمانین کە ئادەمیزادمان خەلق کردووەو بەدیهێناوەو وەدەیزانین چی بەخەیاڵاتی دادێت، خۆمان نزیکترن لەشادەماری گەردەن وملیەوە، بەڵێ زاتی وەلی نزیکە لە بەندەکانی بەڵام بەندە بەبیرو هۆش و تاوان خۆی لە ڕەحمەتی خودا دوور دەخاتەوە، دەچێتە دونیای گومرایی و خۆی لەبیر دەچێتەوەو نازانێ خۆی چیەو بۆچی بە دیهاتووە و بۆکوێ دەچێو مەصیرو ئەنجامی چیە، بەلام ئادەمیزادی هۆشیارو پاك و چاك و خواپەرست بەهرەمەندە بە نورو هیدایەت، ڕەحمەت هەست پێ دەکاو پێی ئاسوودەو بەختەوەرە، شاهێدی بەدڵ و بە گیان دەدات کە زاتی (اللە) وەلی ونزیکی خوا پەرستانی پاك وچاك و پوختەیە...

## ٥٦ - الحميد :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای نزیك و دۆست , ئەم ناوە (١٧)جار لـە قورئانـا هاتووە , بنچینەکەی-حمد-ە واتە سوپاس و ستایش...

الحمید -واتە ئەم خوایە پەروەردگارێکە سوپاس و ستایش بۆ کراوە , وە هەر ئەوە کە بەردەوام شایستەو لایەقی سوپاس و ستایش بۆ کردنە لەسەر هەموو کارو کردەوەیێ، خوای گەورە دەفـەرموێ:- ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ الحج (٦٤ ) واتە-بۆ خوایە هەرچی لە ئاسمان و زەوی دایە , بـە ڕاستی ئـەم خوایە بێ نیازو بێ باکە لە هەموو شتێ وە ستایش بۆ کراوە... خاوەن باوەڕان لە هـەر کارو کردەوەیێ سودی تیا بێ یا زیان , پڕ بە قوڵایی دڵەوە سـوپاس و ستایـشی خـوای گەورە دەکەن چونکە دەزانن نیعمـەتانی زۆری بـێ ژومـاری خـوا وا بـە سـەریانەوە، وە کارەکانی خوای گەورە بێ دانـایی‌و حیکمـەت نیـەو هەرچـەندە ئـەمانیش سـەریان لێ دەرنەچێت .. وە نەبێ خوای گەورە چ بە هەرەیەك لەم سوپاسـانەوەی پێـی بگـا , بـەڵام سوپاس و ستایشی خوا کردن نیشانەی باوەڕو دان نانە بە نیعمەتەکانی خـوای گـەورە , هەروەها دڵپاکی و دڵسۆزی بەندە دەنـوێنێ , وە خـوای گـەورە دەفـەرموێ:- ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنْ تَكْفُرُوا أَنْتُمْ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ ابـراهیم(٨ ) واتە-حەزرەتی موسی -علیە صلاة السلام- فەرموی ئەگەر ئێوە بـێ بـاوەڕو نیعمـەت پۆش بن وە هەموو خەڵکی سەر زەویش , ئەوە بە ڕاستی خوای گەورە بێ نیازو ستایش بۆ کراوە...وە ئەگەر ئادەمیزادو پەریش سوپاس و ستایشی خوا نەکەن ئەوە بوونەوەران سوپاس و ستایش ژمێرن بۆ ئەو میهرەبانە وەك دەفەرموێ:- ﴿إِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لَا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ الاسـراء (٤٤ ) واتـە-هـیچ شـتێ نیـە ئـیللا سەرگەرمی سوپاس و ستایشی خوای گەورەن – بـە زمـانی حاڵیـان-, بـەڵام ئێـوە لـە تەسبیحاتی وان حاڵی نابن , جا پێویستە ئادەمیزادیش لە یاسای بوونـەوەر لا نـەدات , تاڕوو زەردی قاپی پەروەردگار نەبێ... چونکە لادان لە یاسای بوونەوەر دژایەتی کردنـە

لەگەڵ فیطـرەت و سروشتی ئادەمیزاد، ستایش و شوكرانە كردنی خوداش خۆراكی گیـان و ڕوحەو دەرمانی دەروونەو گرتنی ڕێبـازی فیطـرەو بوونـەو، بـرەوی دانـە بـە ژیـری و زانیاری هەروەها بە ماڵ و سـەروەت و سـامان , وەك و زاتـی شـكۆمەندو حەمیـد لـە سورەتی ابراهیم لە ئایەتی (٧) دا دەفـەرموێ ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ واتە ئەوەیە كە پەروەردگارتان پێتان رادەگەیـەنێ و دڵنیاتـان دەكـات لـەوەی ئەگـەر شوكرانەو حەمدی خودا بكەن لەسەر ئەو هەموو بەخشـشە فـراوان و لـەبن نـەهاتووەی پێی بەخشیون، ئەوە بێ گومان بۆتان زیاد دەكاو برەوی‌و بەرەكەتی تیا دەخـات .. بـە ڕاستی ئەمە حەقێكی ڕاست و دروستی خودایە لەسەر بەندەكانی كە سوپاس و ستایشی بكەن و شوكرانەی بكەن بەوەی ڕێبازو بەرنامەی ئەو فەرامۆش نەكەن و بـەڵكو بیكەنـە كاڵاو باڵای ژیـان و ژیـوارو ژینگـەیان , ئەگـەر ئـادەمیزاد بـەم ڕاسـتی و دروسـتی‌یە هەڵنەستا ئەوە خۆی لە دونیای بەدنەكی و بێ چاو ڕوویی پەسـتیوەو ئـاخنیوە , دیـارە خودای پاك و تاكی بێ هاوتایی حەمید سپلەیی وبەدنەكی خۆش ناوێ‌و، وەك كەلـە دوا بەشی ئایەتەكەی پێشودا دەفەرموێ ﴿...وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴾ ابراهیم (٧ ) واتە:- ئەگەر سپلەو بەدنەك بن لە ئاسـت نیعمەتـەكانی خـوداو شـوكرانەو ستایـشی نەكەن , دژایەتی حەق و ڕاستی و فیطرەو بوونی خۆتان بكەن، ئەوا بە ڕاستی بە ساكاری و ئاسانیەوە لەسەرتان ناوەستێ بەڵكو عـەزاب و ئازارێكی زۆری بـێ ژومـاری نـەبڕاوەی خودایی بەش و بارتان دەبێ، ئەوەی جێگەی گومان نەبێ هەرچی هەیە لـە بونـەوەر لـە ئاسمانەكان و لە زەوی لە بڵندیان و لە نـەوی لـە ڕەش و سـپی لـە گـەورەو بـچووك لـە زەررەوە تامەجەرە لەگەل گشت نیعمەتە بێـژومارەكانی سـەر زەوی بەلایـەنانی مـاددی ومەعنەوی هەر گشتیان بەهرەی خوداین، داویەنی بە ئادەمیزادو بۆی رام و موسەخخەر كردوون، زاتێكی تر نیە بێجگە لە خودا خاوەنی هیچ شتێ بێ لە ئەصلا ئیـدی كەواتـە خودای حەمید سەرچاوەی نیعمەتەكانەو پێویستیشە هـەر خـۆی سەرچـاوەی شـوكرانەو ستایش بێ‌و حەمدو سوپاس بكرێ كەواتە هەر خۆی سـتایش بـۆ كـراوە حەمیـدە , لـە شوێن خۆیەتی كە هەر شوكرانەو حەمدی ئەو بكـرێ ، چـونكە هـەر خـۆی لـە ئەصـڵ

وینچینەدا سەرچاوەی هەر هەموو خێرو بێرو نیعمەتەکانە... دیارە ئەوەی شوکرانەی دەکات و حەمدی وی دەکات بە ماناو واتای خۆی ئەوە گەیشتۆتە پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو لە کۆلەگەی حەقەوە حالّی بووە، ڕێچکەو ڕێبازی مەخلوقات و بوونەوەری گرتۆتە بەرو، برەوی بەرەکەتی داوە بە حەق و عیلم و ویژدان و ماڵ و سەروەتەکەی، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ئاماژە بۆ گەورەیی و زۆری خێرو بێری ئەو کەسانە دەکات کە سەرگەرمی شوکرانە ژمێری وحەمدو ستایشی خودای حەمید دەکەن , کە ئەم فەرمودانە هەندێکیانن (عن ابی ذر (ر.ض) **قال : قال لی رسول الله** (ص) : **الا اخبرك باحب الكلام الى الله : سبحان الله وبحمده** ) رواه مسلم واتە لە ئەبو زەر ڕەزای خودای لێ بێ فەرموی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووم ئایا هەواڵت بدەمێ و پێت ڕاگەیەنم کە خۆشەویسترین کەلام و ووشە لای خودا کامەیە (**سبحانه الله وبحمده** ) واتە خودای گەورە پاکەو بێ گەردە دوورە لە هەموو کەم و کوری یەك وە هەموو حەمدو ستایشی هەر شایستەی ئەوە (**عن ابی مالك الاشعری –رضی الله عنه قال** : **قال** رسول الله (ﷺ) :**الطهور شطر الایمان ، والحمد لله تملأ المیزان، وسبحان الله والحمد لله تملان او تملأ ما بین السموات الارض** ) رواه مسلم واتە لە ئەبو مالیکی ئەشعەرییەوە (ڕەزای خودای لێ بێ ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی پاك وخاوێنیو هەبوونی دەست نوێژ نیوەی ئیمانە (الحمد للهو حەمدو ستایشی خودا کردن میزان و تەرازووی خێری ئادەمیزاد پڕ دەکاتەوە , (سبحانه الله)و (الحمد للە) بەینی ئاسمان و زەوی پڕ دەکەنەوە بۆ کەسانی بە دڵ وبە گیان ئەم زیکروو ویردە بخوێنێ...... (**وقال رسول الله** (ﷺ) **من قال سبحان الله وبحمده فی الیوم مائة مرة حطت خطایاه وان کانت مثل زبد البحر**) متفق علیە واتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێ ئەوەی هەموو ڕۆژێ سەد جار بلێ (سبحانه الله وبحمده) ئەوا خودای گەورە گوناهەکانی لەسەر ڕەش دەکاتەوە ئەگەر گوناهەکانیشی هێندەی کەفی دەریا بێت، هەروەها گەلێ فەرمودەی تر هەن لەم بارەیەوە گەورەیی ستایش و حەمد

کردنی خودا دەردەخەن ماناو واتـای گـەورەیی حەمیـدێتی خـودای حەمیـد ڕون دەکەنەوەو .... ( ئەوەی فەرمودەی زیاتر دەوێ لەم بارەیەوە با سەیری ریاض الـصالحین بکات (ص٤٠ ) جا ڕوو لە خودای گەورەو میهرەبان وحەمید دەکەین و پڕ بـە دڵ و بـە گیان دەڵێن ئەی نیعمەت دەری بێ قصور خاوەن بەخششی بێ سـنوور، ئـەوەی حەمـدو شوکرانەت ناکا خۆی بێ بەش دەکاتن لە نور، حەقی فیطرەو دەرمانی دەروون لە شوکری تۆیە دێتە هەبوون، تام و لەززەتی شوکرانەی تۆ دەچێژێتن دڵانی ڕوون، چی هەیە منـەت و ڕەحمەتت نەبێ خۆمان و گشت لای دانەگرتبێ ،یا کێ هەیە نیعمەتی بێ بەغەیری تـۆ خاوەن شتبێ، ئاسمان و زەوی بڵندو نەوی گەورەو بچوك ڕەش و سپی، چی زاهـیرەو چـی مەعنەوی هەر ئی تۆنە هەرچی هەبی، ئەوەی ناکات حەمـدو سـوپاس بـێ ئاگایـە لـە دەنگ و باس، دەردانی دەروونی زۆرن جەهەندەمیش تایبەتی وخاص...جا لە کۆتاییـدا دەڵێن ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِـدَيَّ وَأَنْ أَعْمَـلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُـسْلِمِينَ﴾ الاحقـاف (١٥)

## ٥٧ ـ المحصي

ناوێکه له ناوه دادپەروەرەکانی خوای سوپاس و ستایش بۆ کراو بنچینەی ئەم ناوە —احصا-یە واته حیساب کردن وسەرژمێری...

المحصي-واته ئەم خوایه سەرژمێری هەموو شتێکه جا چ کارو کردەوه بێ , یا عومرو تەمەن بێ , بێ ئەوەی میسقاڵێ له شتێکی له یاد بچێ یا فەرامۆش بکات بەڵکو سەرژمێری گشت شتێکه لەو رۆژه که بوونەوەری بەدی هێناوه تا ئەو رۆژەی که خوای خۆی حەز دەکات ... هەروەها خوای گەوره شتی بچوکیش ئەژمێریٚو حیسابی بۆ ئەکا , جا با ئەو شته لەمسقاڵه زەرەیەکیش بچوکتر بێ , وەکو پرۆتۆن و نیوترۆن و ئەلکترۆن , هەروەها کرۆمۆسۆمەکانی ناو ناوکی خانه زیندووەکانیش فەرامۆش ناکات و ئەیانژمێرێ و بەڕێوەیان ئەبات، هەروەها مانگەکان و خۆرەکان و ئەستێرەو کەشکەشانەکان گشتیان وا لەبەر ژمێری خوای گەورەن , وه کەسێ سەری دەرناچێ له چەن و چۆنیەتی سەر ژمێریەتی خودای گەوره , ئەمەش چەندەها حیکمەت و دانایی تیایه گەر هەندێکی لێ بزانین (لەوەی خوافێری کردووین ) ئەوه زۆریەی لێمان تا ناشکراو وونه...ئەم ئایەتانەش هەندێکن له باسی سەرژمێریەتی خوای گەوره وەك دەفەرموێ:- ﴿وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴾ الجن (٢٨) واته-خوای گەوره سنووری داوه بەو شتانەی وا له ژێر دەستیانەوەیه وه هەموو شتێکی به چاکی سەر ژمێرکردووه ... هەروەها دەفەرموێ ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ المجادله (٦) رۆژێ خوای گەوره گشتیان زیندوو دەکاتەوه , وه هەواڵیان پێ ئەدا به کارو کردەوەیان ، بۆیانی سەر ژمێر کردووه ئەمانیش له بیریان چۆتەوەو فەرامۆشیان کردووه... وه خوای گەوره هەموو شتێ وا لەبەر چاوی قودرەتیایه ئەیانبینێ و بەسەریانەوه شاهێده... هەروەها دەفەرموێ ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ ﴾ يس (١٢) واته- هەموو شتێکمان سەر ژمێر کردووه له نامەی ئاشکراو ڕوناندا, ئیمانداران دەزانن خوای گەوره سەرژمێری

گشت کارو فرمانێکە بۆیەوە هەرچی خراپ کاری و نا تەواویی هەیە ئەوان خۆیانی لێ لا دەدەن و، بە پیر کاری چاکەوە دەچن وخۆیان پێ ئارایش وجوان و بەرز دەکەن ،هەروەها لە فەرمودەی قودسی داهاتووە-کە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ خوای گەورە دەفەرموێ (یا عیبادي انما هي اعمالكم احصيها لكم ثم اوفيكم اياها فمن وجد خيرا فليحمد الله ومن وجد غير ذلك فلا يلومن الا نفسه ) رواه مسلم واتە- ئەی بەندەکانم بێ گومان ئەوە تەواوی کارو کردەوەی ئێوەیە بۆتان سەرژمێر دەکەم , پاشان بە پێی کردەوەتان و نیەتتان رەفتارتان لەگەڵا ئەکەم , جا پاداشتی ئەدەمەوە وە یا تۆڵەی لێ ئەسێنمەوە . جا ئەوەی بە پیر خێرێکەوە بچێت و بە چنگی بێنێ با سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکا , وە ئەوەی بەرەو کاری تر بڕوات و ئەنجامی بدات , با لۆمەی کەسێ نەکا تەنها نەفس و گیانی خۆی نەبێ...... خوای گەورەو میهرەبان سەرەڕای ئەوەی کە هەموو شتێکی سەرژمێر کردووەو دەیکاو وە هیچ شتێ هامشی گەڕەلاوژەو پەرت و بڵاو بێ حیساب نیەیە، بەڵکو گشتی حیسابی بۆ کراوە و ئەندازەی بۆ دارێژراوەو تقدیر کراوە , لە ژێر دەستەو فەرمانانی خودای شکۆمەند بەندەو زەبونە... وەکو خودای (محصي) لە سورەتی (القمر) دا لە ئایەتی (٤٩)و(٥٠) دا دەفەرموێ- ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ(٤٩)وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴾ واتە . ئێمەی خاوەن دەسەڵات هەموو شتێکمان بە ئەندازە و قەدەرو حیساب بەدیهێناوە، وە فەرمانی ئێمە جارییە هەر ئەوەندە بڕیار بدەین ئیدی لە چاوتروکانێ بەولاوە ناخایەنێ ئەمرو فەرمانی ئێمە بە شوێن خۆی دەگات. ئێمە کە موسوڵمانین باوەڕمان بە قەزاو قەدەر هەیە و روکنێکە لە روکنەکانی ئیمانمان لە ڕاستیی حاڵێن کە خوای گەورە خاوەن هێزی لەبن نەهاتووەو بە دەسەڵاتی بێ پایانی خۆی هەموو شتێکی خەلق کردووەو بەدی هێناوەو پاشان ڕێك وپێکی کردووەو پاشان بەڕێوەی دەبات و پاشان کۆتایی پێ دێنێ لە دونیای ماددەو عالەمی شەهادەتدا, جا ئەخشەی بۆ هەموو شتێ کێشاوەو کارەکانی پڕحیکمەت و داناپین وە زانیاری بە هەموو شتێ هەیە, زانیاری خوای گەورە هەر لەئەزەلەوە تا ئەبەد

دەورەی داوەو هیچ شتێ نییە لە دەرەوەی دەسەلاتی خودای بێ هاوتابێ، وە هیچ زانیاریێ نیە ئیللا ئەوە خودای گەورە خۆی هۆو ئەسبابەکانی بەدیهێناوەو خۆی پێی ئاگادارەو لەئەزەلا زانیاری پێهەبووە .. هەروەها لە باوەڕ بە قەزاو قەدەرەوە ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، کە هەرچی هەبووەو هەیەو دەبێ گشتی لای خوای گەورە نووسراوەتەوەو لە لەوحی مەحفوظ پارێزراوە , هیچ شتێ لە خوا شاراوە نیەو توانای بەر پێچ و پەنایان نییە... هەروەها ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئیرادەو خواستی پڕ حیکمەت و دانایی خودای گەورە لە ئارادابووەو لە ئارادایەو لە ئارادا دەبێ‌و، کەسێ توانای بەر پەرچدانەوەی نیەو ناتوانێ پەنجەی تیا بخات، ئیرادەو خواستی لە هەموو شتێکدا ئەصڵەو بنچینەیەو هەرچی ئەیکات نابێ‌و هەرچی ئەنجامی بدات ئەوە دەبێ وە هیچ کارێکی بێ حیکمەت و دانایی نییە، بێ زانیاریو ئاگاداری نیە، بێ دەسەلات و خواستی ئەوانیە، بەڵکو گشتی پێی ئاگادار بووەو ئەندازەی بۆ کێشاوەو تەقدیری کردووەو، هەروەها لە قەزاو قەدەر ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەرچی کارو کردەوەی دەستی مەخلوق و بەدیهێنراوەکانە وەهەرچی پەیوەندی بەوانەوە هەیە گشتی کارو خەلقی خودان لەژێر خواست و ئیرادەی دایە لە بازنەی پڕ حیکمەت و دانایی و خواست وئیرادەو دەسەلاتی خودا بە دەرنیەو، بەڵکو لە بازنەی دەسەلات وقەزاو قەدەری خودا دایەو، لە بنچینەدا حیسابی بۆ کراوەو نەخشەی بۆ دارێژراوە، بەپێی ئەو سونەنانەی کە حیکمەت و دانایی خودای بالاّ دەست دەیان خوازێ- وەك خودای شکۆمەندو (محصي) لە سورەتی ( الصافات) لە ئایەتی (٩٦) دا دەفەرموێ- ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ واتە-خوای گەورە خۆیەتی ئێوەی بەدیهێناوەو خەلقی کردوون هەروەها لە کارو کردەوەی ئێوەشی خەلق کردووە-چونکە هەر خۆی لە بنچینەو ئەصڵدا ئێوەو هێزو تواناو بیرتانی بەدی هێناوەو، هەروەها هەموو بە دیهێنراوەکانی تر کە هۆو ئەسبابی هەموو شتێکن هەر خودای گەورە بەدیهێناون و خەلقی کردوون. وە خوای گەورە لە کارو کردەوەو بیرو بۆ چوون و ئەندێشەی ئادەمیزاد بێ ئاگا نەبووە بەڵکو هەر لە ئەزەلا هەموو زانیاریەکی

لەلا بووە چ کەوتبنە ناو بیرو هۆش و دەروونەکان چ نزیك و دوور بن لە ئان وکات و شوێن و مەکانەکان... جا لە بارەی قەزاو قەدەرەوە هەردوو لایەنی خێرو شەر هەر بە دەست خودایە , خوای گەورە هەر خۆی (نافع)ە واتە سوود گەیێنەرەو وە هەر خۆشی (ضار) زیان لێ دەرە هەردوو لایەنی قەزا کردووەو ئەندازەی بۆ داناوەو سونەنانەی پڕ حیکمەت و دانایی خۆی تێدا دەور دەبینێ... وە ئەگەر بە چاوێکی ژیرانەو ووردبینەوە سەیری لایەنە شەڕەکان بکەین دەبینین لە ڕوانگەوە وەکو شەڕ دیارن لە ناوەڕۆکیشا گشتی حیکمەتن و دانایی وای دەخوازێ. وەك بڵێین سپی بە ڕەش دیارەو بەرزی بە نزماو چاکی بەخراپیاو ڕاستی بەناراستیاو ژیان بەمردناو نێر بە مێیاو خۆش بە ناخۆشیا شادی بە پەژارەوە خێر بە شەڕاو جوانی بە ناشیرنیاو زیرەك بە تەمبەڵا...هتد. پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ (ان الله عز وجل اذا اراد بعبد خيرا استعمله ، فقيل كيف يستعمله يارسول الله ؟ قال:يوفقه لعمل صالح قبل الموت ) اخرجه الترمذي بسند صحيح واتە خوای باڵا دەست ئەگەرخواستی خێرێ بکات بە بەندەیێ بە کاری دەهێنێ, ووتیان چۆن بە کاری دەهێنێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی : مووەففەقی دەکات بۆ کاری چاکە لەپێش مردنیا"...لەڕوانگەی ئەم فەرموودە دا دیارە پێچەوانەکەشی هەر ڕاستەو واتە ئەگەر خوای گەورە خواستی شەڕێ بکات بە بەندەێ لەبەر خراپ و بەدی خۆی ئەوە بەکاری دەهێنێ یا بڵێین جڵەوی بۆ شل دەکات لە ئەنجامدانی کارانی نابارو خراپ، جا ئادەمیزادی ئیماندار بەم ئیمانە پڕ ڕەحمەت و بەهرەیییە سەرگەرمی کاری خێرو چاکەیەو رزگاری بووە لە دەردوو بەڵای خۆزگەو بریاو ئەگەرو (ليت)ە و (لو) دڵی مطمئن دامەزراوەو، دەزانێ هەموو کارێ پڕن لە حیکمەت و وان لەدەستی خودای خۆشەویست و کارزان و کار لەجێیە، هەموو شتێکی سەر ژمێرکردووە ئەندازەی بۆ داناوە وتەقدیری کردووە لێیانەوە بێ ئاگانییە وەك دەفەرموێ ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنْ الْخَلْقِ غَافِلِينَ﴾ المؤمنون : ١٧ ...

## ٥٨ - المبدئ

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای ژمێرەر , بنچینەیی ئەم ناوه-بدأ-ه واته بیدایەت وسەرەتا . . .

المبدیء - واته ئەم خوایەیه بۆ سەرەتای بەدیهێنانی هەموو شتێ . وه سەرەتای بۆ هەموو شتێ داناوه خۆی بێ سەرەتاو کۆتاییەیه... خوای گەوره له هێنانەدی ئەم هەموو بونەوەره سست و ماندو نەبوەو نابێ , وەك و نادەمیزاد نییه به ئەنجامدانی کارو فرمانی ووزه سەرف بکاو پێویستی به کەرەستەی خاو بێ , هەروەها کەسی نەبووەو وه ناشبێ وه شایستەی ئەوەش نییه تێکەڵی چەندو چۆنیەتی کاری خودا بێ , جا لەبەر ئەوەی بوونەوەر سەرەتای هەبووەو دەبێ کۆتایشی هەبێ، بۆیه خوای گەوره هەر ئایەتێ باسی بەدیهێنانی کردبێ ئەوه یەکسەر باسی گەڕانەوەشی کردووه له زۆربەی ئایەتەکان , وەك دەفەرموێ ﴿إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ﴾ یونس (٤ ) واته به ڕاستی ئەو خوایه یه سەرەتای دەست پێ کردووه بۆ بوونەوەرەکان... پاشان گەڕانەوەیان هەر بۆ لای خۆیەتی... هەروەها دەفەرموێ ﴿قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ قُلْ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ یونس (٣٤ ) واته- بڵێ به هاوبەش دانەران ئایا کێ لەوانەی به هاوبەشانی خوای دەزانن بوونەوەری له سەرەتا بەدیهێنابێ‌و دوایی بۆ لای دەگەڕێتەوه؟!- بێ گومان واته کەسێ نییه-پێیان بڵێ خوای گەوره -الله- سەرەتای بوونەوەری بەدیهێناوه پاشان بۆ لای خۆی دەگەڕێتەوه چۆن بوختان و درۆ دەکەن... هەروەها خوای گەوره دەفەرموێ ﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ البروج (١٢ ) واته:- به ڕاستی هەر خوای گەورەیه سەرەتاو کۆتایی بوونەوەر ئەنجام دەدات، هەروەها دەفەرموێ ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِنْ طِينٍ﴾ السجدة (٧ ) واته خوای گەوره ئەو پەروەردگارەیه که هەموو شتێکی به جوانترین شێوه بەدیهێناوه وه سەرەتای بەدیهێنانی ئادەمیزادی له قوڕ دەست پێ کردووه، جا دەبێ ئەم سیفەتەی خوای گەوره زیاتر سوپاس و ستایشی سۆز وەرگرێ له دڵمانا کاتێ که ئاراستەی دەکەین

، چونکە هەر خۆی ئێمەی بەدیهێناوە رزق وڕۆزیمان دەداو کەسێ پەنجەیەکی تیا نیە،
وە سوپاس وستایشمان بریتی بێ لە باوەش کردن بە رێگەی خودای گەورە , بەو پەری
خۆشەویستی ودڵسۆزیەوە. نەك هەر بریتی بێ لە دەربڕینێکی سادەی ووشکی سەر
زاری، یان نووسین و هەڵواسینی بە دیوارەکان... هەروەها خودای باڵا دەست و
شکۆمەند لە سورەتی (العنکبوت) دا لە ئایەتی (١٨ —٢٢ ) دا دەفەرموێ ﴿ أَوَلَمْ
يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ(١٩)قُلْ سِيرُوا فِي
الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ
قَدِيرٌ(٢٠)يُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَنْ يَشَاءُ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ(٢١) وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ فِي
الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ واتە ئایا تێ
ناڕوانن بە چاوی ژیریو بیرەوە کەوا چۆن پەروەدگاری تاك و بێ هاوتایە سەرەتای
بەدیهاتن دەست پێ دەکات وەکو داروبارو شینایی‌یەکان هەروەها گیاندارو باڵندەکان
وحیوانات و ئاژەڵەکان تەیرو پەلەورەو ماسی دەریاکان لەسەروی هەمووشیانەوە
ئادەمیزادەکان , تێڕوانین لە سەرەتای بەدیهاتنی ئەم هەموو مەخلوقانە , دیاردەی
گەورەیی دەسەڵاتی بێ پایانی خودا دەردەخات و هەروەها بێ هێزیو دەستە وەستانی
ئادەمیزاد ڕوون دەکاتەوە لە زۆر ڕوو ولایەنەوە , ئەوسا پاش بەدیهاتنیان دەیان
گەڕێنێتەوە بەرەو کە نەفتی و سستیو جێهێلانی دونیای ماددەو بەدیهێنراوێتی.
لەمانەوە هەمووی ڕوون و ئاشکرایە کە کارانی بەدیهاتن و گەڕاندنەوەیان لای خودای
باڵا دەستی کار لە جێ ساکارو ئاسانە... هەروەها زاتی شکۆمەند بە پێغەمبەرە
خۆشەویستەکەی دەفەرموێ : پێیان بفەرموو بڕۆن بگەڕێن لەسەر زەویداو چاو بکەنەوەو
بۆی بڕوانن و دەسەڵاتی بێ پایانی خودا ببینن کە چۆن هەزارەها جۆرەها بەدیهێنراو
سەرەتایانی بۆ داڕێژتووەو بەدییان دەهێنێیو دەیانهێنێنە دونیای بوون و ووجودەوە ئەگەر
ژیریو بیریتان کار بکات تێی دەگەن کە ئەم خاوەن دەسەڵاتەو تواناداره ڕۆژی دوایش
بەرپا بکات سەر لە نوێ هەرچی خواستی لێ بێ بەدی بهێنێتەوە بەڵێ پاشان هەر
خودای گەورە خۆی ڕۆژی دوایی دێنێتە کایەوەو ئادەمیزادو جنەکان بەدی دەهێنێتەوە,

ئەو زاتە خاوەن دەسەلاتی لەبن نەهاتووەو تواناداره به سەر هەموو شتێکا , خواست و ئیرادەی پڕ حیکمەت و دانایی ئەو کێ رەحم پێ بکات رەحمی پێ دەکات وە کێش عەزاب بدات عەزابی دەدات گەرانەوەو چارەنووسی هەر بۆ لای ئەوە...جا ئێوەش ئەی ئادەمیزادەکان لەدەرەوەی دەسەلاتی خودانین , وە دەستی قودرەتی خودا هەرگیز لێتانەوە دەستەوەستان نییەو, هیچ بەر بەستێ نیە بەری بگرێت، جا ئەگەر لەسەر زەوی بن وەیانیش لە ئاسمانا بن, ئەوە هەردەم لە ژێر دەستی خودان و سونەنانی پڕ حیکمەت و دانایی ئەو بەسەرتانەوە دێتە ئەنجام وجاری دەبێ , جا ووریا بن وهۆشتان بێننەوە سەرەخۆو تێی بگەن کە بێجگە لە خودای گەورە کەسێکی تر دۆست و نزیك و پشتیوانتان نییە , وە سەر هێخەرو لایەن گرو توانا دارتان نییە... خودای گەورە کە ئیرادەی کرد مەخلوقێ بەدی بهێنێ ئەوە سەرەتاو کۆتای بۆ بڕیار دەداو ئەندازەو رێژەی بۆ دادەنێو سەرپەرشتیو ئاگاداری دەکاو دەیهێخته ژێر باری سونەنەکانی خۆی، کەپڕیەتی لە حیکمەت و دانایی وەلێیوە وەبێ ئاگاو غافلێ نابێ , وە دەستە وەستانیش نابێ لێیەوە وەژێر دەسەلاتی ئەویشا بە هیچ شێوەیێ دەرناچێ... جا بۆ ئادەمیزادی عاقڵی ژیر، دوربینی بەر چاو فراوان، حەق وویستی ئازاو نەبەرد، هۆشیارو زانا و ووردبین، زۆر پێویستە کەوا ئاگای لە خوای خۆی بێت, خۆی شارەزای سونەنانی خودای بکات هۆش و بیرو ژیان ونەخلاقی لەسەر برازێنێتەوە وە راستیەکان هەردەم لەبەر چاو بگرێ, وەك خودای گەورە لە سورەتی (الانسان) دا دەفەرموێ , ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا(١)إِنَّا خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا(٢)إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ واتە بێگومان زۆر ئان و زەمانێ رابووردن لە پێش ئەوەی ئادەمیزاد بەدی بێو خەلق بکرێو بێتە عالەمی وجودەوە شتێکی وا نەبوو باسی بکرێو یا ئێمە خۆمان ئادەمیزادمان خەلق کردو بەدیهێنا لە ئاوی مەنی تێکەلاو لە کانزای جیا جیا بۆ ئەوەی تاقی بکەینەوەو, جا چاو گوێچکەو هۆش وبیرمان پێی دا لەگەل ئەوەشا هەر ئێمەین خۆمان رێگا کانمان بۆ روون کردنەوە رێنمویمان کردن، ئەوسا یا رێگەی راستی و شوکرانەیی لە

ڕێگەی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) کە ئەنجامەکەی پیرۆزیو بەرزیو بەختەوەریو خۆشیيە وەيانيش ڕيگەی کوفرو سپلەيی و زوڵم وستەم کاری کە ئەويش ئەنجامەکەی هەر سەخڵەتی و نارەحەتی وخەسارەتی يە.. ئەی زاتی دەست پیّ کاری مەخلوقان تۆی پاکی چاکی ميهرەبان- تۆی پشت وپەنای پاك دڵان تۆی پشت شکێنەری زاڵمان- ڕوانگەی بەديهێنراوەکانت دەردەخا دەسەڵاتی بیّ پايانت- چ گەورەيی چ گچکەيی چ ڕەنگينی تێی داديارە کە خاوەنی بەخشينی- جێگای ئومێدو هيوای گەورە پياوانی ڕووت تیّ دەکەن دەت پەرستن بە جوانی- ئاخر چی هەيە دياردەی دەستی تۆ نەبیّ ياخود کیّ هەيە خاوەنەکەی تۆ نەبیّ- ياخود چی هەيە ببیّ بە ئيرادەی تۆ نەبیّ، ياخود چی دەبیّ ئەگەر تۆ مەيلت لیّ نەبیّ- فريامانکەوە لە دونيای زوڵم وجەهلا بۆی فريايی تۆ کەس نەجاتی نابیّ لە قەهرا- خۆشی ژيانمان بەوەيە کە تۆن هەبیّ ئەوەی تۆی نەبیّ ماڵی کاولە بیّ- ئەی خۆشەويستمان تۆی ڕازی دڵمان پاکی بیّ وێنە مەزنی کار جوان بەخشينی تۆيە دڵمان شاد دەکات هەموو ئاواتمان جیّ بەجیّ دەکات ...

## ٥٩ - المعيد :

ناوێکە لە ناوەکانی خوای سەرەتا دانەری گشت شتێ , بنچینەی ئەم ناوە-عود-ە بە واتە گەڕانەوە...

المعید- واتە ئەم خوایە هەر چی دروست کراوانی هەیە دوای ئەوەی جۆرەها تالو گۆڕیان بەسەردا دەهێنێ دەیان گەڕێنێتەوەو هەڵیان دەگرێ وەکو چۆن لەسەرەتاوە بوون, وە وادەو پەیمانی داوە ئەم کارە ئەنجام دەدات وەکو دەفەرموێ ﴿ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴾ الانبياء (١٠٤ ) واتە- ڕۆژێ ئاسمان دەپێچینەوە وەك پێچانەوەی سجلی کوتوب , چۆن سەرەتا بەدیهێنانمان دەست پێ کرد ئاواش دەیگەڕێنینەوە , وادەیە لەسەرمان , ئێمە خۆمان ئەنجامی دەدەین, داوا لە نادەمیزاد دەکا کە هەر ئەو بپەرستن و هاوار لەو بکەن و ئاین و بەرنامەکان هەر لەو وەربگرن و دڵسۆز بن بۆی , هەر وەك چۆن لەسەرەتاوە دروستی کردوون سەر لە نوێ زندووتان دەکاتەوە , وەك دەفەرموێ:- ﴿ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾ الاعراف (٢٩) وە خوای گەورە بە نادەمیزاد ڕادەگەیەنێ کە ئێمە ئێوەمان لە زەوی دروست کردووە وە ئەتان خەینە ناو زەوی وە جارێکی تر لە ناویەوە دەرتان دەهێنینەوە وەکو دەفەرموێ ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى ﴾ طه (٥٦ ) هەروەها دەفەرموێ ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ﴾ الروم (٢٦) واتە- هەر وەك و خوای گەورە لە سەرەتاوە بەدهێنەری گشت بوونەوەرەکان بووە هەر خۆشی دەیگێڕێتەوە بۆ هەر بارو دۆخێ کە خۆی ویستی لەسەر بێ, وە گەڕانەوەشی لە ڕاستیدا ئاسانترە... ئەم سیفەتەی خوا دەبێ ئەوەمان لە یاد بچەسپێنێ کە چارەنووس و گەڕانەوەمان بۆ لای ئەوە وە هیچ چارەو مەفەرێ نیە, وە کەسێ نیە بە غەیری خوای گەورە بکەوێتە فریامان و بێ بە هاوارمانەوە, لەوێ ڕۆژی لەبەر دادگا خوای گەورە تۆسکاڵی لە خێرو شەرخۆیان ناشارنەوە و وون نابێ خوای گەورە لە سورەتی (الاسراء ) دا لە ئایەتەکانی (٤٩ —٥٣ ) دا دەفەرموێ:- ﴿ وَقَالُوا أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا وَرُفَاتًا أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا(٤٩)قُلْ

كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا(٥٠)أَوْ خَلْقًا مِمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ فَسَيَقُولُونَ مَنْ يُعِيدُنَا قُلْ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَى هُوَ قُلْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَرِيبًا(٥١)يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ وَتَظُنُّونَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً(٥٢)وَقُلْ لِعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنــزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلْإِنسَانِ عَدُوًّا مُبِينًا ﴾ واته:- بێ باوەڕان و لە خوابێ ئاگایان ووتیان ئایا ئێمە ئەگەر بووینە ئێسقان وخۆر وورد بووینەوە لەزەویدا سەر لە نوێ بەدی دەهێنرێینەوە ؟! پێ یان بفەرموو ئەگەر بن بە بەرد یا ئاسن و پولا یا بن بەو بەدیهێنراوەی کە بە دڵی خۆتان پێ تان وایە باشترین یا گەورەترین یانە ئەوە هەر خودای گەورە سەر لە نوێ خەلقتان دەکاتەوە , جا لێرە بەولاوە دەڵێن کێ ئێمە بەدی دەهێنێتەوەو خەلقمان دەکاتەوە؟! بفەرموو بلێ ئەو زاتەی لەسەرەتاوە بەدی هێناون یەکەم جار, جا بەو وەلامە سەر دەلەقێنن بەسەر سورمانی و ناڕەزایی دڵ وگاڵتەوەوە دەڵێن ئەوە کەینێیە ئەو زیندوو بوونەوە؟! بفەرموو بلێ ئومێد وایە کە نزیك بێ ڕۆژێ پەروەردگار بانگتان دەکات بۆ زیندوو بونەوە بۆێی دەستی خۆتان بە وەلامیەوە دەچن بە ستایش وحەمدەوە ئەو کاتە ظەن وگومانتان دێتە سەر ئەوە کە تەنها کەم ماوەیێ لە دونیادا ماو بوونەتەوە, ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بفەرموو بلێ بە بەندەکانم چاك گوفتارو ووتار بن زۆر هوشیارو بیدار بن چونکە بە ڕاستی شەیتان لە هەوڵی ئەوە دایە جیایی بخاتە نێوانتان و دڵتان لێ لابداو ناکۆکی بخاتە بەینتانەوە, چونکە بە ڕاستی ئەم شەیتانە بۆ ئێوەی ئادەمیزاد دوژمنێکی سەر سەختی ئاشکرای دیارە... لەوانەیە هەندێ لە ئادەمیزادەکان لە ئەنجامی بیر کردنەوەیەکی نالەجێ و نادروست بیری خۆی بەڕ بەست بۆ دروست کرد بێ لە باوەڕ هێنان بە ڕۆژی زیندوو بوونەوە, لەوانەیە لە بیرکردنەوەکەیا واحاڵی بوو بێ کە خوددی خۆی یا خوددی ئینسان داوا لێکراوە کە هەڵسێ بەم کارە (کە زیندوو بوونەوەیە) کە ئەمەش لە توانای ئادەمیزاد نیەو سەرەنجام پێی کارێکی مەحاڵ وموستەحیلە , نازانێ یا لێی بێ ئاگایە ئەوەی ئادەمیزادەکان زیندوو دەکاتەوەو دەیان گێڕێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی کاری خودایە وادەی خودایە, بەلێ ئەم خودایەی ئەم

ئاسمانانەی بەدی هێناوە ئەم خودایە ئەو هەزارەها کەشکە شان و مەجەرەی بەدی هێناوە کە هەزارەها ئەستێرانی تیان ئەو خودایەی ئەم رۆژو مانگ و زەوییەی خەلق کردووە ئەم خودایەی ئەو هەموو مەخلوقاتە بێ ژمارەی بەدی هێناوە ئەم خوایەی هەموو ساڵێ ئەو هەموو گژوو گیاو دارستان و باخچە و دارو بارانە زیندوو دەکاتەوە, وەك دەرسێك بۆ ئێمە, ئەو خودایەی هەموو شەوێك ئەو هەموو ئادەمیزادانە دەمرێنێ دوای بەیانی ئەوەی خواستی لەسەر بێ زیندووی دەکاتەوە ئەم خودایەی ئاوو هەواو بەرزی نزمی بەدیهێناوە...وەك دەفەرموێ ﴿ لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لآ يَعْلَمُونَ ﴾ غافر (٥٧) واتە بێگومان بەدیهاتنی یا خالق بوونی ئاسمانەکان و زەوی گەلێ گەورەترو مەزنترە لە بەدیهاتنی خەڵکان ومەردووم بەلاّم زۆرینەی خەڵکان نایزانن,! هەروەها خودای گەورە لە سورەتی (الاحقاف)دا لە ئایەتی (٣٣) دا دەفەرموێ ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ واتە ئایا نابینن بە چاوی ژیری و بیریان کەوا خودای گەورە خۆیەتی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە, وە لە بەدیهاتنیان ماندی بوون وسستی بەسەر دانەهاتووە ئەوە نییە گشتی لە شوێن خۆیایەتی وکەم وکوری و نەقوستانی تیا نەکەوتووە , وە ماندوش نابێ نەوەتە چەندەها هەزار ساڵە ڕای گرتوون وبەڕێوەیان دەباو سەر پەرشتیان دەکا, جا خاوەن ئەو دەسەلاّتە لەبن نەهاتووەش بێ توانا دارەکە مردوو زیندوو بکاتەوە, بەڵێ بە ڕاستی خۆی لەسەر هەموو شتێ توانا دارە... ئادەمیزاد بە مردنی, قیامەتی دەست پێ دەکات , جا ئەو کاری چی هەیە لەسەر ئەوەی کەی خودای گەورە مردنیش بەسەر هەموو کەون و بوونەوەرا دێنێ, ئا ئەوا ئی وی دەستی پێ کرد, مردنیش کارێکی بێ شك وگومانە, بەلاّم ئادەمیزاد لەبەر مەشغول بوون بە دونیاو لەو ئاتی شەیتان بیری بردۆتەوە, دەنا قەبر یەکەم شوێنگەی دوا رۆژە وە دوا شوێنگەی دونیایەتی، هەر لەوێوە دەست پێ دەکات بە وەرگرتنەوەی ئەنجامی کاری دونیایی وەك لەم فەرموودانە دا دەردەکەوێ ( القبر اول منــزل من منازل الاخرة) اخرجه الترمذي بسند حسن .واتە گۆڕو قەبر

یەکەم شوێنگایە لە شوێنەکانی رۆژی دوایی هەروەها دەفەرموێ ( **فان نجا منه فما بعده ایسر منه وان لم ینج منه فما بعده اشد منه** ) واتە ئەگەر لە قەبرا رزگاری بێ لە سوئالی نەکیرو مونکەر ئەوە ئەوەی لە پاشەوی دێ ئاسان ترە، وە ئەوەی لێی رزگار نەبێ ئەوا هەر چی لە پاش ئەو دێ ناخۆشترو سەخت ترە، جا برایانی ئادەمیزادی خۆشەویست ئەوە بە چاوی خۆمان دەبینین کە خودای گەورە ماوەو ئەجەلی بۆ هەر ئادەمیزادێ دیاری کردووە بڕیاری داوە هەروەها هەر خۆشیەتی دەیان گەڕێنتەوە هەر خۆشیەتی (المعید)ە، با مەردی خودابین و دەست بە بەرنامەکەی خوداوە بگرین و هەوڵ دەین ڕوو سوری قاپی رەحمەتی خودابین و بزانین کە زۆریشی نەماوە خودای گەورە ئێمەش بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە...

## ٦٠- المحيي

ناوێکه له ناوەکانی خوای گەڕێنەرەوە , بنچینەی ئەم ناوە-حیاة-ە واته زیندەگی و ژیان ... المحي- واته خوای گەورە ژیان بەخشە بە هەر زیندە بوێ هەرچۆنێك و چەنێکی بوێ بە وویست و خواستی خۆی , جا زیندەوەرە بچووکه کان بێ یان گەورەکان بێ, زیندە دیارەکان بێ یا زیندە نادیارەکان، لەسەر ووشکایی بێ یان لەناو دەریا بێ، یا جۆرەهای شینایی وە سەوزایی بێ, وە هەر چی بوونەوەرە هیچ کامێکیان ژیان بەخش نین و ژیانی هیچ کەسێکیشیان بەدەست نیەو وە گشتیان لەلای خوای گەورەوە ژیانیان پێ بەخشراوە تەنانەت چەن و چۆنایەتی ژیانی خۆشیان بە دەست نیە چ جای ژیانی غەیری خۆیان. وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ﴾ الحجر (٢٣) واته- بێگومان ئێمە خۆمان ژێنەرو مرێنەرین, وە خۆمانین خاوەن کەل و پوری هەموو کەسێو شتێین... هەروەها ڕوو بەێ بڕوایان دەفەرموێ:- ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ البقرة (٢٨) واته- چۆن و لەبەر چی نیعمەتانی خوا دەپۆشن و بێ باوەڕ دەبن بە زاتی خوای گەورە, ئێوە بێ ژیان و مردوو بوون ئێوەی هێنایە بوون و ژیان, پاشان ئەتان مرێنی پاشان زیندووتان دەکاتەوەو پاشان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.. خوای گەورە ژیانی تەواو خۆش و بەلەزەتی بە ئیمانداران بەخشیوە وەك دەفەرموێ ﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ﴾ النحل (٩٧) واته- ئەوەی چاکە کاری ئەنجام بداو خاوەن باوەڕ بێ جا پیاو بێ یا ئافرەت بە ڕاستی ئەیژێنین و بەژیانێکی باش و خۆش و پاك , بەلاّم خوای گەورە تام و لەزەتی هەلگرتووە لە ژیانی بێ باوەڕان و کافراندا, هەر چەندە بە ڕوالّەت لە ژیاندان بەلاّم ئەم ژیانەیان وەکو مردوو وایە چونکە بێ تام و بێ ئەنجامە سەرەڕای بەدبەختیشیان , وەك دەفەرموێ : ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴾ واته ئەوەی پشت بکاتە یادو قورئانەکەم بە ڕاستی بۆی هەیە ژیانێکی تەنگ و ناخۆش, سەرەڕای ئەوەش بە کوێرەیی حەشری

دەکەین لە ڕۆژی قیامەتدا... هەروەها گشت گیانـدارانی تـریش شایـستەی تێـڕوانین و بیرلێ کردنەوەن کە هەزارەها جۆرن بە هەزارەها جـۆری ژیـان بەسـەر دەبـەن، گـشتیان هێمای ژێنەرێتی خودایان بەرز کردۆتەوە بۆ بیرو ژیرو هۆشی خـاوەن هـۆش و بـیران... ئەوەش فەرامۆش نەکەین کە ژێنەرێتی خودای میهرەبان لـە سـنوورێکەوە نەوەسـتاوەو ناوەستێ وەلە جۆرێکەوە یا لە چەند جۆرێك جۆری ژیـان ناوەسـتێ, وە لـەو سـنوورەش ناوەستێ کە دونیای مادده گرتویەتیە باوەشی خۆی, بەڵکو لە دەرەوەی دونیای ماددەش ژیان هەیەو ئاسۆکەی فراوانە وەك بڵێین ژیـانی جۆرەهـا فریـشتەو مەلائیکەتـەکان کـە چەندین جۆرن جۆرەها ژیـانی جـۆراو جـۆر بەسـەر دەبـەن, کـە گـشتیان مانـاو واتـای ژێنــەرێتی خــودای میهرەبــان فــراوان دەکــەن ودەســەڵاتی بــێ پایــانی ئــەو ڕوون دەکەنەوە...هەر بەم شێوەیەش ئەگەر سەیری ئەو زانستە بکەین کە لە بـاس و خواسـی ژیانی جۆرەها پەریەو جنۆکە دەدوێن ئەمانیش بە هەموو جۆرو باسیانەوە زیـاتر مانـاو واتای ژێنەرێتی خودای ئازیز مان بۆ ڕوون دەکەنەوە, وە زیاتر دەسەڵاتی بەر فراوانی بێ پایانی ئەو زاتەمان بۆ دەردەخەن... ئازیزان ئەوەی زۆر گرنگ بێ بۆ ئێمەی ئـادەمیزاد بیزانین , ئەوەیە کە بە حەقیقەت تێی بگەین بۆ چی خودای گەورە ئەو ژیانەی بە ئێمـە بە خشیوە؟ وەڵامـەکەشی هەر لەلای خۆیەتی وەك کە لە سورەتی (الملك) دا لـە ئایـەتی یەکەم و دووەمدا دەفـەرموێ ﴿ تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُـوَ عَلَـى كُـلِّ شَـيْءٍ قَدِيرٌ(١)الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴾ واتە- پاکی و بەرزی و پیرۆزی بۆ ئەو زاتەیە کـە خـودای میهرەبانـە هـەموو مولـك و سامان و بە دیهێنراوەکان لە دەست خۆیەتی و هەر خۆی لەسـەر هـەموو شـتێکا توانـا دارە هەر ئەو زاتەشە مردن و ژیانی بەدیهێناوە بـۆ ئـەوەی تاقیتـان بکاتـەوە کامـەتان باشـترین وچـاکترین کـارو کردەوانێـك ئـەنجام دەدات, وە ئـەم زاتـە میهرەبانـە خـۆی شکۆمەندو لێ بووردە و لێخۆش بووە, هەروەها ئەوەی زۆر گرنگ بێ بزانین ئەوەیـە کـە ئێمە بە قەد ئەو کەونە فراوانە قەرداری خوداین و پێویستە بەقەد ئەو کەون و بوونەوەرە خودا مان خۆش بوێ وزیاتریش, چونکە خودای گەورە ئەو کەون و بونەوەرەی بۆ خـاتری

ئێمە بەدیهێناوەو گشتی بۆ ئێمە رام وموسەخخەر کردووە, وەك و لە کتابە پیرۆزەکەی ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو لە سورەتی (الجاثية) لە ئایەتی (١٣) دا دەفەرموێ ﴿ وسخّر لكم مافي السماوات ومـا في الارض جميعاً منـه إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ﴾ واتە زاتی ژێینەری شکۆمەندە بۆ ئێوەی رام و موسەخخەر کردووە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و بە هەرچی لەسەر زەویدان هەر گشتیان, بە ڕاستی لەمەدا نیشانان و ئایاتانی زۆرن لەسەر گەورەیی‌و بەخشندەیی‌و دەسەلاّت بێ پایانی خودای میهرەبان بۆ گەلێ کە بیرو هۆشی خۆیان بە ڕاستی‌و بەرێی دروست وە گەر خەن... هەروەها ئەوەی گرینگ بێ بزانین و وەلێی دلنیا بین , لەو ڕاستیەیە تێ بگەین و دلنیابین کە خودای گەورەو ژێنەر, لە پاشی مردنمانا سەر لە نوێ دەمان ژێنیتەوە چونکە خۆی ژێینەرەو وە لەسەر بیرو باوەڕو کارو کردەوەکانما موحاسەبەمان دەکاو پاداش وتۆلەی سەختی لەلایە, بۆ خاوەن بیرو باوەڕی تاك پەرست وخودا ویست پاداشی وبەرزی پیرۆزی پێ دەبەخشێ, وە بۆ کەسانێ کە هاوبەشیان بۆ خودا بڕیارداوەو زولم و ستەمیان کردووە گوێ رایەلی نەفس وشەیتانیان کردووە لە جیاتی گوێ رایەلێتی کتاب وبەرنامەی خودا, ئەوا خودای ئازیز تۆلە یان لێ دەسەنێ‌و دەیان خاتە دۆزەخەوە بۆ هەتا هەتایە, خودا پەنامان بدات بە ڕەحمەت... بەرێزان با ژیانی جۆرەها دارو بارو گژو گیاو گوڵ ورەیحان و بەوەی لە باخ وبیستانەکان دا هەن ئەوانیش هەموو جۆریان, ژیانی کارامەو جۆراو جۆریان کەوتۆتە ئەستۆ بۆ خزمەتی ئێمەی ئادەمیزاد, بە ڕاستی بیر کردنەوە لێیان ماناو واتایی ژێنەریتی خودای گەورە لە ئاسۆی فکرو بیر فراوانتر دەکات, لە هەمان کاتیشا ئاسۆی بەر فراوانی دەسەلاّتی بێ پایانی خودای ژێینەرمان زیاتر بۆ گوشاد دەکات وحالیمان دەکەن بە زوبانی حالیان کە زاتی ژێینەر زاتی (رب العالمين)ەو خاوەنی ناوە جوانەکانەو دەسەلاّت بێ پایانەوە بەخشندەو میهرەبانە, هەروەها خودای گەورە ژێینەری دلانە, دلاّنێك دەبوژێنێتەوە نورو هیدایەتیان پێ دەبەخشێ بە نوری ئیمان ئەو دلانە کە شایستەن بە گیانی ئیمان دەیان ژێنێ وەك دەفەرموێ ﴿ أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ

مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ الانعـام (١٢٢) ئايـا يـەكێ دڵ مـردوو بێو جا ژیان و نـوورو هیدایـەتمان پـێ بەخـشیبێ بـەم نـوورو هیدایەكـەوە لـەناو خـەڵك ومەردووما هاموشۆ بكات وەك یەكێ تر وایە كە ناو گومرایی‌و تاریكاییاندابێ و لێـی دەر نەچێ, ئاوەها جوان كراوەو بۆ بێ باوەڕان و كافران لەو كارو كردەوانەی كە دەیكەن, خودای گەورە ژیێنەری نیمانە لە دڵ و دەروونەكان دەیان پارێزێ و بۆیان زیـاد دەكـات, ژیان و بوونی خودای ئازیزو بەردەوام بوونی هەر بۆ خۆیەوەیە, بەڵام ژیان بـوونی گـشت گیان لەبەران بـەردەوام بوونیـان بـە خۆیانـەوە نیـەو بـەڵكو بـە هـۆی خـوای ژیێنـەرو بەدیهێنەرەوەیە, وە ڕوون و ئاشكراو دیاریشە كە ژیان و بـەردەوام بـوونی پێداویـستانی زۆری پێویست و گەرەكە جازاتی ژیێنەر گشت پێداویستیەكانی بەدی هێناوە وەكو ئـاوو هەواو كات و زمان و شوێن و مەكان و خواردن وخۆراك وبینین و بیستن وتواناو هـۆش و بیرو وە هەموو پێداویستەكانی تری ماددیات و مەعنەویان, وەك خودای شـكۆمەند لـە سورەتی ( ابرهیم) دا دەفەرموێ ﴿ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴾ (٣٤) واتە خودای خالیق وژیێنـەر پێداویـستیانی ژیانی بۆ مایەسەر كردوون, لەوەی ژیانتان دەیخوازی وەیا بڵێن لەوەی داواشتان نەكردووە جا بە ڕاستی ئەگەر نیعمەتانی خودای شكۆمەندی ژیێنەر بـژمێریت ئـەوە هێنـدە زۆرە لەبەر زۆریان نا ژمێردرێ, ژیرو بیرو عەقڵ و زانستی ئادەمیزاد ناتوانێ گشت تێ بگـاو دەركی بكات, جا بەڕاستی ئادەمیزاد زۆر ستەم كاری سفلەی نیعمەت پۆشـی بـێ چـاو ڕووی بێ باوەڕە...ژیێنەرێتی خودای بەدیهێنەر ئـەو كاتـە زۆرتـرو فـراوانترو گـەورەتر دەكەوێتە بەر چاوی ژیرو بیر كە ئادەمیزاد بڕوانێ‌و بیربكاتەوە لە جۆرەها گیان لەبەرانی بچوكی جۆراوجۆر لەوەی بە چاو دەبیندرێ لەوەی بـە چـاو نـادیترێ بـە هـۆی ئـامێراو وردەبینەكانەوە نەبێ, جا لەوانەی لە ژێر دەریان یا لە چۆڵ و بەریان یا لە ژێر زەوین یـا لەناو بەردو چیاو شوێنە شاراوەكانن.هەروەها لە گیاندارە گەورەو مەزنەكانی نـاو دەریـا وەكـو نەهـەنگ و جۆرەكـانی یـا ئەوانـەی سـەر زەوی وەك فیـل وحوشـترو گـامێش وجۆرەكانیان, یا لە باڵندەو مەل و هاوڕێنەكانیان ......

## ٦١ ـ المميت :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای ژێنەر، بنچینەی ئەم ناوە-مَوْت-ەواتە مردن وگیان دەرچون ...

الميت- واتە ئەم خوایە مرێنەری هەموو گیان لەبەرانە بە هەر جۆرو نەوعێکیان بێ، وەك وخۆی چۆن لەسەرەتاوە بەدیهێناوە ئاوەهاش کۆتایشیان پێ دەهێنێ وەکو دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ ﴾ التوبة (١٦) واتە بە ڕاستی بۆ خوای گەورەیە مولکی ئاسمانەکان و زەوی هەر خۆشی ژێنەرەو مرێنەرە بە خواست وویستی خۆی بە هەر زیندە بوێ کە بیەوێ... هەروەها دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ ﴾ غافر (٦٨) واتە ئەو خوایە خۆیەتی ژێنەرو مرێنەرە وە ئەگەر فەرمانێ بڕیار بدا، لەگەل دەربڕینی فەرمانەکەی کارەکە ئەنجام دەدرێ بە چاو تروکانێ... ئەم سیفەتەی خوای گەورە وەکو چەند سیفەتێکی تر- المحي، المبدئ ،المجيد،.. هتد. هەر شایستەی خوای مەزن و بێ هاوتان ... هەرچی ئادەمیزادانی گومڕا ئەی پەرستن (لە هەواو، ئارەزوو، بەرژەوەند، مادده، سروشت، ئادەمیزاد، گا، نیشتیمان، ...هتد) لە جیاتی خوای گەورە، بێ دەسەلات وهیچ لێ نەهاتوون چیان پێ دروست ناکرێو خۆیان دروست کراون، وە تەنانەت بۆ خۆشیان لێ نەهاتوون، نە سوودوو نە زیان نە مردن و نە ژیان و نە زیندوو بونەوە هیچ کام لەمانەیان لە دەست دانییە ، بەلکو لەناو خۆیان گومڕاو سەرلێ شێواون ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:- ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لاَّ يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا وَلاَ يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلاَ حَيَاةً وَلاَ نُشُورًا ﴾ فرقان (٣) واتە بێ جگە لە خوا پەرستراوێ تریان گرتووە، هیچیان بەدی نەهێناوەو خۆیان بەدی هێندراون، وە بۆ گیانی خۆشیانا سودێك و زیانێکیان بە دەست نییە، وە مردن و ژیان و زیندوو بونەوەیان پێ ناکرێ و لە دەسەلاتی وان نییە، بەلکو ئەمانە تایبەتن بۆ دەسەلاتی لەبن نەهاتووی خوای گەورە ،... وە چەندەها ئایەتی تر هەیە لە قورئانی پیرۆزا دەست

نیشانی ئەوە دەکەن کـە خـوای گـەورە هـەر خـۆی ژیـان بەخـشە بـەبێ گیانـان , وەك دەفـەرموێ:- ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ الحج (٦) واتە- بێ گومان و بەڕاستی خودای گەورە خـۆی هـەق و ڕاسـتەو هـەر خـۆی مردوان زینـدوو دەکاتەوە, لەسەر هەموو شتێ بە توانایە... جا خاوەن باوەڕان لـە بـیری ئەوەدان کە هیچ هێزێ نیە جگە لە خوای تاك وتـەنها بتوانێـت سـاتێك ئـادەمیزاد لـە مردن نزیك بکاتەوە یا دەست کاری ژیانی بکات لە سودو زیاندا, یا ساتێك لە تەمـەنی زیاد بکا.. دەبێ موسولمانان بەم گیانەوە بچێتە گۆڕەپان و مەیدانی ژیان لە هـیچ هێـزو دەسەلاتێك نەسڵەمێتەوە, وە هەمیشە لە یادیا بێ کە خوای گەورە لە پـشتی سـەریەوە چاودێری دەکات, وە هەر چی خوا ویستی لەسـەر بـێ رەت ناکرێتـەوە دواوە.. وە چـاو نەترسی و ئازایەتی هەروەها چاوتێریو قەناعەت ودڵ و دامەزراوی وە رزگـار بـوون لـە نەخۆشیە دەرونیەکان گشتیان بەرو بومی ئەو زانیارییە ڕاستەقینەیەیە لە دڵ ودەروونی ئیمانداراندا... ئەگەر سەیرێکی ڕابردوو بکەین لە مێژوودا, زۆر بـە جـوانی و فراوانـی دەسەڵاتی بێ یانی خودای گەورەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە بە تایبەتی لە بارەی مرینـەرێتی خودای هەمیشە زینـدوو بـۆ گیـان لەبـەرەکان, شـوێنەوارو ئاسـەواریان دیـاردەی ئـەم سیفەتەی خودای ئازیزو شکۆمەندە, وە تاك وفکرو بیر فراوان تر بـێ لـە ڕووی جۆرەهـا گیان لەبەرەکان لە بچوك وگەورە یا لە دیارو نادیار زیاتر مانای ژیێنەرێتی ومرێنەرێتی خودای باڵا دەستمان بۆ دەردەکەوێ .خودای بـاڵا دەسـت مـردن وکۆتـایی پـێ هێنـانی کردۆتە بەشی هەموو مەخلوق وبەدیهێنراوەکان, هەر جۆرو بەشی یا هەر تاکەو نـەوعی لە کات و زەمانی مـاوەو ئەجـەلی خۆیـدا دەبـێ بگـات بـە کۆتـایی ومـردن,دونیـای شەهادەت بەجێ بێڵێ وەك وخودای هەمیشە ڕاستگۆ لە سورەتی (الرحمان) دا لە ئایەتی (٢٦-٢٧) دا دەفـەرموێ ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ(٢٦)وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّـكَ ذُو الْجَـلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾ واتە هەرچی هەیە لە دونیای بوون ئەنجامەکەی کۆتایەو مردنـە هـەر زاتـی شکۆمەندی هەمیشە زیندوە دەمینێتەوەو خـۆی خـاوەن کـەرەم وریـزو پیرۆزیـو پـاکی

ویەرزی‌یە, خاوەن بەرزی‌و دەسەلاّت وگەورەیی یە... مردن ومانای مـردن لای هـەموو کەسێ ڕوون و ئاشکرایە لای زاناو نەزان پادشاو گەدە وەزیرو گزیرو بـۆ هەموانـە وەك و یەك, بەلاّم ئەوەی گرینگ بێ ئادەمیزاد بیزانێ و لێی دلّنیابێ بـاوەڕ کـردن و ئاگـادار بوونە لەوحەقیقە تەی کە خودای گەورە هەر خۆیەتی ژیان ومردن بەڕێ دەکات لـە سـەر بە دیهێنراوەکانی , وە هەر چەندە بە ڕوالەت و زاهیر ئەم حەقیقەتە دیار نی‌یـەو غەیبـە یا لە دەست وکاری مەخلوقانی ترەوە دەبینـدرێ, بەلاّم ڕاستی‌یەکەی ئەوەیـە گـشتی لای پـەروەردگاری بـەرێوە بـەر تەقـدیر کـراوەو ئەنـدازەی بـۆ دانـاوەو کـارو کـردەوەی بەدیهێنراوەکانیش هەر خۆیەتی خـەلقی کـردوون وئـەنجامی دەدات بـەو پـەری زانـایی وحیکمەت و دانایی‌یەوە وەك دەفـەرموێ ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَـا تَعْمَلُـونَ ﴾ الـصافات (٩٦).. واتە-خودای گەورە ئێوەو ئەو کارو کردەوەی ئێوە دەیکەن گشتی بـەدیهێناوە-هەروەها خودای شکۆمەند مرێنەری دلّی

زالّمـان وسـتەمکارانەو ئیمانیـان لێ دادەڕنێـو هیدایـەت و نوریـان لێ دوور دەخاتەوە, هەروەها دلّی ئەو کەسانەش لە ئیمان دەمرێنـێ کـەبێ بـاوەڕی دەردەبـرن و پشت دەکەن لە بەرنامەو پەیامە پیرۆزەکەی, هەروەها لە شـیرینی وحـەلاوەی یـەقینی‌و دلّنیای بێ بەش و مەحرومیان دەکات, چونکە لای خودا ئەو کەسـە مـردوو حیـسابەکە گیانێکی زیندووی ئیماندارانەی نیەو ڕووی لە یەقین وهەق وداد پەروەری نی‌یە, هەروەها یەکێ خاوەن ئیمان وکارو کردەوەی چاك بێ‌و لە ڕووی حەق و یەقین بێ ئەوەی لای خـودا زیندووە , ئەگەر گیانیشی لاشەو بەدەنی بەجێ بێلێ‌و بگاتە دونیاو عالـەمی بـەرزەخ , وەك خوای گـەورە لـە سـورەتی ال عمـران دا لـە ئایـەتی (١٦٩) دا دەفـەرموێ ﴿ وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُـونَ ﴾ واتـە:- وا حیساب دەکەن ئەوانەی لە ڕێگەی خودا کوژرا بن مردوون نەخێر ئەوانە زیندوونەو لەلای پەروەردگاریان رزق و ڕۆزیان پێ دەدرێ, دیارە هەندێ تـر هـەن لـەناو ئیمانـداران پلـەو پایەیان لە شەهید بەرزترە وەك و پێغەمبەران و زانایانی‌ئـاینی چـاکە کـارو, وە ئـەوان

کەسانەش کە بە دڵ داخوازی شەهادەتن ئەوا خودای گەورە دەیان گەیێنێ بە پلەو پایەی شەهادەت ئەوسا با لەسەر جێگاو باڵە خانەی خۆیان بمرن و وەفات بکەن, وەك لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەردەکەوێت کە فەرمویەتی, **(من طلب الشهادة صادقا اعطيها ولو لم تصبه**...هەروەها دەفەرمویێ: **من طلب الشهادة بلغه الله منازل الشهداء وإن مات على فراشه)** ئیماندارانی هۆشیار خۆیان بە خاوەنی نەفس ومالی خۆیان نازانن بەڵکو بەنی خودای گەورەی دەزانن و فرۆشتویانە بەو, وەك خودای گەورە ئەم ڕاستی‌یەی ڕون وئاشکرا کردووە و دەفەرموێ **﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ ...﴾** التوبه (١١١) هەروەها خودای گەورە کافران و بێ باوەڕان لە دونیای مردوویی داناون وحیساب کردوون... هەروەها ئیماندارانی چاکە کاری لە دونیای زیندووی داناون وحیساب کردوون وەك لە سورەتی ﴿ فاطر﴾ لە ئایەتی (٢٢) دا دەفەرموێ, **﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ...﴾** ئەو ڕاستیە شمان لە بیر نەچێت کە خوای گەورە لە ئەزەلا عیلمی هەیە بە هەموو کەسێ, بە تواناو خواست و ئیرادەیان, هەر چی تەقدیری کردووە گشتی حەق وجێگەی حیکمەت و دانایین, زوڵم وستەم لە کەس ناکاو دەزانێ کێ شایستەی مردنەوە کێش شایستەی زیندوویەتی یە ..... بەرێزان حەقیقەتێکی گەورە هەیە دەبێ لێی دڵنیابین بیزانین کە مردن وکۆچ کردن لە دنیادا حیکمەت ودانایی وای دەخوازێ, ڕەحمەت و بەهرەیە مانای لەززەت بە ژیان بە خشینە, ئەگەر مردن نەبێ ژیان مانایەکی بۆ نامینێتەوە, هەروەها مردن بۆ پیاوی چاك وخواناس ڕزگار بوونیەتی دونیای فانی و خیانەت وزوڵم و زەحمەت کێشیدا, وە بۆ پیاوی بەستەمکاریش ڕزگار بوونی خەلك و مەردوومە لە دەست و دەسەڵاتیا... هەر مردنە وا لە ئادەمیزاد دەکات چاك کردار بێ دەست بەرداری زوڵم وتوغیان بێ وە تێکۆشەر بێ بۆ ئەوەی دوا ڕۆژێکی هەمیشە بە ختەوەری بە چەنگ بهێنێ لە ڕۆژی زیندو بونەوەو موحاسەبە کردن ...

## ٦٢ - الحي :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای مرێنەر, بنچینەی ئەم ناوە-حیـاة-واتـە ژیـان ومانەوەو زیندووی.

**الحي**-واته ئەم خوایـە پـەروەردگارێکی هەمیـشە زینـدووی هـەرگیز نـەمرە, وه سەرەتاو کۆتایی بۆ نییە, وه هەر چی ژیان و مردن و زینـدو بونـەوە هەیـە گـشتی بـە دەست ئەوە, وه زیندوێتی خوای گەورە نە بەستراوەتەوە بە خـواردن و خواردنـەوە, یـان جۆرە کەرستەیەکی خاو, بەڵکو زیندوێتی خوای میهرەبان هەر بەخۆیەوەیە وه زیندوێتی هەموو گیان لە بەران بەوییەوە یـە وەك دەفـەرموێ **﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّـومُ ...﴾ البقرة (٢٥٥)** واتـە- خـوای گـەورە ئـەم خوایەیـە کـە بێجگـە لـە خـۆی هـیچ پەرستراوێکی دیکە نیە, وه خۆی زیندووی ڕاگیری بوونـەوەرە... وه ژیـان و هەمیـشە زیندوویەتی خوای گەورە جیاوازە لەگەڵ زینـدوێتی ژیـانی ئـادەمیزاد, یـا لەگـەڵ هـەر گیانلەبەرێکی تر, وه ژیری و بیری مرۆڤ ناکات بە زانین وچۆنیەتی هەمیشە زیندوویـەتی خوای گەورە... خوای گـەورە دەفـەرموێ **﴿وَعَنَتْ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴾ طه.** واته هەموو روخسارەکان مل کەچ وفەرمان بەردارن بۆ ئەو زاتەی کە هەمیشە زیندوو پایە دارە وەڕاگری مەخلوقاتە, وه ئەوانەی ستەم و زوڵـم دەکـەن سـەر گەردانی و مایەی پوچیان بۆ دەمێنێتەوە, هەروەها خوای گەورە دەفـەرموێ **﴿هُوَ الْحَيُّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾** غافر (٦٥) واتـە- هەر ئەو زیندووەیە جگە لەو پەرستراوێ تر نیە, هاوارو دوعاو نزاکان بۆ ئەو بەرن, ئاین و بەرنامەو یاسا هەر بۆ ئەوە, هەروەك چـۆن بـەدیهێناون ئـاواش ئـەتان باتـەوە بـۆلای خۆی, وه ئاستەوانەی کارو کردارتان رەفتارتان لە گەڵا دەکا,حەمـد و سـتایش هـەر بـۆ خوای پەروەردگارە خوای گەورە داوا لە پێغەمبەرەکەو ئیمانـداران دەکـات ودەفـەرموێ **﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى الْحَيِّ الَّذِي لاَ يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِ وَكَفَى بِهِ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَـبِيرًا ﴾** الفرقان (٥٨) واتە- پشت ببەستە بەو زیندووەی کە هەرگیز نامرێت وه بە پاکی سوپاس و ستایشی بکە, وه خۆی بەسە بـۆ ئاگـاداری و زانـایی بـە تـاوانی بەنـدەکانی...... خودای باڵا دەست کە ناوێکی (**الحي**) وه هەر خۆیەتی بە تاك و تەنها سەر چاوەی ژیانی

هـەموو زینـدە بووەکانـە سـەرەتای ژیانیـان بـۆ دەنەخـشێنێ ئەنـدازەیان بـۆ دادەنـێ وپێداویستی‌یەکانی ژیانیان بۆ دابین دەکاو بەرێوەیان دەباو لـە ئەنجامـدا کۆتاییـان پـێ دێنێ... هەر زیندە بوێ لە شوێن خۆیا وەکو ئایەت و نیشانەکی دەسەڵاتی بـێ پایـانی خودایەو بە زوبانی حالّ دەڵێ پەردەردگارم هەمیـشە زینـدووی ڕاگـری بوونەوەرەکانـە , وەکو خالیق وبەدیهێنەرە. وێنە بەخش و ڕەنگ بەخشیشە , خاوەن کـەرەم و ڕەحمـەت و بەخششیشەو خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوورەو لەسەر هەموو شتێ توانا دارە , هەر زینـدە بوێ بە زوبانی حال لە چەندین ڕوو و لایەنەوە ئامۆژگاری ئـادەمیزاد دەکـات و دەسـتی دەگرێ ڕوەو خواناسین و ڕێگەی هەمیشەیە بەختەوەری, خودای شـکۆمەند لـە سـورەتی (الانعامدا) لە ئایەتی (٣٨) دا دەفەموێ ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَـائِرٍ يَطِـيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ ﴾ واتە-هەرچی زینـدە بـوێ هەیـەو پێـدەکوتێ لـە زەوی وە هەرچی باڵندەیێ هەیە کە بفڕێ بە دوو باڵ ئیللا گشتی نەتەوەن وەك و ئێـوە, لـە ڕووی خەلق کردن و دابین کردنی پێداویستی ژیانیان وهەر گشتیان والە ژێر دەستی ئێمـە هـەر گشتیان هەژاری بـەر قـاپی ئێمـەن , هـەر گـشتیان سـەرگەرمی تەسـبیحاتی خـودان هەرگشتیان چ تـاك تاکیـان چ کۆمـەڵ کۆمـەڵیان ئایـات و نیـشانانی ئێمـەن, لەسـەر دەسەڵاتی بێ پایانی خـوداو گـەورەیی و بـەرزیو پـیرۆزی, وە لـە سـەر ڕووی هـەموو شیانەوە زیندویەتی.. کاتێ ئادەمیزاد ئـەم سـیفەتەی خـودای هەمیـشە زینـدووی لای باشترو زۆرتر دەردەکـەوێ, کـە سـەرنجێکی وورد بداتـە ژیـانی زینـدەبووەکان هـەر لـە ئادەمیزاد تاکو گشت گیان لە بەرانی ووشکایی‌و دەریایی , دوایش بـۆ ژیـانی جنۆکـەو مەلائیکەو, ئەوسا سەرنج بداتە فراوانێتی ئەم کەون و بونەوەرە ئەوسا ووردبینی بکـات لەم هەموو یاسایە جوان و ڕێك و ڕەنگینانەی کە هەموو گۆشەو گونج و کەلـە بـەرێکی ئەم کەون و دونیایەی گرتۆتەوە, ئەوسا تێ دەگات ئەگەر زەررەیێ ژیرو عـەقل پێوە مابێ وە یا ویژدان و ئینصافی لێ دانە برابێ کە ئەمە کاری بێ گیان و مردوو نی‌یە, پـاکی و بێ گەردی بۆ خودای هەمیشە زیندووە. جا لە کۆتایدا دەڵـێن (سبحان ربك رب العزة عمايصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين )

## ٦٣ ـ القيوم :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای زیندوو, بنچینەی ئەم ناوه -قیام-ه واته وەستان... القیوم-واته ئەم خوایه ڕاگیرو پارێزگاری هەموو بونەوەره چ بچوکەکان یا گەورەکان, چ دیتراوەکان یا نەدیتراوەکان, وه هیچ بونەوەرێ بۆی نی پێویستی بە خوای گەوره ناتوانێت بێنێتەوە لە بووندا, بەڵام خوای میهرەبان پێویستی بە هیچ کەسێ وشتێ نیه, بۆ ڕاگیری ومانەوەی, وه هەر خۆی ئاسمانان و زەوی ڕاگرتوه هەروەها خوای گەوره ڕاگیری هەموو شتەو, وه هەموو شتێ لە شوێن خۆیدا لە حالەتی تەواو و دروستیدا نامێنێ و یاساو ڕژێمەکەی تێك دەچێو هەموو شت ناچاره پەنا بەرێ بۆ خالیق و بەدیهێنەریەوە, جا ئیتر خاوەن باوەڕ هەست دەکا کە هەروا وێڵ و سەر گەردان نیه , خوایەکی گەوره ڕاگیرو چاودێریەتیو کاروباری ئەم و دەوروبەری و هەموو شتێ دەبات بەڕێوە...وه ئەوەی خوای گەوره بەدی هێناوەو ڕای گرتووه هیچ بێ هودەو گاڵتە نیه بەڵکو پڕیەتی لە حیکمەت و دانایی , جا هەر بۆی شوێنێ ئەو یاسایە دەکەوێ کە بۆی دیاری کردووه , وه لە کاتی ئەنجامدانیا هەست بە چاودیری ئەو خوایە بێ هاوتایە دەکات . ئەم سیفەتە پیرۆزه سێ جار لە قورئانا هاتووه , جا لەبەر ئەوەی هاوشانە لەگەڵ زیندویەتی , بۆیە هەر سیفەتی زیندوێتی خوای گەوره هاتبێ یەکسەر بە دوایەوە سیفەتی ڕاگیری بە دواهاتووه - وەك دوو ئایەتمان لەپێشەوە نوسی و دیارکرد - ئەمەش ئایەتەکەی تره کە دەفەرموێ:- ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ(٢)نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ ﴾ ال عمران (٢) واته زاتی خودا ئەو زاتەیەکە تاکە پەرستراوه وه بە غەیری ئەو هیچ پەرستراوی تر نیه, وەهەر خۆیەتی هەمیشە زیندووی وەستاوه لەڕاگرتن و پاراستن و بەڕێوەبردنی گشت مەخلوقان, هەر ئەو زاتە پاك وبەرزو پیرۆزه وبێ لەکەیەکەکتابی قورئانی پیرۆزی دا بەزاندووه بەسەر تووه بە حەق , دور لە هەمو لاریو لەوێلی, وه دوور لە هەموو کەم وکوڕییەك قەییومێتی خودای هەمیشە زیندوو کاتێ هەیبەت لە دڵی ئادەمیزاد دەڕوێنێ کە ئەو ئادەمیزاده خۆی بناسێو ماڵ وشوێن و

ئەستێرە و مەجەرەو کەشکەکان ودونیای خۆی بناسێ و فیکرو بیری لە دەوریانەوە خولی خواردبێتەوە...جا ئەگەر ئەو هەیبەتە هاتە دڵی پاکی بەرچاو فراوانی خاوەن هۆشی وویژدان زیندوو, تێی دەگەیەنێ لە ماناو واتای قەییومیش, خودای هەمیشە زیندوو ئەگەر ئەویش تێی نەگەینێ کە بەهرەو بەخشش, و هیدایەتە ئەوە کەسێ نیە یا شتێ نیە حالی بکاو تێی بگەینێ...جا لە کۆتایدا دەڵێن (**من يهدي الله فهو المهتد ومن يضلِل فلن تجد له وليا مرشدا**) ...الكهف(١٧)

## ٤٦- الواجد :

ناوێکه له ناوه پیرۆزەکانی خوای ڕاگیر, بنچینەی ئەم ناوە-وجد-ە واته به دەست هێنان و بوون... الواجد- واته ئـەم خوایـه بـه دیهێنـەری هـەموو شـتێکه , وه هـیچ بەدیهێنراوێ به خۆی نه بووەو نییه تەنها لـه لای ئەمـەوه هاتووەتـه کایـەوەو,سـەتاو کۆتایی بۆ هەیه...جا ڕۆژی سەرەتای هـەر یـەکێ لـه بوونـەوەرەکان لـه یـەکتر جیـان هەروەها ڕۆژی کۆتاییان, وه هەر تاکێ له زیندەبووەکان ماوەو کاتی خۆی هەیه لەبووندا که له لای خالیق و بەدیهێنەرییەوه بۆی بڕیار دراوه...جـا هەیانـه تەمـەنی درێـژه وه هەیانه تەمەنی کورتـه...جـاخوای گـەوره پـرس و تـەگبیری بـه کـەس نـەکردووه لـه بەدیهێنانی هیچ شتێ یـا لـه کـەم و زۆری تەمـەنیان ,وه هەرچـی بیـەوێ دەیهێنێتـه گۆرەپـانی بونـەوه,وه هـیچ شـتێکی پێویـست نییـه,چـونکه بـێ نیـازو دەوڵەمەنـده وپێداویستی به غـەیری خـۆی نییـه...وه بـۆ هـەموو بونـەوەرەکان جێگـەی ئومێـدو نیازه...وه ئەگەر بنچینەی(الواجد) دابنێین به مانای فراوانی و دەسـەڵات و توانـایی , ئەو کاته سیفەته که بەمانای دەسەڵات دارو خاوەن سۆزو خۆشەویستی بـەزەیی دێـت , وه مانای ئەم ووشانەش له هەندێ سیفەتەکانی تری خوای گەوره...دەستنیـشان کـراوه وەکو (الغنی، الودود ، الواسع...هتد ) وه ئەشـگونجێ مەبەسـت هـەر دوو ماناکـەی بێت... خۆش بەختی بۆ ئەو کەسەی دۆست و سـەربازی ئـەو زاتـه خۆشەویـست و بـێ وێنەیه خاوەن دەسەڵاتی بێ سنورو خـاوەن سـۆزو داراییـو سـەخاوەت و شـکۆمەندیو داناییه , نەزیك و به تواناو بیناو بیسەره پاك و بێ گەردو پاك ویست و ڕاستی ویسته و واجدو ماجیده له کیتابی(الایمان والحیاة) کـه مامۆسـتا (یوسف قرضاوي) دانـاوه فەرمودەیەکی قودسی تیا هێناوه که تێیدا خوای گەوره لـه سـەر زوبـانی پێغەمبـەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمویـەتی (من وجدني وجد كل شئ ومن فقدني فقد كل شئ ) ئەگەر به ووردی سەیرێکی ئەم فەرموده قودسییه بکەین کـەوا تاکـەی ئەوەیـه ئـەوەی خودای گەورەی هەبێ و ڕێگەو بەرنامەکەی بگرێ ئـەو ڕاسـتییه بدۆزێتـەوەو بیگرێتـه

باوەش, ئەوە هەموو شتێکی چەنگ کەوتووە ئەصل وبنچینەی هیچ شتێکی لەدەست نەچوەو ناچێ , وە ئەوەی خوای گەورە وون بکاو وێڵ وگومڕابێ ئەوا هەموو شتێکی لە دەست چووە و وونی کردووە ..بە ڕاستی ئەگەر بڕوانینە مێژوو تاریخ هەمان فەرمودە بۆمانی بە واقع تەفسیر کردووە , وە ئەگەر سەیرێکی داهاتوو وموستە قبەل بکەین ئەویش هەمان حەقیقەتمان پێ رادەگەینێ. . .بەڵێ دەبێ ئادەمیزادی ژیرو وووریا بەرچاو فراوان بێ و دور برانێ وتەسك بین نەبێ ,دەبێ ئەم راستی یە بزانێ کەهەرچی هەیبێ لە دونیا ئەوە ئی وی نیە و بۆوی نابێ هەتا هەتایێ بەڵکو بۆ ماوەیەکی کەم لە گەڵیا دەژیی و پاشانیش دەست بەتاڵ و ڕووت قووت دەمێنێتەوە, ئەوسا با ئەو شتەی هەیەتی دەسەڵات وجەیش و سوپا بێ یا موڵك وسامان و دارایی بێت یا کۆشك و باڵەخانە و باخچەو بەراو روبارو دەریابێ یا ژن و ماڵ و منداڵ و خزم وخۆیش بێ , ئەگەر خاوەنەکەی دۆست و سەربازی خودانەبێ شەیدای پاکی وحەق و پەرستی نەبێ گوێڕایەڵی وەحیو بەرنامەی خودا نەبێ لەوەی هەیەتی گشتی بۆی دەبێ بە مایەی نەگبەتی و بەد بەختی و ماڵ کاولی وشەرمەزاری رەنج خەساری. . .بەڵام ئەگەر ئادەمیزاد خودای بوو دیارە خودا بونیش قسەو ووتارێکی رووت نیە بەڵکو جۆرە هیدایەتێکە کە بەخشش و فەزڵ و بەهرەیەکی خودایییە دەیدا بەدڵ پاك و زاناو هۆشیارو حەق ویستان, کە مایەی دڵ ڕوونیو خۆشەویستی خودایو ترس و بیمە لەم خاوەن دەسەڵاتە بێ سنوورەوە قەناعەت و باوەڕە بەو ڕێچکەو بەرنامەی لەلایەوە هاتووە کە تاکە ڕێگەیە بۆ شەق کردنی ژیان وبەڕێوەبردنی وە مایەی بەختەوەری دونیاو قیامەتە بەبێ هیچ دوو دڵی و دڵەڕاوکەیێ بەدڵ خۆشی ورەحابەتی سینەوە پێشوازی لێ بکا, جا ئەم خاوەن بەخشش وفەزل وهیدایەتە دەزانێو تێ دەگات کە دونیا بەوەی کە تیایەتی ئی کەس نییەو بۆ کەس نیە و بۆ کەس نابێ و خاوەنی خۆی هەیە, خودای گەورەو میهرەبانە بۆیە دونیا ناپەرستێ و خاوەنەکەی دەپەرستێ, چونکە دەزانێ خاوەنەکەی ئەم دونیایەی بۆ تاقی کردنەوەی ئەو خەلق کردووەو هەموو بەشیو پارچەکانی بۆ موسەخخەر کردووە , ئەم

زاته خاوەن دەسەلاتی بیٚ سنورە ئەگەر ئەم دونیایەش تیٚك بدات ئەوە تواناداره هــەزاران دونیای تر خەلق بکاتەوە بۆخۆشەویستان و دۆستانی خۆی, وەك کە خــەلقی کــردووە لــە دونیای بەهەشتەکان, جا ئەوەیە ئەوەی خودای بوو هەموو شتیٚکی بوو,وە ئەوەی خودای لە دەست چوو ئەوە هەرچی بووی لە دەستی چوو مایە پووچ و مالٚ ویٚران بــوو, بیٚجگــە لە جەهەندەمیش سوتیٚنەری هەتا هەتایش لەویٚ بوەستیٚ... ئادەمیزاد ئەگــەر بــەدوای وەحی و بەرنامەی خودا کەوت ئەوە بەرەو هیدایەت وخودا رازیکــردن وخــودا بەدەســت هیٚنانە,وەئەگەر بەدوایی هەواو ئارەزووی خۆی کــەوت پایــەکیٚکی وەك و خــۆی کــەوت, ئەوە خودای لە دەست داو بەرەو ریٚچکە و گومرایی و ویٚلیەکان ملی ناوە, ئەوسا لەهەر پلە و پایەیەکی دابیٚ وە خاوەن هەرچەند زانست وزانیاری بیٚ... ئەوەتە خــودای گــەورە رووە پیٚغەمبەریٚکی خۆشەویست (علیة الــصلاة والــسلام)کەحــەزرەتی داوودە پیٚــی دەفەرمویٚت ئەی داود تۆ بە دوای وەحی هیدایەتی خودا بکەوە, وەبەو بەرنامەیە رەفتار بکە کە لە خوداوە بۆت هاتووە, نەکەی بە دوای هەواو ئــارەزووی خــۆت بکــەوی دەنــا گومراو وەیٚل و سەر لیٚشیٚواو دەبی, و لە دونیاو لە قیامــەت بــە ختــەوەریت لەدەســت دەچیٚ...وەك دەفەرمویٚ ﴿ يَادَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّــاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعْ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُــمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ ﴾ ص (٢٦) واتــە- ئــەی داود ئیٚمــە خۆمــانین تۆمان گیراوە بە خەلیفە لەسەر زەویدا جا حوکم و فەرمانرەوایی بە حەق بکە لــە نیٚــوان خەلك و مەردومان, نەکەی بە دوایی هەواو ئارەزوو بکــەویت پــشت بکەیتــە وەحــی و بەرنامەی خودا دەنا گومرِات دەکاو وەیٚل و سەرگەردان دەبی, جــا بــە راســتی ئەوانــەی گومراو سەر لیٚ شیٚواون هەرەتەو دوورکەوتنەوەو لە ئاست ریٚگەی خودا, ئەوا عەزاب و ئازارو ئەشکەنجەی گەورە لە بۆ وانە بەوەی کە پشت گویٚو فەرامۆشــیان کــردووە رۆژی قیامەت و حیساب وکتاب ......

## ٦٥ـ الماجد :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خودای به دیهێنەر, بنـچینەی ئـەم نـاوه-مجیـد-واتـه بەرزی و بڵندی ... الماجد.. واته ئەم خوایه بەرزیو بڵندی بێ پایانەو هیچ سـنوورێکی بۆ نیه,هەروەها به مانای گەورەیی و زۆری بەخشش وڕێز ودەسەڵاتیش دێ یا دەگەیـەنێ , وه بەرزی و بڵندیو پایەداری تەنها له دەست خوای بێ هاووتایـه بـه ویـستی خـۆی بیدابه کوێ ئەیدا وه له کوێی بسێنێتەوه, ئەی سێنێتەوه, وه ئەیدا بـه کـوێ نـای دا, کەسێ نیه له سەر ئەمه موحاسـەبەی بکـات, وه کارەکـان و فەرمانـەکانی گـشت لـه جێگای خۆیەتی کەم وکورتی تیانیه نابێ بەنـده پیـاو چـاکەکانی سـەر بـەرزو پایـەدار دەکات, بەڵام ئادەمیزادی له خوا بێ ئاگاو ستەم کار نزم و ریسوا دەکا, وه ئەگـه ر لـه دونیا بۆ ماوەێی بەروالەت پلەو پایەی پـێ بـدا ئـەوه لـه قیامەتـدا زیـاتر لـه نزمیـو ریسوایی دەیباته خوارەوه ئەمەش به حیکمەت و دانایی خواوه بەستراوەتەوه ...وه لـه مانای-المجید-به درێژی باسی ئەم سیفەتەی خوامان کرد,چـونکه یـەك مانـا دەگەیـەنن و..........

## ٦٦ ـ الـواحـد :

ناوێکه له ناوه پیرۆزەکانی خوای بەرز, بنچینەی ئەم ناوە -وحدە- تـە واتـە تـاك وتەنیایی......الواحد-واتە ئەم خوایە تاك و تەنیایە هـیچ هـاو بەشـێکی نیـەو هـیچ دۆستێکی لەبەر زەلیلی بۆ خۆی بریـار دراوە, وە لـە بـەرزی وپایـەداری دا کەسـی پـێ ناگات و, تەنانەت هیچ ژیرو بیرێ نیە لە تاك وتەنهایی وپایەداری ئەم خوایە سـەرمام و دەستەوەستان نەبێ,.وە ئەم زاتە لە کەس نەبوەو دایك بێ یـا بـاوك ، وەکەسیـشی لـێ نەبووە کوڕ بێ یاکچ یانێرە مووك..هتد لە تاك وتەنهایەتی خۆیدا لە کارو کردەووەکانیدا کەم وکورتی لێ ڕوونـەداووەو ڕوونـادا...هـەروەها ئـەم خوایـە تاکـە وکەسـێ لـەکارو فەرمانیایا لە سیفەت و پایەیدا توانای پەنجە تێوەردانی نییەو شایـستە نیـە و نـاتوانێ هەروەها خوای گەورە بە هیچ شێوەیێ بـەش بـەش نیـەو یـەك پارچـەیە, تاکـە خـالیق وبەدیهێنەرە, تاکە پەرستراو ومەعبودە, هیچ هاوەڵ وهاوتاو هاوبەشی نیـە, هـەر ئـەو شایانی عیبادەت و پەرستنە بێجگە لە ئەو هـەموو شـت دروسـت کـراووە وشایـستەی پەرستن نیە... جا ئەو کاتە خاوەن باوەڕ بەم ئیمانـەوە بێتـە میـدانی ژیـان ئـیتر سـەر گەردان و دڵ دانەمەزراو نابێ, ڕووی تەنیا لـەو خوایەیـە کـە شـایانی ئەوەیـە هـەموو بەدیهێندراوەکانی ڕوویان لەو بێ, بە تایبەتی ئادەمیزاد کە ڕێزی لێنـراوە, مـل کەچـی هەر لایەقە بۆ ئەو بکرێ, گـوێ ڕایـەڵی شایـستەیە هـەر بـۆ ئـەو بـێ,- ئەوسـا ئـیتر ئادەمیزاد یەك ڕووگەی دەبێ و لـە یـەك سەرچـاوەوە هـەموو بەرنامەیـەکی زینـدەگی وەردەگرێ, بەرنامەو عیبادەت وپەرستشیو ئەخلاق و ڕەوشـتی و, ڕامیـاری وئـابوری و کۆمەڵایەتی تەندروستی.. هتد لە یەك سەرچاوە دەبێ , هەموو ئەم یاسـاو بەرنامانـەی کە ئادەمیزاد دور لە بەرنامەی خوا دای دەنێ بە بچوك و ناتەواوی دێنە بەر چـاوی, بـە کورتی لە هەموو لایەنەکانی ژیانیەوە ڕووی وا لە پەروەردگاری تاك وتەنیا دەبـێ....وە لە هەندە ریوایەتی تردا سیفەتی (احد) یش هاتووە کە ئەویش مانای تاك وتەنهایی خوا ئەدا, وە خوای گەورە لە یەکەم ئایەتی ئیخلاصـدا ڕوو بـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ (قل هل الله احد ) کە ئیشارەتە بـۆ ئـەم سـیفەتەی خـوای تـاك و تـەنیا, وە یـەکێتی بوونەوەر گشتیان ئاڵای یەکێتی خوایان بەرز کردۆتەوە, بۆ نموونە یاسای ئەتۆم هاوڕێکی

یاسای مەجەرەکانە, هەروەها پەیوەندیەکانی نێوان بەشەکانی بونەوەر وەکو گوڵ و هەنگ, وە باو دارە بەرزەکانی, نێرەو مێینە لە هەموو بووەکان, ئەستێرەو جۆرەکان, مەجەرەکان لە بەینی خۆیانا -هتد...... گشتیان یەکێتی یاساو یەکێتی بەدیهێنەر دەخەنە ڕوو وئاشکرای دەکەن, هەروەها بیرو هۆشی ئادەمیزادەکان کە نزیکەی ژمارەیان زیاترە لە (٥) ملیار لەسەر زەوی, وە هیچ تەواوی بیرو هۆشێ وەك بیرو هۆشێ تر نیە, هەر چەندە بیرو باوەڕێ کۆی کردبنەوە ئیللا لە چەند لایەنێکەوە جیا جیان, ئەمەش ڕاستیەکی بەڵگە نەویستە......وەك وکەون وبونەوەر بە هەموو بەش و پارچەکانی بە یاساکان ووردە کاریەکانی شاهێد و بەڵگەن لەسەر تاك و تەنهایێتی خودا, ئاواش قورئان ئاماژە دەکاو شاهێدە لەسەر تاك و تەنهایی خودا وەك دەفەرموێ ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلاَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ المؤمنون (٩٢) واتە زاتی خودای شکۆمەند ڕۆڵەی بۆ خۆی بڕیار نەداوە شایانی نیە, وە هیچ پەرستراوێ لە گەلیا نیە, ئەگەر وابایە هەر پەرستراوێ بەشە مەخلوقی خۆی بۆ خۆی گلێ دەدایەوەو هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریان بەرزی باڵا دەستیان دەنواندو سەرەنجام کەون و بونەوەر ڕووی لە تێك چوون و نەمان دەکرد, جا پاکی‌و بێ گەردی بۆ زاتی (الله) یە کە دوورە لە هەموو کەم و کوڕیی لەوەی نەفامان وجاهیلان وەصفی, دەکەن زانایە بە دیارو نادیارەکان, جا گەلێ لەوە بەرزترە لەوەی هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن زاتی واحیدول الاحد وەك و بە خۆی تاکە ناوەکانیشی تاکە هەروەها لە زات و صیفات و دەسەڵاتیدا تاکەو پاکەو بێ وێنەیە, خودای باڵا دەست ئەوەی بە تاك و پاکی تێ نەگات دەی خاتە دۆزەخەوەو بە هیچ شێوەێ لێی نابوورێ وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا ﴾ النساء (٤٨) واتە بێ گومان خوای گەورە لەو کەسە خۆش نابێ کە شیرك و هاوەڵی بۆ بڕیار داوە لەزات و صیفات و دەسەڵات و بەرنامەیدا لەو کەسانە دەبوورێ کە خواست و ئیرادەی لەسەرە کە شیرك و هاوبەشیان بڕیار نەداوە, وە ئەوەی شیرك و هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدا ئەوە بە ڕاستی درۆو تاوانێکی زۆر گەورەی ئەنجام داوە. هەروەها خودای گەورە دەفەرموێ ﴿ إِنَّهُ

مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ المائده (٧٢) واته ئەوەی هاوبەش بڕیار بدا لە زات وصیفات ودەسەلات و بەرنامەی خودا ئەوە خودای گەورە بە هەشتی لەسەر حەرام کردووە جێگەو باڵەخانەی جەهەندەم دەبێ، ئەو ستەم کارانە هیچ لایەنگرو دۆستانێکیشیان بۆ نیەو چەنگیان ناکەوێ، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێ (من لقی الله یشرك بشیء دخل النار) واتە ئەوەی بە لیقای خودا بگات بەشتێکا هاوبەشی بۆ خودا بڕیار دابێ ئەوە دەچێتە ناو ئاگری جەهەندەم ... ناوە جوانەکانی خودا بێ ناوەڕۆك نین، هەر ناوەی مانای خۆی هەیە بە گشتی صیفات و دەسەلات و زاتی خودا دەردەخەن ماناو واتای خواناسین بۆ هۆشیاران و خوا ویستان ڕوون دەکەنەوە، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لە پارانەوەو دوعایەکی دا دەفەرموێ- اللهم ربنا ورب کل شیء و ملیکه, انا شهید انك اللهوحدك لاشريك لك - اللهم ربنا ورب كل شيء ومليكه أنا شهيد أن محمداً عبدك و رسولك - اللهم ربنا ورب كل شيء ومليكه انا شهيد أن العباد كلهم اخوه - واتە خوایە گیان ئەی پەروەردگارمان ئەی پەروەردگاری هەموو شتێ و خاوەنەکەی، من شاهێدیو گەواهی ئەدەم کە تۆ خودایت (الله)یت تاکو تەنهاو پاك و بێ گەردو بێ هاوەڵ و شەریکی - خوایە گیان ئەی پەروەردەگارمان ئەی خاوەن هەموو شتێو پەروەردەگاریان، من شاهیدو گەواهی دەرم کە محمد بەندەو نێردراوی تۆیە- خوایە گیان ئەی پەروەردگاری ئێمەو هەموو مەخلوقێ هەر تۆ خاوەنی هەموو شتێکی من شاهێدم کە بەندانی خواپەرست گشتیان بران، ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە ئاینی تاك پەرستیە بەوەی کە ڕاستی بۆ خەڵك ڕوون دەکاتەوە کە زاتی خودای شکۆمەند تاکەو بێ هاوەڵەو خاوەنی ناوە جوانە تاکەکانە لەوانەش (واحد-احد) وە خەڵکانیش هەڵ دەنێو داوایان لێ دەکات کە تەنها یەك ڕێگە بگرن کە ئەمیش ڕێگەی ئەم خودایە تاکە پاکە بێ وێنەیەیە وە خەڵکانیش دەباتەوە سەر یەك سەرچاوە کە برایەتیو خۆشەویستی کەسایەتی تەبایێتیو هاریکارێتیە......

## ٦٧ ـ الصمد :

ناوێکه لەناوه پیرۆزەکانی خوای تاك و تەنیا, بنچینەی ئەم نـاوه-صـمد-ه واتـه سەرداریو گەورەیی... الصمد:-واته خوای گەوره جێگەی نیـازو ئومێـدو پێداویـستی هەموو کەسێکه هەروەها هەموو بونەوەرێکه, ..هەروەها ئـەوەش دەگەیـەنێ کـه ئـەم میهرەبانه لە عەزەمەت و گەورەییدا لە عیلم و زانستیدا لـه حیکمـەت و دانایـیدا لـه هەموو سیفاتی تردا لە جـەمال و کەمالیـدا ئـەو پـەڕی گرتـووەو هاوتـای نیـەو نـابێ لەبەرئەوه هەر ئەو جێگەی ئومێدو پەنایه هەر ئەبێ بۆ ئەو پەنا ببرێ داخوازی و دوعاو پاڕانەوەو نزا هەر لەو بخوازرێ وەهاوارو داوامان هەردەبێ بۆ ئەو ببردرێ چونکه هاوتـای نیەو هیچ کەس وەکو ئەو بەدەسەلات و بەتواناو لێهـاتوو نیـیەو نـابێ ... هـەروەها-صمد-لە زومانی عەرەبیدا یانی گەورەو سەردارێك که هیچ شتێ به بێ ویـستی ئـەو وه بەبێ ڕەزامەندی ئەو ئەنجام نەدرێ, خوای میهرەبان گەورەو سەردارو بەدەسەلاتەکه هـیچ گەورەو سەردارو بەدەسەلاتێ نیه لەو بەرزترو بڵندتر بێ, لە خوایەتیـدا تـاك و تەنیایـه هەمووومان بەندەی ئەوین دەبێو ئامانج و ئاواتمان ڕەزامەندی ئەو بێ چـونکه هـەر ئـەو دەتوانێ پێویستیەکانمان جێ بە جێ بکاو, بەڵاو ناخۆشیەکانمان لەسـەر لابـداو, فـەرمان ڕەوایەو کەس هاوتای نیه له فەرمان ڕەوایییەکەیدا, لە گەڵ ئەوەش که هەموو بونـەوەر پێویستی بەوه, ئەو پێوستیو ئیحتیاجی بە هـیچ کەسـێو شـتێ نیـه... لـه سـورەتی ئیخلاصدا خوای گەوره ناوی ئەم سیفەتەی خۆی بردووەو که دەفەرموێ ﴿اللَّهُ الصَّمَدُ﴾ ئەم سیفەتەی خوای گەوره والەدڵانی خاوەن باوەڕان دەکا که لە هـەموو پێویـستییەکی چاو لەدەستی ئەم و ئەو نەبن و کەس بە ئومێدگای خۆیان دانـەنێن, بێجگـه لـه تاکـه خۆشەویست و دۆستیان که خـوای سـەردارو تەنیایـه.... ئەمـەش دڵ ڕزگاردەکـاو لـه دڵەڕاوکەو چاوچنۆکی و بێ ئومێـدی... هتـد... پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) کـه پێشەوای خواناسان و لە خواترسان بووه, باشتر لە هەموو کەسێ لە مانـای صـەمەدێتی خودا عالی بووەو سوودو کەڵك و پایەو پلـەی پـێ بـەرز بـووه, ئـەوه بـوو لـه هـەموو بوارەکانی ژیان تەوەککولی لەسەر ئـەم صـەمەده دەکـردو داوای هـەموو خێرێکـی لێ

دەکردو, پەنای پێ دەگرت لە هەموو شەڕو گێچەڵ و فیتنەو موصیبەتێ هەرگیز لێیەوە غافڵ و بێ ئاگا نەبووە, حاڵی بووە لەو ڕاستیەی، کە خودای صەمەدو ئەحەد هەردەم پەناگاو ئومێدگاو پشتیوانی ئەو کەسانەی کردووە کە بە ڕاستی و چاکیو پاکی هانای بۆ دەبەن، لەو بوارانەو دوعایانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) پەنای بۆ خودا بردووە ئەمانە هەندێکیانن.١-(اللهم انا نعوذبك من ان نشرك بك شيئا نعلمه و نستغفرك لما لانعلمه) رواه احمد والطبراني. واتە خوایە گیان ئێمە پەنا بەتۆ دەگرین لەوەی کە هاوبەشت لە شتێ بۆ بڕیار بدەین دەیزانین وە داوای لێ بووردنت لێ دەکەین لەوەی کە نایزانین.. ٢-(اعوذ بكلمات الله التامات من شرّ ما خلق ) رواه ابن حبان.. واتە پەنا بە خودای تاك و پاك و بێ هاوتا دەگرم لە هەموو شەرو گێچەڵی بەدیهێنراوەکان . ٣-( اللهم اني اعوذبك من الهم والحزن واعوذبك من العجز والكسل واعوذبك من الجبن والبخل واعوذبك من غلبة الدين وقهر الرجال ) رواه ابوداود . واتە خوایە گیان پەنا بە تۆ ئەگرم لە خەم و پەژارەو تەمبەڵیو تەوەززەلیو لەترس و ڕەزیلی، وە پەنا بەتۆ دەگرم خوایە گیان لەوەی بکەومە ژێر قەردان و ژێر چەپۆکیو قین و تووڕەیی خەڵکانەوە.٤-( اللهم اني اعوذبك من الكفر والفقر اللهم اني اعوذبك من عذاب القبر لا اله الا انت ) رواه ابو داود. واتە-خوایە گیان من پەنا بە تۆ دەگرم لە کوفرو بێ باوەڕی لە هەژاریو فەقیری خوایە گیان من پەنا بەتۆ دەگرم لە ئەشکەنجەو عەزابی قەبر, هیچ پەرستراوێ نییە تەنها تۆ نەبێ، هیچ صەمەدێ نییە تەنها تۆ نەبێ، خولاصەی کەلام پێغەمبەری خۆشەویست هەردەم خودای لەیاد بووەو زیکرو یادی کردووە لەبەریا پاراوەتەوەو پشتی پێ بەستاوەو پەنای پێ گرتووە، تەنانەت ئەگەر گەردەلول و بایێ هاتبێ داوای لە خودای کردووە خێری ئەو بایەی بە قسمەت کات و لەشەڕی ئەو بایە بی پارێزی، یا ڕووی کردبێتە هەرشوێنێ داوای لە خودا کردووە کە پەنای بدا، لەشەڕو فیتنەی ئەم شوێنەو لەهەمان کاتیشا داوای لێ کردووە لە خێرو بێری ئەو شوێنە بێ بەش نەبێت...وە هەر کاتێ لەماڵەوە دەرچووبێ یا بۆ کارێ دەرچووبێ ئیللا بسم الله ی کردووەو ناوی خودای هێناوەو تەوەکولی لەسەر خودا

کردووه، پڕ بەدڵ و بەگیان بەمانای خۆی فەرمویەتی (توكلت علیالله) هەروەها لەهەموو بوارو لایەنەكانی ژیان وەكو پەنای بەخودا گرتووه لەشەڕو بەڵایەكان ئاواش داوای خێرو بێرەكانی لێ كردووه چونكە زانیویەتی بەحەقی زانین كەتەنها خودای گەورە سەرچاوەی خێرو شەڕەو هەر خۆی جێگەی پەناگاو ڕووتێ كردنە هەر خۆی صەمەدە جێگەی نیازو ئومێدە وەك لە دوعایێك ڕووەو خودای صەمەد دەفەرموێ (اللهم اني اسألك فعل الخيرات وأعوذبك من المنكرات اللهم ان اردت فتنة قومي فتوفنا غير مفتونين) واته خوایە گیان من پرسیاری كارو كردەوە خێرو باشەكانت لێ دەكەم وە پەنا بە تۆ ئەگرم لە كارە ناهەموارو نارێكەكان، خوایە گیان ئەگەر خواست و ئیرادەت هاتە سەر قەوم و گەلێ بەفیتنەو بەهیلاك دانیان خوایە گیان ئێمە پێش ئەو فیتنەیە بەرەحمەت بۆ لای خۆت بكێشیتەوە... جارێكیان پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەستی بەرز كردەوەو زۆری دوعا كرد پاشان هەندێ لە صەحابەكان ووتیان ئەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) جەنابت زۆرت دوعا كرد لەسەریەك و ئێمە دوعاكانمان بۆ ڕانەگیراو نەمان توانی فێری ببین، فەرمووی دوعایەكتان پێ بڵێم موقابیلی گشت دوعایەكان بێت فەرمووی بڵێن. (اللهم انا نسألك من خير ما سألك منه نبيك محمد (ﷺ) ونعوذ بك من شر ما استعاذك منه نبيك محمد (ﷺ) لا اله الا انت المستعان ولاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم ) واته بڵێن خوایە گیان ئێمە داوای ئەو خێرەت لێ دەكەین كە پێغەمبەرەكەت (ﷺ) لێتی داواكردووه وە پەنا دەگرین بە تۆ لەو شەڕەی كە پێغەمبەرەكەت (ﷺ) پەنای پێت گرتووه, هیچ پەرستراوێ نیە تەنها تۆی یارمەتیدەرو كۆمەك دەر نەبێ، وە هیچ هەوڵ و هێزو قوەتێ نیە تەنها بە تۆی بەرزی عظیم و گەورە نەبێ جا ئێمەش لە كۆتاییدا ڕوو لە خودای صمەو پەناگاو ئومێدگای خواناسان دەكەین پڕ بە دڵ و بە گیان لە جیاتی خۆم وگوێ گرانی بەرێزو گشت موسوڵمانان دەڵێین:- اللهم انا نسألك من خير ما سألك منه الانبياء والمرسلون والذين آمنوا ونعوذبك من شر ما استعاذك منه الانبياء والمرسلون والذين آمنوا لا اله الا انت المستعان ولاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم......

## ٦٨- القادر :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای سەردارو گەورە، بنچینەکەی-قدرە-ە واتە توانا داری، وەیا بنچینەکەی-قدر-ە واتە ڕێزو ئیحتیرام ... القادر-واتە ئەم خوایە میهرەبانێکە تواناداره بە خواست و ویستی خۆی لە هەموو ڕوو لایەنێکەوە، توانا دارێتیەکەی لە هیچ سنوورێکەوە نەوەستاوە، بەڵکو بێ پایان و لەبن نەهاتووە، بیرو ژیری هیچ کەسێ لە ئادەمیزادەکان یا جنەکان تێی ناگاو نایزانێ، چونکە توانای خوا دوورە لە هەموو کەم وکوڕیو هەروەها بێ ئەندازەیە... وە ئەم سیفەتە پیرۆزە حەوت جار لە قورئانا هاتووە کە ئەمانە هەندێکیانن، وەکو دەفەرموێ... ﴿ وَقَالُوا لَوْلاَ نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنَزِّلَ آيَةً وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ الانعام (٣٧) واتە دەڵێن بۆ لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەو موعجیزەیەکی بۆ نایەت؟ پێیان بڵێ بەڕاستی خوا بەتواناو دەسەڵاتە کەبەڵگەو موعجیزات بنێرێ، بەڵام زۆربەیان نەزان و نەفامن، وە لەحەق تێ ناگەن، هەروەها دەفەرموێ ﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ ﴾ الانعام (٦٥) واتە-خوای گەورە بە تواناو بە دەسەڵاتە لەسەر ئەوەی کە سزاو عەزابتان بۆ بنێرێ لە سەروتانەوە یا لە ژێر پێتانەوە، وەیتان کات بەدەستەو تاقم تاقم بە هۆی هەندێکتانەوە ناخۆشی بچەژێ بە هەندێکی ترتان و ژیانتان لێ تاڵ بکات... هەروەها دەفەرموێ : ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ ﴾ الاسراء (٩٩) واتە-ئەوە نابینن کە بەڕاستی ئەو خوایەی ئاسمانان و زەوی بە دیهێناوەو دروست کردووە توانای هەیە کە وەکو ئەوان بەدیهێنراوی

تر دروست بکاو بەدیبهێنێ؟... واتە بەڵێ دەتوانێ بـەدیبهێنێ وە لـەلای زۆر سـاکارو ئاسانە.. جا کاتێ خاوەن باوەڕ خوای پەروەردگاری بەم جۆرە ناسی وە دڵنیابوو کەتـەنیا دەسەڵاتدارو قودرەتداری ڕاستەقینە لە دونیادا تەنها ئەو خوایـە گەورەیـە, ئـیتر دەبـێ باکی چ بێ لە هەر دەسەڵات و بە تواناداریٚکی سەر زەوی.. وەئیتر چۆن سـڵەمێتەوە لـە هیچ هێزێو دەسەڵاتێ، کاتێ ئەم خاوەن هێزە بە تواناو دەسەڵات دارە وا لە گەڵیایە... ئەم زانینە ڕاستەقینەش ئیمانداران وورە بەرز دەکات وە عیززەت و هەیبـەت و شـکۆی دەبێ بەسەر کافران و بێ باوەڕاندا.........

## ٦٩ ـ المقتدر

ناوێکە لە ناوە بەرزەکانی خوای توانادار, بنچینەی ئەم ناوە-قدرە-ە واتە توانایی و هێز... المقتدر-واتە ئەم خوایە لەو پەڕی توانـاو دەسـەڵات و دانایییـە, وە هەرچـی بیەوێ ئەنجامی دەدا بەشێوەو ڕادەیەکی دیاری کراوو پڕ لـە حیکمـەت و دانـاییەو دوور لەکەم و کوڕی, ئەم سیفەتە هەر شایان و شایستەی خوای بـێ هاوتایـە , چـونکە هـەر ئەوە بەتەواوی بەسەر هەموو شتێکدا دەسـەڵاتدارێ... ئـەم سـیفەتەی خـوای گـەورە لەگەڵ سیفەتەی (قادر)- هەمان مانـا دەبەخـشێ وە نزیکـەی چـوار جـار لـە قورئانـا هاتووە, وەك دەفەرموێ ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِرًا ﴾ الكهف (٤٥) واتـە بـێ گومان خوای گەورە لەسەر هەموو شتێ توانـادارە... وە هـیچ هێـزو شـتێ بـۆی نیـەو ناتوانێ بکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی خوا, چونکە شوێن و مـەکان و دەسـەڵاتێ نیـە بـە دەرەوەی خوای دەسەڵات و توانادار... هەروەها دەفەرموێ:- ﴿كَذَّبُوا بِآيَاتِنَـا كُلِّهَـا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُقْتَدِرٍ ﴾ القمـر (٤٢) واتـە ئایـات و مـوعجیزات و بەرنامـەی ئێمەیان بە درۆ زانی و بڕوایان پێ نەکرد, ئێمەش پێچامانندنەوەو لەناومان بردن بە هێزو تواناو دەسەڵاتمانەوە.... هەروەها دەفـەرموێ:- ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ(٥٤)فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ ﴾ القمر (٥٥) واتە پارێزگاران و موتتەقیان لـە باخـچان وگوڵ و گوڵزاری بە هەشتان و گەشت و گوزار دەکەن بە لای پاکان و ڕاستان لای پاشـای سەردارو توانا یان نیشتەجێن ... لەم سیفەتەدا موسوڵمان لـە هێـزو دەسـەڵاتی خـوای بەهرەمەند دەبێو دەزانێ کە خوای بێ هاووتا لەگەڵیایـەو چـاودێری دەکـاو دەیـپارێزێ ..........

## ٧٠ـ المقدم :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای باڵا دەست , بنـچینەی ئـەم نـاوە-قـدم-ە واتـە پێش و بێ سەرەتا... المقدم- واتە ئەم خوایە پێشخەری هەر کەسێ لە هەر کاتێ بیەوێ وە یا هەر چەن و چۆنێکی بیەوێ جا چ لە دونیابێ یا لە رۆژی دوایـی بـێ, بـێ ئـەوەی کەسێ یا شتێ دەست خەری تیا بکات, بێجگە لە خـۆی... پـاکەو بـێ گـەردیەو بـێ عەیبی هەر شایستەی خوای گەورەیە, کەسێك یان نەتەوەیەك بەسـەر کەسـێکی تریـان نەتەوەیەکی تـریش دەخـات ...., یـان رزق و رۆزی تەمـەن وشـیفا زوو دەنێـرێ پـێش دەخا... هەروەها (المقدم) ئەوە کە هەندێ شت پێش هەنـدێکی تـر دەخـات لـە هاتنـە مەیدانیا جا لەهەرچ روو لایەنێکەوە بێ, ئەگەر لە رێزو پایەداری دابێ یان لە زەمـان و شوێن دابێ .. هتد لەم پێش خستنانەش دا حیکمـەت و دانـایی خـۆی تێیـدا لـە ئـاڵا دایەوەو فەرمان رەوایە...

## ٧١ ـ المؤخر :

ناوێکه له ناوه جوانه‌کانی خوای پێشخەر, بنچینه‌که‌ی ئـه‌م نـاوه -تـأخر-ه واتـه پاش خستن و دواخستن... المؤخر- واته ئه‌م خوایه په‌روه‌ردگارێکه هـه‌ر شـتی یـا هـه‌ر که‌سێ بیه‌وێ دوای بخات، دوای ده‌خات, یان به مانایه‌کی تر, دواخه‌ری هـه‌ر که‌سـێك و شتێکه به خواست و ویستی خۆی جا له هه‌ر کات و شوێنێ بێ یا له‌هه‌ر چه‌ن و چۆنیه‌ك بێ، وه یا له‌هه‌ر بارو ڕوێکه‌وه بێ, له دونیادا بێ یا له قیامه‌ت بێ... وه که‌سێ تواناو ده‌سه‌ڵاتی نیه له پێش خستنی یا دواخستنی هیچ شتێ, مه‌گه‌ر خوای پێشخه‌رو دواخه‌ر نه‌بێ... جا ئه‌م دواخستنه‌ش له پله‌و پایه‌ی بێ له ده‌ردو بـه‌ڵا بـێ یـا لـه ڕزق و ڕۆزی دابێ یان له ته‌مه‌ن و عومر دابێ ..هتد. ئه‌م سـیفه‌ته‌ی میهره‌بـان موسـوڵمانان دڵنیـا ده‌کا له‌وه‌ی که‌سته‌م کاران و زۆرداران له سزاو تۆڵه‌ی خوا ڕزگاریان نابێ, وه پێش خـه‌رو دواخه‌ری هیچ کارو فه‌رمانێ نین, نه بۆ خۆیان و نه بۆ که‌سی تـر, وه گـه‌ر دوابخـرێن وه نه‌بێ په‌روه‌ردگاریان لێیانه‌وه بێ ئاگـاو غافـل بـێ, بـه‌ڵکو له‌بـه‌ر چـه‌ند حیکمـه‌ت و داناییێکه‌وه که هه‌ر خۆی ده‌یانزانێ... خوای گه‌وره له زۆر ئایه‌ته‌کانی دا ده‌ست نیشانی کردووه که په‌له‌ی نیه بۆ تۆڵه سه‌ندنه‌وه له‌سته‌م کارو زاڵمان, وه دڵنیایی ئـه‌دا به‌سـته‌م لێ کراوان و مژده‌ی تۆڵه سه‌ندنه‌وه‌یان ده‌داتێ له ڕۆژی قیامه‌تدا, هـه‌روه‌کو ده‌فـه‌رموێ ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِمْ مَا تَرَكَ عَلَيْهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ النمل (٦١) واته-گـه‌ر په‌روه‌ردگار به خراپه‌و تاوانی مه‌ردوم بکات ئه‌وه ده‌بێ پێ کوته‌یێ له‌سه‌ر زه‌وی نه‌یه‌ڵێ, به‌ڵام خودا دوایان ده‌خات بۆ کاتی دیاری کراو جا ئه‌گه‌ر ئه‌و کاته هاتـه پێـشه‌وه ئـه‌وا ماوه‌یه‌کی که‌میش پاش و پێش ناخرێ... بێ گومان هیچ هێزو ده‌سه‌ڵاتێ ناتوانێ هیچ بڕیارێکی خوای گه‌وره پێش و پاش بخات, یه‌کێ له‌و نمونانـه کـه لـه چـه‌نده‌ها شـوێنی قورئاندا ته‌نکیدی له‌سه‌ر کراوه مه‌سـه‌له‌ی کـاتی مردنـه-(واتـه ئه‌جـه‌ل)- بـۆ نموونـه ده‌فه‌رموێ:- ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ الاعـراف (٣٣)

هەروەها دەفـەرموێ:- ﴿إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لاَ يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُــونَ﴾ نـوح (٤)
واتە:- بە ڕاستی کاتی کە ماوەی کۆتای هەر ئادەمیزادێ هات بە هیچ جۆرەو شـێوەیێ دوا ناخرێ, ئەگەر ئێوە بتان زانیایەو بیزانن... جا کەواتە دەبێ موسوڵمان دڵنیابێ کـە ژیان و مردنی تەنها بەدەستی خوای پێشخەرو پاشخەرە,. ئەم زانیاری یە ڕاسـتەقینەش مەگەر هەر خوا بزانێ چەندەها نەخۆشی دڵ و دەرون ساڕێژ دەکا.....

## ٧٢ ـ الأول :

ناوێکه له ناوه پیرۆزەکانی خوای دواخەر ، بنچینەکەی-أول-ە واتــە یەکــەمین و سەرەتا... الاول-واتە ئەم میهرەبانیە یەکەمەو کەسیّ پێشی نەکەوتووەو شایانی هــیچ کەسیّ نیە تەنیا خۆی نەبێت، چونکە ئەگەر بگوترێ خوای گەورە یەکــەمین نیــە (نعــوذ باالله) مانای وایە دەبیّ شتیّ لە پێشیەوە بیّ کەواتە سنووردار دەبیّ ئەمــەش سـیفەتی دروست کراوانیەتی، ئەمەش کەم وکورتیو نزمیو نــا تــەواوی دەگەیــەنیّ، وە خــوای میهرەبان دوورە لە هەرچی کەم و کورتیو ناتەواویی هەیە. کەواتــە خــوای گــەورە هــەر هەبووەو ئەزەلییەو سەرەتاییەکی بۆ نەبووە وەکو کە کۆتایشی بۆ نابیّ، وەك خوای گەورە لەم بارەوە دەفــەرمویّ ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِــيمٌ ﴾ الحدید (٣) ئەم ئایەتە پێنج سـیفەتی خــوای گــەورە دەخاتــە ڕوو، واتــە خــوای گــەورە یەکەمینە (یەکــەمینی هــەموو شــتێکە) و دواهەمینــە-(واتــە دوا هــەمینی هــەموو شتێکە) وە ئاشکراو زاهیرە-(بە هۆی دیاردەی بوونەوەرەکانییەوە)-وە نادیارو باتینــە-(لەبەر پاکیو گەورەییو عەزەمەتی..هتد )-وە خوای گەورە بەهەموو شــتیّ زانایــە یــا ئەم سیفەتە لە ئەوەلی یەکەمیا، ئیشارەیە بۆ ئەوە کە خوای پەروەردگار ئەوەل و یەکــەم و بیّ سەرەتایە ، کاتیّ خوای پــەروەدگاری هــەبوو هــەموو زاراوەی زەمــان و مــەکان و کەیو وە لەکوێو چۆن، وجودیــان نــەبوو، خــوای گــەورە پــێش هــەر شــتیّ لەمانەیــەو سەرەتایی هەموو وجودێکی ئەم بونەوەرەیە، مەگــەر تــەنها هــەر خــۆی بــەنهێنی ئــەم یەکەمینــەی خــۆی بزانــیّ وە ئێمــەی لاوازو بــیّ دەســەلاّت جگــە لــە مــل کــە چــی ، هەڵوێستێکی ترمان نییە، وە خوای گەورە لە توانای ئێمەدا نیە کەوا یەکەمیەتی و بیّ سەرەتاییەکەی بزانین، هەموو دەزانین کە خوای گەورە بیّ سەرەتایە- پێشی هەموو شتیّ کەوتووە، ئەم سیفەتەش هەر شایان و شایستەی خۆیەتیو هەر خۆی دەزانیّ چۆنەو چۆن نییە ...

## ٧٢- الآخر :

ناوێکه له ناوه جوانه‌کانی خوای یه‌کـه‌مین, بنـچینه‌ی ئـه‌م نـاوه-اخـره-ه واتـه ئاخیره‌مین و دواهه‌مین.. الاخر- واته خوای گه‌وره دواهه‌مینه که‌سێ یا شـتێ دوای ئـه‌و ناکه‌وێ به هیچ جۆرو شێوه‌یێ , یا به‌مانایه‌کی تر خوای گه‌وره چـۆن سـه‌ره‌تای نـه‌بووه ئاواش کۆتایی بۆ نیه, وه له‌ناو ناچێت ونامرێت و له‌ناو چونی بۆ نیه‌و نـابێ, تـا شـتی تری بێت به شوێنیا, وه هه‌ر ئه‌وه‌و ئه‌و بووه, هه‌موو شتێکی کۆتایی‌و ئاخیری بۆ بڕیـار داوه, مه‌گه‌ر شتێ که خوا ویستی له‌سه‌ر بێت و بیه‌وێ بیهێنێت و دوایی نه‌بێ... خـوای گه‌وره ئه‌زه‌لی‌یه‌و ئه‌به‌دی‌یه خالیق و به‌دیهێنه‌ری کات و زه‌مانه, مه‌سه‌له‌ی بێ سه‌ره‌تاو بێ کۆتاییش به‌ستراوه به‌زه‌مانه‌وه, وه ئه‌گه‌ر بڵێین کۆتایی بۆ هه‌یه (نعوذ بـالله) که‌واتـه سنووری بۆ دائه‌نێین, که ئه‌مه‌ش لایه‌ق و شایسته‌ی خوای گه‌وره نی‌یـه, چـونکه خـوای گه‌وره دووره له که‌م وکوڕی, وه دووره له‌وه‌ش نا ته‌واوی به‌سه‌ردا بێت, وه له دوای له‌ناو چونی هه‌موو شت ئه‌و باقی‌یه‌و، هه‌ر بوه‌و هه‌ر ئه‌مێنێ‌و نه‌مره, ته‌نانه‌ت بـچوکترین نـا ته‌واوی به‌سه‌را نایه‌ت چ له زاتی‌خۆیا چ له سیفه‌ته‌کانی‌یه‌وه, ... ئه‌م سـیفه‌ته‌ی خـوای گه‌وره‌ش بوه‌ته کۆڵه‌گه‌ی شادومانی‌و پیرۆزی‌و به‌ختیاری له‌دڵانی ئیمانداران, بـه‌وه‌ی کـه تاکه خۆشه‌ویست و دۆستیان هه‌تا هه‌تایه‌و فه‌وتان و مردنـی بـۆ نیـه, وه له‌گه‌ڵیانایـه‌و به‌هانایان دێت له هه‌موو ته‌نگ و چه‌ڵه‌مه‌و ده‌رده سه‌ریه‌ك.......

## ٧٤ - الظاهر :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای بێ هاوتا, بنچینەی ئەم ناوه -ظهور- ه واته دیار بوون و دەرکەوتن... الظاهر:- واته ئەم خوایه زۆر بەرزو بڵنده له هەموو شتێو هەموو کەسێ له هەموو ڕوو لایەنێکەوه له زانست و زانیاری, له توانایێو دەسەڵات, له بەزەییو میهرەبانی له جەماڵیو کەماڵی... هتد . یان به مانایەکی تر خوای گەوره ظاهرو ئاشکرایه به هۆی دروست کراوانی گەورەو فراوانیەیەوه, به هۆی ڕێك و پێکی ووردەکاری نەبڕاوەی سەر سوڕهێنەرییەوه، له هەموو شتێکدا ئاشکراو دیاره, زاناکان سەرسوڕماوو سەرگەردانن و له گەورەییو عەزەمەت و بڵندیو کار بەجێ ووردە کارییو گەوره کاری دروست کراوانیدا تاکو زانست و زانیاری له ئاڵا دابێ گەورەییو عەزەمەتی خوای بێ هاوتا زیاتر ئاشکرا دەبێو خۆی دەنوێنێ:- کاتێ کەوا داوا کرابوو له زانایەك که دەڵێ بەڵگه بێنێتەوه لەسەر بوونی خوای گەوره, ئەویش ووتوویوی کا کەی خوای گەوره شاراوەیه تا دەلیل و بەڵگه بهێنرێتەوه لەسەر بوونی؟... لەبەر ئەوه کاتێ خاوەن باوەڕ بیر دەکاتەوه لەسادەترین شت دەستی پڕ قودرەتی خالیق دێته بەرچاو, وه ئەگەر چاوێك بڵند کات بۆ ئاسمان سەیرێکی ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان بکا یا بەش و باران بارێنێ بکات زیاتر گەورەی پەروەردگاری بۆ ڕوون دەبێتەوەو دەردەکەوێو ئاشکرا دەبێ، وەتەزیو موچڕك دێت به گیانیا، به چاوی دڵ پەروەردگارو دەستی به توانای لەبن نەهاتوو بەدی دەکا، بەڵام ئەوانەی له کونی دەرزییەوه سەیری ژیان و بونەوەر دەکەن بێ هیچ وورد بوونەوەو سەرنج دانێکی ژیری, ئەوا گومڕاییو سەرلێ شێواوی نەبێ زیاتر به دەستی ناهێنن, وه دڵیان وەك کونه دەرزی نەبێ شتی تر ئەنجامیان نابێ......

## ٧٦) البـاطـن :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای دیار, بنچینەی ئەم ناوە-بطن-ە واتە شاراوە, یا دیوی ناوەوە, وە یا هەر شتێکی نادیار دەگەیەنێ...

الباطن: واتە خوای گەورەو میهرەبان بە دەستی حەقیقەت وماهیەتی نابینرێ, وە خوای گەورە لە بـەدیهێنراوو دروسـت کراوانـی ناچـێت, وە حەقیقـەت و وورده کـاریو شاراوەی هەموو شتێ دەزانێو کەسێ هی ئەو نازانێ، تاکە کەسێ کارێك ئـەنجام دەدات بە ڕواڵەت و ئاشکرا چاك و پەسـندە, خـوای گـەورە ئاگـادارە بـە بـاتین و نـاخ و دڵ و دەروونی خـاوەنی, وە لەسـەر ئـەم نیـازە پـاداش یـا سـزای دەدات دەزانـێ مەبەسـتی ڕەزامەندی ئەو بووە یا ڕیاو روپامایی بووە , بۆیە دەفـەرموێ ﴿وَذَرُوا ظَـاهِرَ الإِثْـمِ وَبَاطِنَهُ ﴾ الاعـراف -واتـە واز لـە تاوانکـاری دیـارو نادیـاری بێـنن,.... هـەروەها دەفـەرموێ:- ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ الانعـام (١٠٣) واتە هیچ بینایەك دەركی ئەو ناكاو ناتوانێو بۆی نیە, بەڵام ئەو دەركی هـەموو بیناییێ دەكاو دەتوانێ و زۆر لێـی زانایـەو هـەر شایـستەی خۆیـەتی... بـە كـورتی حیكمەت و دانایی خوا وە دەخوازێ كە خوای گـەورە دیـار بێـو لەبـەر چـاوی ژیریـو حەقیقەتدا بە هۆی دروست كـراو بەدیهێنەرەكانیـیـەوە, وە نادیـارو پـەنهان بـێ لەبـەر گەورەییو شان وشكۆو عەزەمـەت و سام و هەیبـەتیو....و.... هتـد وە لەبـەر گـەلێ حیكمەت ودانایی تریش كە هەر خۆی دەیان زانێ... وە ئێمە گومانمـان نیـە لـە هـیچ سیفەتێ لە سیفەتەكانی خوای گەورە هەر چەندە زۆر لە دەرەوەی سـنوری ژیریـو بـیری نادەمیزادە وەبێ"-(مادام قورئانی پیرۆز یا فەرمایشتی پێغەمبەر-ﷺ-دیاری كردبێـو پەنجەی بۆ ئاراستە كرد بێ "- چونكە ئێمە باوەڕمان بە خواو پێغەمبـەرەكان كـردووە-علیهم الصلاة والسلام-هەروەها بە كتێبە پیرۆزەكانیـان, كـە لەسـەرویانەوە قورئـانی پیرۆزە كە تەكمیلەو تەواوكەری ئاینە ئاسمانیەكانـە... وە هـەروەها خـوای گـەورە ئـەم سیفەتەی لە قورئانی پیرۆزدا ناو بردووە دەفەرموێ ﴿هُـوَ الأَوَّلُ وَالآخِـرُ وَالظَّـاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ الحدید (٣).........

## ٧٦ - الوالي :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای پەنهان, بنچینەکەی-ولي-یه واته نەزیك.

الوالي:-واته خوای گەوره دۆست و نەزیکی خاوەن باوەڕانـه پـشتیوانیان لێ دەکاو کارو فەرمانیان دەبا بەڕێوه, هەروەها خـوای میهرەبـان نـەزیك و یارمـەتی دەری هەموو بونەوەرێکه به گشت ڕەگەزو جۆرەکانیـەوه, بـەلاّم نـەزیکی خـوای گەوره بۆ بێ باوەڕان و له خوا یاخی یان تەنها غەزەب و قینه بەرامبەریانـەوه, وه ئەگەر بیەوێ تۆڵەو ئینتیقامیان لێ وەرگرێو لێیان بسەنێو لەناویان بەرێو توشی دەردو بەلاّیان بکا کەسـێ نیـیه بتـوانێ بـەرگری بکـاو بەرهەڵـستی نـاکرێ, وه کەسیش ناتوانێ خۆی بکا بەسەرپەرشتی کارو فەرمانیان, یا رزگاریان کـاو خـۆی بکا به خاوەنیان, لەم بارەوه خوای میهرەبان دەفەرموێ:- ﴿وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَـوْمٍ سُوءًا فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ ﴾ الرعـد (١١) واتـه-گـەر خـوای گەوره خواستی خراپەی گەلێکی کرد به هـۆی تاوانەکانیانـەوه, ئـەوا هـیچ هێـزو کەسێ نییه خراپـه کـه بەرپـەرچ داتـەوه, وه بێجگـه لـه خـوای گـەوره دۆسـت وپشتیوانێکیان نییه... به درێژایی زەمـان و کـات لـه هـەر شـوێنێ دڵـسۆزانی ڕێگەی ئیمان و باوەڕو بێ دەسەلاّت بووبن ئەوا چینێکی گەمژەو کۆلەوار بـه نـاوی ئاینەوه بۆ نەته ئەنگوستیلەی دەستی نا حەزانی ڕێگەی خوا, وه بەهـەموو جـۆرو نزمێ بەرژەوەندی دونیا پەرستی له باوەش دەگرن و خۆیان به کۆلەواران و سـەرلێ شێوان ناساندووه به وێنەو جل وبەرگیان گوایـه کـەوا دۆسـت و پـشتیوانی یاسـاو فەرمانی خوان, خواش وا له پشتیوانیانه,!! جا ئەگەر ڕەگ و گیانی ئاین بکەوێتـه

دەریاوە یا ژێر زەوی ئەوان هیچ باکیان نیەو بەخەیاڵیشیان دا نایێ خۆ باسی فرمێسك رشتن هەر ناکرێ, وە خوای گەورە تەنها بە ئایەتێ پەردە ئەمالێ لە هەموو هەڵوێستی ڕێویانەو کوڵەوارانەیان, وە هۆشیارانیان لێ بێدار دەکاتەوەو دەیان کاتە گیان و ڕەنگی ئاینەکەی خۆی, وەك دەفەرموێ ﴿ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ﴾ الانفال (٣٤) واتە بە ڕاستی نزیك و دۆستانی خوا تەنها موتتەقیو پارێزەرانن, بەڵام زۆربەیان تێی ناگەن و نازانن....

وە صیفەتی-الوالی- لەگەل-الولی- لە یەك مانا کۆدەبنەوە وە بە درێژی باسی-وەلی-مان کرد...﴿ الا ان اولیاء الله لا خوف علیهم ولاهم یحزنون الذین امنوا وکانوا یتقون ﴾ یونس ٦٣ ...

## ٢٧- المتعال :

ناوێکە لە ناوە بەرزەکانی خوای تزیك و دۆست, بنچینەی ئەم ناوە-علو-ە واتە بڵندی پایەداری. المتعال- واتە ئەم خوایە بەرزەو بڵندەو پاك وبێ گەردە دوورە لە هەرچی ناتەواوی کەم وکوڕی , وە لە هەموو بەنەوەرە پیرۆزترو بەرزترە لە هەموو ڕوو لایەنێکەوە, وە هەر ناتەواویێ کەتووشی دروست کراوانی دەبێ بەلای خۆیەوە بڕیارو فەرمانی لەسەر داوە, وە خۆی دوورە لەوەی بەسەر دروست کراوانی دێ, وە کەسێ نیە بڕیارو فەرمان بەسەر خواوە بکات وە سیفەتی (الکبیر, المتعال) واتە هەردوکیان و جا هەریەکیان سێبەرێکی تایبەتیان هەیەو کاری تایبەتی دەکەنە سەر دڵ و دەروونی ئیمان داران کە بە ووشەو کەلیماتی تر نا تواندرێ ئەم مانایە پێشکەش بکرێ وە بگەیەندرێ چونکە هەر شتێ لە دروست کراوان کاتێ کە تۆ بەگەورەیی دادەنێ هەر چۆنێ بێ ناتەواویەکی تیایەکە بچوکی بکاتەوە, جا هەر دروست کراوێك یان کارێك بە گەورەیی دابنرێی هەر کە ناوی خوای گەورە-جل جلالە-برا ئیتر بچوکەو نزمە.... هەروەها (المتعال) هەر شتێ کە تۆ بە بەرزو بڵندی دادەنرێی هەر کە ناوی خوا برا بچوکەو نزمەو نەوییە، بەراورد ناکرێ بە هیچ شێوەیێ لەگەڵ بەرزو بڵندی خوای گەورەدا, وە لە (١٤) شوێن لە قورئاندا ناوی (تعالی)ی بردوە, کە هەمووی مەبەست بەرزو بڵندی خوای گەورە دەنوێنێ- بۆ نموونە-خوای گەورە دەفەرموێ ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴾ الرعد (٩) واتە خوای گەورە زانایە بەشاراوەو نادیارەکان و وە بەئاشکراو ڕواڵەتەکان, وە گەورەو بەرزو بڵندە ..... هەروەها دەفەرموێ ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ المؤمنون (٩٢) واتە-ئەم خوایە زانایەو بەنادیارەکان و دیارەکان, وە بەرزیو بڵندی بۆ خوایە لەوەی هاوبەشی بۆ دادەنێن-واتە خوای گەورە لە هیچ ڕوێکەوە کەم و کوری نیە تا پێویستی بە هاوبەش بێ و ناتەواویەکی بۆ پڕ بکاتەوە...... (سبحانە وتعالی).........

## ٧٨ـ البـــر :

-ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەو بەرز, بنچینەی ئـەم نـاوە-بـر-ە واتـە چاکیو چاکە... البر-واتە ئەم خوایە چاکەکارە بەرامبەر هەموو دروست کراوانیـیـەوە, بەتایبەتی بەرامبەر خاوەن ئیمان و باوەڕانەوە پاداشتی زۆرو بـێ ئەنـدازە بەرامبـەر بـە چاکەی بچوك دەداتەوە, وەهەر چاکەیێ کە پاك و پەختەیی بـۆ خـوابێ بـەلای کەمـەوە دەقات تا حەوتا قات خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە, هەروەها گەر خواسـتی لێـبێ - گەلێ لەمەش زیاتر دەداتەوە, وەك نموونەمان بۆ دەهێنێتەوەو دەفەرموێ:- ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّـةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرە. واتە-وێنەی ئەوانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن لە ڕێگەی خوا وەکو وێنەی دانە گەنمێکـە کـە بروێـت حـەوت لـق گـوڵی لێ دەرچێت, وە لە هەر لقە گوڵێکدا سەد دانەی تیا بێت, بێ گومان خوای گەورە پاداشـی چاکە کار چەند بارە دەداتەوە بە خواست و ئارەزووی خۆی بە هەر کەسـێ کە بیـەوێ, وە خوای گەورە بەخشش و چاکە فراوانەو زۆر زانایە... هەروەها خوای گەورە بـە زومـانی بەهەشتیان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:- ﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّـهُ هُـوَ الْبَـرُّ الرَّحِيمُ﴾ الطور (٢٨) واتە:-ئێمە کاتی خۆی لێی دەپاڕاینەوەو نزامـان لەبـەر دەکـرد بەڕاستی ئەو خوایە گەورەیە چاکە کارو میهرەبانەو وەبەخشش وبەزەیی فراوانە......

## ٧٩ - التـواب :

-ناوێکـه لـه نـاوه جوانـهکانی خـوای چـاکه کـار. بنـچینهکهی-توبـه- واتـه پهشیمانی... التواب-واته ئهم خوایه تهوبهو پهشیمانی بهنـدهکانی وهردهگـرێ و قـهبوڵ دهکا ههر چهنده گوناهیشی زۆر بێت, به شهرتێ تۆبه بکاو پڕ به دڵ و گیـان و سـۆزهوه پهشیمان ببێتهوهو، لهماوهی ڕابردووی پهندو عیبرهت وهرگرێـو چـاوی لـهوه نـهبێ کـه جارێکی تر بگهڕێتهوه سهر تاوانکاری, وهکو خوای گهوره دهفهرموێ:- ﴿يَاأَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ﴾ تحـريم. وه ههروهها خوای گهوره ههر خۆیهتی چاو پۆشی دهکا له گوناهان و تهوبه قهبوڵ دهکا وهك دهفهرموێ:- ﴿غَافِرِ الذَّنْبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ ﴾ غافر .خوای گهوره نۆ جار ئـهم سـیفهتهی خۆی له قورئانی پیرۆزا ناو بردووه, بۆ نموونه دهفـهرموێ :- ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُوْلَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ البقره(١٦) هـهروهها دهفـهرموێ:- ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَـوَّابٌ رَحِـيمٌ ﴾ الحجـرات (١٢) خـوای گـهوره گوناهکـاران و تاوانباران هان ئهدا بۆ ئهوهی بهڵکو بگهڕێنهوهو رزگاریان ببێ له دونیاو قیامهتدا, وهك دهفهرموێ:- ﴿وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ﴾ هود(٩٠) وه گهلێ ئایهت و فهرموده لهم بارهوه ههیه, ئهوهی دهیهوێ زیاده ئاگاداری ههبێ با سهیری (رياض الصالحين) بکات له مهوزوعی (باب التوبه), دا... جا ئهم سیفهتهی خوای گهوره دهبێ وامان لێ بکا که بهردهوام له گوناه و ههڵهکانمان پهشیمان بـین . وه ههمیـشه داوای لێ خـۆش بـوون لـه پهروهردگاری بێ هاووتا بکهین وه خۆمان فهرامۆش نهکهین کهوا موسـوڵمانین و ئیمـان دارین, وه خوای گهوره له زۆربهی ئایهتهکانا داوای له ئیمانداران کردوه که تهوبه بکـهن و بگهڕێنهوه لای خواو لێیهوه غافڵ و بێ ئاگا نـهبن... باشـترین بهڵگـهش لهسـهرۆك وپێشهوامانا-ﷺ- که دهفهرموێ:- عن ابی هریره- (قال سمعـت رسـول الله-ﷺ- )يقول"والله اني لاستغفر الله واتوب اليه في اليوم اكثر من سبعين مرة"رواه البخـاري .واته-له ئهبو هورهیرهوه دهگێرنهوه که ووتویهتی لـه پێغهمبـهری خـوام بیـستووه کـه فهرمویهتی قهسهم به خـوا مـن داوای لێ خـۆش بـوون و لێ بـوردن لـه خـوا دهکـهم و پهشیمان دهبهمهوه لای له ههموو رۆژێك زیاتر له حهوتا جار....

## ٨٠- المنتقم :

ناوێكه له ناوه جوانه‌كانی خوای ته‌وبه وه‌رگر, بنچینه‌ی ئه‌م ناوه-انتقام-ه واته تۆڵه سه‌ندنه‌وه... المنتقم- واته خوای گه‌وره تۆڵه‌سێنه‌ره له‌سته‌م كاران و زاڵمان , جا به‌پشتیوانیه‌تی سته‌م لێ كراو بێ یا به‌غه‌زه‌ب و نازاری ڕاسته‌وخۆیێ, یا له ڕۆژی دوایی بێ له ناو ئاگری دۆزه‌خ و جه‌هه‌نده‌ما-گومان له‌وه دانی‌یه كه خوای تۆڵه‌سێن یه‌ك زه‌ره‌ش زوڵم وسته‌مكاری ناخاته پشت گوێو فه‌رامۆشی ناكا, به‌ڵكو ناسته‌وانه‌ی هه‌ق و ڕاستی ده‌كا, خوای گه‌وره یا له دونیا یا له قیامه‌ت وه‌یا له دونیاو قیامه‌ت تۆڵه ئه‌سێنێته‌وه له‌وانه‌ی شایانی ئه‌وه‌ن تۆڵه یان لێ بسه‌ندرێته‌وه، له‌وانه‌ی خوای گه‌وره تۆڵه‌ی لێ‌سه‌ندونه‌وه ڕاسته‌وخۆ وه‌ك گه‌لی نوح وهودو صالح و شوعه‌یب وموساو پێغه‌مبه‌رانی تریش- علیهم الصلاة والسلام-, ئه‌مه له دونیا وه قیامه‌تیش له‌وێ بوه‌ستێو، وه‌یانیش خوای گه‌وره هه‌ر له قیامه‌ت هه‌ندێ كه‌سانێ سزای سه‌ختیان ئه‌داو تۆڵه‌یان لێ ده‌سێنێته‌وه, جا كاتی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه له عیلمی خودا دایه, وه حیكمه‌ت و دانایی خوای گه‌وره ئه‌زانێ كێو كه‌ی چه‌ن و چۆن تۆڵه ده‌سێنێته‌وه, كاتێ كه خوا ناسان باوه‌ڕیان نه‌هێناو له‌سه‌ر گومڕایی خۆیان به‌رده‌وام بوون, وه‌ك ده‌فه‌رموێ:- ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ رُسُلاً إِلَى قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنْ الَّذِينَ أَجْرَمُوا وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ الروم (٤٧) واته بێ گومان ئه‌ی نێردراوی خوا له‌پێشه تۆوه ڕه‌وانمان كرد چه‌ند فرستاده‌یێ بۆ لای گه‌لانی خۆیانه‌وه به به‌ڵگه‌و موعجیزاتی ئاشكرا, وه تۆڵه‌مان سه‌ند له‌وانه‌ی تاوانكاریان كردوه به ڕاستی حه‌قێكی سه‌ر ئێمه‌یه سه‌ركه‌وتنی ئیمانداران... به ڕاستی ئه‌مه موژده‌و مزگێنیه‌كی زۆر گه‌وره‌یه بۆ

موسوڵمانان و خاوەن باوەڕان.. وە هەروەها دەفەرموێ:- ﴿فَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّـهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ ابراهیم/ ٤٧ . واتە-حیساب مەکەن کە خوا وادەی خۆی بەجێ نەگەیەنێ لەگەڵ پێغەمبەرانی , بەڕاستی خوای گەورە خاوەن عیززەت و دەسەڵات و تۆڵە سێنەوەیە. وە خوای گەورە بەم سیفەتەی پشت و پەنای ستەم لێ کراوانەو تۆقێنەری ستەم کارانەو، وە زۆرداران و زاڵمان دەترسێنێو هەڕەشەیان لێ دەکا, ... بۆیە دەبێ موسوڵمان دڵنیابێ کە شکست نایەنێ هەمیشە خوای گەورە چاودێری دەکاو لەولاشەوە ڕێگەی زاڵمان دەگرێو, لە لووت بەرزیان دێنێتە خوارەوە. وەك دەفەرموێ:- ﴿إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ السجده (٢٢).........

## ٨١- العفو:

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای تۆڵەسێن, بنچینەی ئەم ناوه-عفو-ه واته چاوپۆشیو لێخۆش بوون.... العفو- واته خوای میهرەبان چاوپۆشی دەکا لەگوناهی ئەو کەسانەی کەتەوبه دەکەن و پەشیمان دەبنەوه لەو کاره ناپەسندانەی کردوویتیان وه چاکەو چاکه کاری به دواوه ڕەوان دەکەن, وەك خوای گەوره دەفەرموێ:- ﴿وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنْ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ الشورى (٢٥) واته-ئەو خوایه هەر خۆیەتی تەوبەی لە بەندەکانی وەردەگرێو وه چاو پۆشی لەتاوانەکانیان دەکات, گەر تەوبه بکەن و پەشیمان ببنەوه بەلای خوای گەوره... هەروەها دەفەرموێ ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ النساء (٩٩) هەروەها دەفەرموێت:- ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ ﴾ الشورى (٣٠) واته-توشی هەر ڕووداوێ بن به هۆی ئەنجامی کارەکانی دەستی خۆتانه, وه چاوپۆشیشمان کردووەو دەیکەن له زۆر کاره نابەجێ یەکانتانا.. خوای گەوره ئەم سیفەتەی بە سیفەتی خاوەن باوەڕەکانیشی دادەنێو هانیان دەدا بەوەی که چاو پۆشی له یەکتر بکەن, وەك دەفەرموێ:- ﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ ال عمران (١٣٤) واته- ئەوانەی مالی خۆیان دەبەخشن له کاتی خۆشیو ناخۆشیاو ئەوانەی توڕەییو قینی خۆیان دەخۆنەوه لەبەر ترسی خوای گەورەو وەچاو پۆشی دەکەن له تاکەکانی مەردووم, بێ گومان خوا پیاو چاکانی خۆش دەوێ.... هەروەها ڕوو به پێغەمبەر دەفەرموێ:- ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴾ المائده (١٣) واته چاو پۆشیان لێ بکەو ڕوو نەرم و فراوان بە بەڕاستی خوای گەوره پیاو چاکانی خۆش دەوێ... وه له عائیشه دەگێڕنەوه که پێغەمبەر-ﷺ- پێی فەرموو که دوعا بکاو بلێ (اللهم انك عفو كريم تحب العفو فاعف عني) واته پەروەردگارم تۆ لێ خۆش بوو چاو پۆش و بەخشندەی، وه حەز له چاو پۆشی دەکەیت، لێم خۆش بەو چاو له گوناهەکانم بپۆشه......

## ٨٢ ـ الرؤوف :

ناوێکه له ناوەکانی خودای گوناه پۆش, بنچینەی ئەم ناوە- رأفة-ە واتـه سـۆزو میهرەبان...... الرؤوف: واته- خوای گەورە میهرەبان و بـەزەیی‌و لیّ خـۆش بـووە، وە حەز دەکا بەندەکانی لەسەر ڕێبازە جوان ولێهاتوەکەی بڕۆن و شوێنی پێغەمبەران و پیاو چاکان بکەون, وە عاشقی خۆشەویستی خوای گەورە بن و لە چـاکە کـاری لەگـەڵ یـەکا پێشبڕکیّ بکەن, تاکو سەر بەرزی‌و ڕوو سـپیاتی دونیـا قیامـەتیان دەسـت کـەویّ وەك دەفەرمویّ ﴿وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَـرَءُوفٌ رَحِـيمٌ ﴾ البقـرة (١٤٣) واته-به ڕاستی خوای گەورە ئیمانی ئێوە بەزایەو فیڕۆ نادات, چونکە بیّ گومان خوای میهرەبان لەگەڵ مـەردومان زۆر بـەزەیی‌و میهرەبانـە... هـەروەها دەفـەرموێت ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَاللّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَـادِ ﴾ ال عمـران (٣٠) واتـه-خـوای گـەورە ئاگادارتان دەکاتەوە لە نەفس و گیانی خـۆی, بـە ڕاسـتی‌و بـیّ گومـان میهرەبانـە بـە بەندەکانی‌یەوە هەورەها خوای گەورە مەدحی ئەو کەسانە دەکا کە لە دوای هاوەڵـەکانی پێغەمبەرەوە- ﷺ-دێن و ئەم دوعایەو نزایە پـڕ بـە دڵ و بـە گیانـەوە ئـەخوێنن, وەك دەفەرمویّ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَـبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ الحشر (١٠) واته- پەروەردگارە لێمان خۆش بە وە لە برایانی خاوەن ئیمان کە پێش ئێمـە کـەوتوون, وەدڵمان بە لادان مەگێڕە لەڕاست ئەوانەی ئیمانیان هەیە, پەروەردگارە بە ڕاستی تۆ زۆر بەزەیی‌و میهرەبانی.... خوای گەورە مەدحی پێغەمبەر- (ﷺ) دەکات بەم سیفەتەیەوە وەك دەفەرمویّ: ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴾ التوبة (١٢٨) واته- پێغەمبـەر (ﷺ) ڕوو بە ئیمان دارانەوە, بە میهرەبان و سۆزو بەزەیی‌یە، وە هـەروەها ئیمـان داران پێویـستە لەگەڵ یەك بە سۆزو خۆشەویست و میهرەبان بن...

## ٨٣ - مالك الملك :

ناوێکه له ناوه بەرێزەکانی خوای میهرەبان و بەزەیی... مالك الملك:- واته خوای گەورە هەر خۆی خاوەنە بە هەرچی موڵك و دارایی هەیە، لەو موڵك و داراییەش هیچ هاوبەشێك و شەریکێکی نەبووەو نییەو نابێ، وە هیچ موڵك و سامان و دارایی نییە چ گەورەو چ بچووك ئەوە تەنها مولکی خوایەو بەس، کە ئادەمیزادی کردووە بە وەکیل لەسەر بەشێکی کەمی دارایی مانای وانییە لە مولکیەتی خوای گەورە دەرچوو نەما!!، بەڵکو ئادەمیزادەکانیش مولکی خوان، وە کەسێ بۆی نیە دەست کاری موڵك و سامانی خوا بکا مەگەر خواست و ئیرادەی خۆی، وەك دەفەرموێ:-﴿ قُلْ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ال عمران.. جا کاتێ موسڵمان تێگەیشت کە تەنها خوای گەورە خاوەن ڕاستەقینەی هەموو مولکە لەم جیهانەدا، وە تەنانەت هەر خۆشی خاوەن مولکی ڕۆژی دواییە، وەك دەفەرموێ:- ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾، ئیتر نابێ بە هیچ جۆرێ نەخۆی نە کەسێکی تر بە خاوەن و مەلیکی هیچ شتێ بزانێ، تەنانەت خوێن و گیانی خۆیشی وە ماوەی تەمەنی وەماڵ ومناڵ وکەس وکاری..وە..وە..هتد هەمووی مولکی خوایەو سپاردەیە لەم جیهانە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم... بۆیە ئیماندار لە بەخشینی ماڵ و سامانی درێغی ناکا، وە لە کاتی پێویستیدا لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەست بەرداری ماڵ و مناڵ وکەس وکاری دەبێ، وە تەنانەت گیانە شیرینەکەی خۆشی بۆ پێشکەشی خوای گەورە ئامادە کردووە، وە خۆی ئەدا بەکوشت و پلەی شەهیدی لە دەست خۆی نادا.. وە نەبێ لەدەست بەردانی ماڵ و سامان، کەمێ لە مولکی خوای گەورە زیاد بکا -نەخێر-چونکە ئەم بە خۆی وسامانەوە مولکی خوای گەورەن، بەڵام دڵسۆزیو پاکی بەندە دەنوێنێ... وەبێ سنووری موڵك و سامانی خوای گەورە زۆر لەوە بەدەرترە کە ژیرو بیری ئادەمیزاد بۆی بچێت. وەك لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ خوای گەورە فەرمویەتی:- ﴿ یا

عيادي لو ان اولكم واخركم والسكم وجنكم قاموا في صـــعيد واحـــد فـــسألوني فاعطيت كل واحد مسألته ما نقص ذلك مما عندي الا كما ينقص المخيط اذا ادخل البحـــر ﴾ رواه مـــسلم.. واتـــه ئـــهى بهنـــدهكانم ئهگـــهر ئيّـــوه هـــهر لهســـهرهتاييهكهتان تادواييهكهتان نادهميزادهكان جنهكانتان ڕابوهستن لهسهر پارچه زهويىـو لـيّم بپاڕيّنـــهوه لهههرچى دهتانهوىّ, بهش و بارى ههريهكهتان ئهدهم به تهواوى, هيّشتا ئهمه له مولّكى من كهم ناكات, مهگهر تهنها ئهوهنده نهبىّ كه دهرزيىّ بخهيته دهريايىّ...

## ٨٤ ـ ذوالجلال والاكرام :

ناوێکه له ناوه بەرزەکانی خوای خاوەن موڵك و سامان... ذوالجلال والاكرام:- واته خوای گەورە شایستەیە بۆ ئەوەی ڕێزی تەواوی لێ بگیرێ و نا فەرمانی نەکرێو مل کەچی بۆ بکرێو وەسەر پێچی لێ نەکرێو قەدری بزانرێو بپەرسترێ, وە شوکرانە ژمێرێو سوپاس گوزاری بکرێ, وە دەبێ لەگەڵ یادکردنیا بژین و لەیاد نەکرێ:- ئەم سیفەتەی خوای گەورە دووجار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە هەر دووجار لە سورەتی (الرحمن) دایە وەك دەفەرموێ:- ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ(٢٦)وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ﴾ واتە-هەرچی بوونەوەرە لە نێو دەچێ, تەنها پەروەردگاریەتی خاوەن عەزەمەت و گەورەیی و ڕێز دەمێنێتەوەو باقییە، هەروەها دەفەرموێت:- ﴿تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ﴾ جا کاتێ موسوڵمان لەناستی ئەم سیفەتە خوادا دەوەستێ ئیتر دڵنیا دەبێ کە تەنها خوای گەورە شایستەی ڕێزو قەدرو بەرزی ڕاستەقینەیە, وە تەنها سەری بەندایەتی بۆ ئەو کەچ دەکات, وەکو نەفام و کۆڵەواران و لەخوا بێ ئاگایان بۆ هیچ لایەنێ و بۆ هیچ شتێ کڕنوش نابات , وە تەنیا سەری بەندایەتی بۆ خوای گەورە کەچ دەکات...وەکو کۆڵەواران و ناحاڵیان ناکات لەکام لا بای بێت شنەبا بکات، وەسەر بۆ هەموو لایەنێك و کەسێك شۆڕ بکات، وەئیماندار دەزانێت کە دەبێ نوێژو عیبادات و ژیانیو مردنی تەنها بۆ خوای گەورە بێت -بۆیەش بە سوننەت ئەم بەڵێنە نوێ دەکاتەوەو,کردوویتیە بە پێشەکی سورەتی فاتیحە لەنوێژدا- وەك دەفەرموێ ( إن صلاتِي ونسكي ومحياي ومماتي لله ربّ العالمين-.... هتد) وە هەمیشە دوعاو پاڕانەوەو نزای ڕوو بە خوایە هەر ئەو بەسەرچاوەی هەموو ڕێزو بڵندو گەورەییەك دەزانێ...

## ٨٥ـ المقسط:

ناوێکه له ناوه پیرۆزه‌کانی خوای خاوه‌ن گه‌وره‌یی‌و ڕێز بنچینه‌ی ئه‌م ناوه -قسط- ه واته دادو عه‌داله‌ت و دادپه‌روه‌ری:- المقسط -واته خوای گه‌وره به‌خشێنه‌ری حه‌ق و ماف و ڕزق و ڕۆزی‌یه‌وه له‌وپه‌ڕی دادپه‌روه‌ری‌و عه‌داله‌ت دایه له هه‌موو ڕوو لایه‌نێکه‌وه له دونیاو قیامه‌ته‌وه, تۆڵه له زاڵم و سته‌مکاران ده‌سێنێ, ئه‌و که‌سانه‌ش که دادپه‌روه‌ری‌و عه‌داله‌ت له خۆیانا ده‌هێنێته‌دی له‌م دونیایه‌دا ئه‌وه خواش خۆشی ده‌وێن, وه‌ك له‌سێ ئایه‌تی قورئانی پیرۆزدا هاتووه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ المائدة, الحجر, الممتحنة... وه خوای گه‌وره له چه‌نده‌ها ئایه‌تی قورئانی پیرۆزدا داوا له خاوه‌ن باوه‌ڕان ده‌كات كه عادل و دادپه‌روه‌ر بن , یه‌كێ له‌م ئایه‌تانه وه‌ك ده‌فه‌موێ ﴿وأوفوا الكيل والميزان بالقسط﴾ الانعام (١٥٢) وه له ڕۆژی دوایی خوای گه‌وره ته‌رازووی عه‌داله‌ت و دادپه‌روه‌ری ئه‌نجام ئه‌دا, وه‌ك ده‌فه‌رموێ:- ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ الانبياء (٤٧).... وه خوای گه‌وره پێغه‌مبه‌رانی ڕه‌وان كردووه‌و په‌ڕتوكی پێ داون بۆ به‌جێ گه‌یاندنی ئه‌وپه‌ڕی دادپه‌روه‌ری‌و عه‌داله‌ت له‌نێوان خه‌ڵك و مه‌ردومدا, هه‌روه‌ك ده‌فه‌رموێ ﴿وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد (٢٥) وه سیفه‌تی (القسط) هاوتایی سیفه‌تی (العدل)ه كه به‌درێژی باسمان كرد......

## ٨٦- الجامع :

ناوێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای دادپەروەر، بنچینەکەی -جمع-ە واتە کۆکردنەوە:- الجامع-واتە خوای گەورە کۆکەرەوەو لێك نزیك کەرەوەی هەر شتانێ و کەسانێکە بەویست و ئارەزووی خۆی لەهەر کات و ساتێ بێ، وە یا لە هەر شوێن و مەکانێ بێ، هەروەها لە کاتی هاتنی رۆژی دوایی‌دا رۆژو مانگ و ئەستێرەکان کۆدەکاتەوەو ئەیان دا بەیەك وەك دەفەرموێ:- ﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾ القیامة. هەروەها خوای گەورە کافران و مونافیقان کۆدەکاتەوە لە دۆزەخدا گشتیان بەیەکەوە، وەك دەفەرموێ:- ﴿إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ النساء، وە لەسەر زوبانی موسوڵمانان پێمان ڕادەگەیەنێ کە پەروەردگارمان کۆکەرەوەی هەموو خەڵك و مەردووما لە رۆژێکدا کە هیچ شك و گومانی تیانییە، بە ڕاستی خوای گەورە لە بڕیارو وادەی خۆی لانادا، وەك دەفەرموێ:- ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ ال عمران (٩) هەروەها دەفەرموێ:- ﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا﴾ النساء (٨٧) واتە-بە غەیری خوای گەورە هیچ مەعبوودو پەرستراوێ نیە، بێ گومان کۆتان دەکاتەوە لە رۆژی قیامەتدا کە شایانی شك و گومان نیە، وە کوێ لە خوای گەورە ووتارو گوفتار ڕاسترە؟ پاکی بۆ تۆیە ئەی میهرەبان... هەروەها خوای گەورە ڕەحمەت وبەزەیی و میهرەبانی لەسەر خۆی بڕیار داوەو هەر کۆتان دەکاتەوە لە رۆژی دواییدا کە هیچ شك و گومانی تیا نیە، وەك دەفەرموێ

﴿كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ الانعام (١٢) جا دەبێ موسوڵمان هەوڵ بدا خۆی بخاتە ڕیزی باوەڕدارە تازەکان و بە هیوای ئەوەی کە خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەران و زانایان و شەهیدان و پیاو چاکان کۆی بکاتەوەو وە دوری بخاتەوە لە دووڕوان و بێ بڕوایان......

## ٨٧- الغنـــي:

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای کۆکەرەوە, بنچینەی ئـەم نـاوە-غنـا-یـە واتـە دەوڵەمەندیو بێ نیازی. الغني-واتە خوای گـەورە دەوڵەمەنـدی بـێ سـنورە لـە هێـزو دەسەڵات لە زانست و زانیاری لـەماڵ و سـامان دا...هتـد, لـە هـیچ ڕوو لایەنێکـەوە پێویستی بە هیچ کەسێو شتێ نیە, چونکە خوای گەورە بێ نیازە لە غەیری خۆیەوە, وە هەموو شتێ نیـازو ئومێـدو پێویـستی بـەو هەیـە, ئـەویش فـەزڵ و بەخشـشی زۆرەو گەنجینەی هەرگیز تەواو نابێو خەزێنەی هـەرگیز خـاڵی نابێـت, وە ئەوانـەی کـە مـاڵ دەبەخشن با بزانن کە خوای گەورە بێ نیازە لـە خێـرو خێراتـی ئـەوان, وە هـەر لەبـەر قـازانجی خۆیانـا ناوەهـا هانیـان دەدات بـۆ بەخـشش, ئـەویش لـە بـەرگی خۆیـدا میهرەبانییێکی تری خوایە بۆیان, وە ئەوەنـدەش میهرەبانـە پاداشـی زۆر بەرامبـەر بـە چاکەی کەم دەداتەوە.... ئەم سیفەتە پیرۆزە...-١٧-جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.. یەك لەم ئایەتانە دەفـەرموێ ﴿ قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴾ البقرة (٢٦٣) واتە:- ووتارو گوفتاری شیرین و باش لەگەڵ لێ خۆش بوون و لێ بووردەییو ڕوو خۆشی باشترو خێرترە لە خێرێ ئەزیەت و منەت و قسەی بـە دواوە بێ, وە خوای گەورە دەوڵەمەندو بێ نیازو لەسەر خۆیە تەنانەت موسوڵمان بـۆ نیـشمان هـەر لەبـەر سـەرفرازی خۆمانـە, دەنـا خـوای گـەورە موحتـاج و پێویـست نیـە بـە موسوڵمانێتیمان, وەك دەفەرموێ:- ﴿وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ الْعَالَمِينَ ﴾ ال عمران (٩٧) واتە-ئەوەی بێ باوەڕبێ ئەوا بە ڕاستی خوا بێ منـەت و بـێ نیـازە لـە هـەموو جیهانیان وە لەوەی تیایدایە... وە جیهادو هەوڵ و تێکۆشانیش بـۆ گەیانـدنی پـەیامی خوای گەورە هەر بۆ سەرفرازیو خۆش بەختی خۆمانە, وەك دەفـەرموێ:- ﴿وَمَنْ جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ الْعَالَمِينَ ﴾ العنکبوت (٦).واتە- ئـەوەی جیهـادو تێکۆشان بکات بێ گومان بۆ گیانی خۆیەتی بە ڕاستی خوای گەورە بێ نیازو ئومێدە لە جیهانیان....

## ٨٨ـ المغني :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای گەورەو دەوڵەمەندو بێ نیاز, بنچینەی ئەم ناوه وەکو ناوەکەی پێشوو (غني) یە واتە دەوڵەمەندیو بێ نیاز. المغني-واتە خوای گەورە بێ نیاز دەکا هەر شتێو هەر کەسێ کەبیەوێ, وە دەوڵەمەندو چاوتێری دەکا جا لە هەر چ ڕوو لایەنێك بێ ماڵ و سامان بێ, زانست و زانیاری بێ، ئیمان و باوەڕبێ, ڕەوشت و ئەخلاق بێ, جەمالیو جوانی ڕواڵەت بێ, بەزەییو ڕەحمەت و مەحەببەت بێ, قودرەت و توانایییو هیمەت بێ یا کۆکراوەی هەموویان یا هەندێکیان بێ ..هتد..بێ گومان خوای گەورە دەسەڵاتی تەواوی هەیە بۆ بێ نیاز کردنی هەر کەسێ لە هەر شتێ کە بیەوێ لە بەندەکانی، یا بۆ بێ نیاز کردنی هەر شتێ بێ لە پێداویستیەکانی وەك دەفەرموێ:- ﴿وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَى وَأَقْنَى﴾ النجم (٤٨) واتە-بە ڕاستی هەر خۆیەتی-واتە خوای گەورەیە- بێ نیاز دەکا هەر کەسێ بیەوێ و وە قەناعەت و قینیات ئەدا... خوای گەورە هانمان ئەدا بەوەی کە کچانی موسوڵمان بدرێت بە شوو وە گەنجانی صالح و پاك ژنیان بۆ بهێنرێ, خۆ ئەگەر هەژارو نەدارین ئەوا خوای گەورە خۆی دەوڵەمەندیان دەکا چونکە خوای گەورە بازاڕی بەخشش و زانیاری فراوانەوە خۆی بەندەکانی باش دەناسێ وەك دەفەرموێ:- ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ النور (٣٢) هەروەها بە موسوڵمانان ڕادەگەیەنێ کە قەدەغەکەن و نەیەڵن هاوبەش پەیداکەران لە (بيت الحرام) نزیك بکەونەوە چونکە پیسن وە ئەگەر لە هەژارییو نەداری دەترسن, ئەوا خوای گەورە لە ئایندەدا بە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکا, وە ئەو هەموو کانە نەوتە زۆرەی لە نیوە دورگەی عەرەب پەیدا بووە, بەڵگەیە لەسەر ئەم

بەڵێن و وەعدە خواییە, وەك دەفـەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُـشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلاَ يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَـةً فَـسَوْفَ يُغْنِيكُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ إِنْ شَاءَ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ التوبـه (٢٨) جـا ئێمـەی خاوەن باوەڕ دەبێ لە ڕێی تێکۆشانمانا هەر چاومان لە قاپی ڕەحمەتی خوا بـێ بـۆ ئەوەی بێ نیازمان بکا لەوەی کە بۆی پەرۆشین وموحتاجین, بێ گومان خوا ئاگـای لە ئاوات و ئامانجی هەمووانەو یاریدەدەری ئیماندارانە...

## ٨٩ ـ المعطي :

ناوێکه له ناوه جوانه دڵخۆشەکانی خوای بێ نیاز کار, بنچینەی ئەم ناوه-عطا-یه واته بەخشش .. المعطي- واته خوای گەوره بەخشێنەری هەر شتێ هەر چەن و چۆنێ و هەر کات

و زەمانێ بێ بـه هـەر کەسـێ کـه دەیـەوێ بەخواسـت و ئـارەزووی خـۆی دەی بەخشێنێ..., وه هەرچی له بارو گونجاوه بۆ هەر کام له مەخلوقات و دروست کراوانـی پێیان ئەدا... بۆ نموونه شکل و شێوەی تایبەتی بەخشیوه به زینـدەوەران و گیانـداران, جا هەر له ئادەمیزادەوه بگره تا ئاژەڵ و گیانداره ئاوییەکان , وه باقی گیاندارانی تـر, وه هەر کام به گوێرەو پێویستی سروشتی تایبەتی خۆی که پێێ بەخـشیون , بـۆ نمونـه دەبینی هەر گیاندارێ وه یا هەر گیان لەبەرێ بەرادەی پێویستی خۆی خـوای گـەوره رێ نموونەیی کردووەو سروشتێکی داوەتێ , که پێویستی خۆی پێ جێ به جێ بکا, وەك بـه زمانی حەزرەتی موسی دەفـەرموێ:- ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَـدَى ﴾ طه(٥٠) وه خـوای گـەوره بەخشـشی بـۆ ئیمـان داران لـه بەهەشـتدا نەبڕاوەیـه وەك دەفـەرموێ:- ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُوا فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَـا دَامَـتْ الـسَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاءَ رَبُّكَ عَطَـاءً غَيْـرَ مَجْـذُوذٍ ﴾ وه لـه دونیـادا بـه خواناسـان و خوانەناسان دەبەخشێ, وەك دەفەرموێ:- ﴿كُلاًّ نُمِدُّ هَؤُلاَءِ وَهَؤُلاَءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾ الاسراء (٢٠) جا ئیتر دەبێ موسوڵمان بەم باوەڕەوه ڕوو له قاپی بارەگای خوای گەوره بکاو تەنیا چاوەڕوانی گەنجینـەو خەزێنـەی نـەبڕاوەی خـوای میهرەبان بێ, ئەم ئیمان و باوەڕەش چاوتێری دەبەخشێ به ئیمانداران بەوەی که چـاویان لەم دەست و ئەو دەست نەبێ, وه له دڵەڕاوکەو حەسودیەو گەلێ نەخۆشی دەروونی تریش دەیان پارێزێ و دووریان دەکاتەوه, ئەمەش جـۆره بەخـشش و نیعمـەتێکی تـری خـوای گەورەیه-جل جلاله.....

## ٩٠- المانع :

ناوێکە لە ناوەکانی خوای بەخشش فراوان, بنچینەی ئەم ناوە-منع-ە واتە قەدەغە کردن و مەنع کردن...

المانع:-واتە خوای گەورە بەرهەڵستی کارو قەدەغەکاری ئەو کارو فرمانانەیە کە لە دەرەوەی حیکمەت و دانایی ئەوبێ - (جاچ ئەم کارو فەرمانە لەلایەنی نادەمیزادەکان بێ وە یا لە لایەن جنەکان بێ )- هەروەها بە خواست و ئیرادەی خۆی دەتوانێ قەدەغەی هەر شتێ بکاو لەهەر کەسێ کە بیەوێ, جا بە هەر چ شێوەیەك بێ یا هەر چەن و چۆن و وەکەیو لە کوێ بێ, هەروەها بەرگری دەکا لەوەی کە هۆی تیا چوون روو بکاتە شتێك و خوای گەورە بیەوێ بێنێتەوە, باشترین نموونەش بۆ ئەمە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەکە چەندەها هۆیان بۆ ساز کردووە بۆ نەهێشتنیو لەناو بردنی, تەنانەت زۆر لە کۆڵەوارانی بەناو زانا, یا ئاین پەروەریان کردوەتە عەلقە لەگوێی خۆیان, وە بە درێژایی زیاتر لە هەزارو چوار سەد ساڵە (١٤٠٠)ە پیلان و فرۆفێڵی بەسەرەوە یا لە دوو دەگێرن بە ئومێدو هیوای لەناو بردنیو هەڵکەندنی رەگ و ریشەکەی, بەڵام چونکە خوای گەورە دەیەوێ بێنێتەوە هەموو هۆیەکانیان بەزایە چووەو, لێیەوە دەستەوەستانن تا لە لایەنی هەڵی کوتنە سەری لەلایەکی تر رەگ و ریشەی دادەنێو دائەکوتێتەوەو سەر هەڵدەدا... وە هەر شتێ کە خوای گەورە بیبەخشێ کەسێ ناتوانێ بەرهەڵستی بکا, وە هەرچی خوای گەورەش بەرهەڵستی بکا کەسێ ناتوانێ بیبەخشێ وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە دوعاکانیا رووی دڵی دەکردە خوای گەورەو دەی فەرموو:- (اللهم لامانع لما اعطيت ولامعطي لمامنعت ولا راداً لما قضيت ولاينفع ذا الجد منك الجد) واتە ئەی خوای گەورە قەدەغە کەرێ نیە لە بەخششت, وە بەخشندەرێ نیە لەوەی قەدەغەت کردووە, وە گێرەوەرێ نیە لەوەی ئەیبەیتەوە یا رەد کەرەوەیێ نیە لە کارو فەرمانەکانت , وە لای تۆ رەسەن و تیرەو باپیرە سوود ناگەیەنێ.... ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئێمەش چاو لە پێغەمبەر-ﷺ-بکەین و ئەم وێردە بخوێنین......

## ٩١ - الـضـار :

ناوێکە لە ناوە دڵ تەزێنەکانی خوای بەرهەڵستی کار, بنچینەی ئەم ناوە-ضرر-ە واتە زیان وزەرەر... الضار-واتە خوای گەورە زیان لێدەرە لە هەر شتێ وە یـا لەهـەر کەسێ بیەوێ جا کەم بێ یا زۆر بێ وە بە هەر شێوەیێ بێ وە یا لە هەر لایەن و ڕێگەوە بێ جا لە دونیا بێ یا لە قیامەت بێ, بێ گومان ئەمـەش لەبـەر هـەزاران حیکمـەت و داناییەوەیە, وە شایان و شایستەی ئەم زیانەن دەنا خوای گەورە زیان لە کەس نادا, بۆ نموونە جاری وا هەیە تۆڵە لە تاقمێ یا دەسـتەیێ یـا ناوچـەیێ دەسـێنێ, وە بـە هـۆی نادانیو بێ نەزاکەت و بەرەڵڵاییو ناپاکیانەوە توشی بەڵای جۆراو جۆریان دەکا, جا یا لە لاشەیان یا لە دڵ و دەروون و گیانیان, یا لەناو بردنی ماڵ و سامان و داراییان, یـا ڕیسوا کردنیان و سووك کردنیان , یا خستنەوەی قات و قڕیو گرانـی تیایانـدا, یـا بـە بوومە لەرزەو ڕەشەبا, یا لافاوو باران و, یا هەورە بروسـکە یـا بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی جۆراو جۆر یا دڵ جیاییو پێك نەهاتن و نا تەبایی.... هتد. وە لە ڕاستیدا ئـەو زەرەرو زیانانەی بەبێ بڕوایان دەگات زەرەرو زیان نیە, وە ڕەوانیە کـە موسـیبەتی زەرەرو زیـان بدرێتە لای خوای گەورەو بەخشندە بەڵکو خۆیان بۆ نەتەمایـەی تۆڵـە سـەندن و سـزای خۆیان, وە لە ڕاستیدا ئەمە جۆرە بەخشش و نیعمەتێکی تری خوایە بـە هیـوای ئـەوەی بگەڕێنەوە سەر ڕێگەی ڕاست و خۆیان تووشی زەرەرو زیانی گەورە تری دونیایی نەکـەن وە خۆیـان تووشـی ئـازاری گـەورەی جەهەنـەم ودۆزەخ نەکـەن , وەك دەفـەرموێ:- ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ السجدە (٢١). واتە پێتان ئەچێژین لە ئازاری گچکە بێجگە لە گەورەترین عـەزاب و ئـازار بـە هیـوای ئەوەی بگەڕێنەوە، وە لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندەها ئایەت دەست نیشانی کـردووە کـە هەر قەومێ تووشی بەڵاو دەردو نارەحەتی ببن سەرەنجامی کارو هەڵوێستی خۆیانە, وەکو خوای گەورە ڕوو بە کافران و بێ باوەڕان دەفەرموێ:- ﴿ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْـدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلاَّمٍ لِلْعَبِيدِ﴾ ال عمران (١٨٢) گومان لەوەدا نیە کە تۆڵە سـەندن لـە بـێ باوەڕان دادپەروەرییو عەدالەتی خـوای گەورەیـە.... هـەروەها هـەڵگرو لابـەری بـەڵاو

ناخۆشی‌و نارەحەتی هەر خوای میهرەبان و بەخشندەیە.. وەکو خوای گەورە بە پێغەمبەر-صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێ:- ﴿وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ ﴾ ئەوەشمان بە بیر نەچێت هەندێ جار بەندە خۆشەویستەکانی لەبەر چەندەها حیکمەت و دانایی تاقی دەکاتەوە, وەکو حەزرەتی ئەیوب کە تاقی کرایەوە, وە هاواری لێ بەرز بۆوەو فەرمووی: ﴿...أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾ الانبیاء .
واتە حەزرەتی ئەیوب لەبەر پەروەردگاری پاڕایەوە ووتی کە من تووشی زەرەرو نارەحەتی بووم وتۆش لە هەموو کەسێ بە رەحم و بەزەیی تری... کاتێ کە موسەڵمان زانی وتێ گەیشت کە خوای گەورە -الضار-ە هەموو ترس دڵی و دەروونی ئاراستەی دەکات ئەمەش دەبێتە نەترسان لە غەیری خوا, چونکە ترسان لە خوای گەورە, ئادەمیزادی نورانی‌و جوان دەکا, بە هەیبەت و سامی دەکا, ئازاو چاو نەترسی دەکا, بیرو هۆشی فراوان دەکا, لەسەر خۆو بەئارامی دەکا, سەخی‌و چاکە کاری دەکا, دڵ فراوان و خۆشەویستی دەکا,.... هتد. بەڵام ترس لە غەیری خوا واتە ترس لە مەخلوق ودروست کراو بەپێچەوانەی ترس لە خوایە لە هەموو ڕوێکەوەو لەو خاڵانەی دیارمان کرد... ئەمەش لەبەرو بومی بیرو باوەڕە جوانەکەی خوا بە یەك ناسینە, کە هەر خوای گەورە خۆی دەزانێ چەندەها نەخۆشی دەروونی و لاشەیی چارەسەر دەکا... بەڵام چی دەکەی لەگەڵ نەزانین و تێ نەگەیشتن...

## ٩٣- النـافـع :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای زیان کارە بەرامبـەر بـە ناتـەواویو تـا پـاکی, بنچینەی ئەم ناوە-نفع-ە واتە سوودو قازانج... النـافع-واتـە خـوای گـەورە قـازانج و سوود بەخشە بەهەر کەسێ بیەوێ جا زۆر بێ یان کەم لە دونیادا بێ یالـە قیامـەتا. وە پەنا هەر بۆ ئەو دەبرێ بۆ جێ بەجێ کردنی هەر چی سـوودو قازانجـە, سـود بەخـشێتی خـوای گـشت بوونـەوەری داپۆشـیوە بەتایبـەتی بەنـدە پیـاو چـاکەکانی تەنانـەت بـێ باوەڕانیشی لێ بێ بەش نەکردووە.. وە دوعاو پاڕانەوەی لێمان قەدەغەو یا ساغ کردووە لەغەیری خۆی, لە دەست کەوتنی سوودو قازانج یـا دوورکەوتنـەوەی زەرەرو زیـان... چونکە هەر خۆی-الضار -ەو -النافع-ە, واتە زیان لێ دەرو سوود گەیەنەرە , وە کەسێ بە غەیری خوا میسقاڵە زەڕەیەك سوودو زیانی بەدەست نییە, کەواتـە هـاوار کـردن و پاڕانەوە لە داماو بێ دەسەڵاتان گومڕایی‌و سەر لێ شێواویـیە , وە خـوای گـەورە داوام لێ دەکا لە گومڕایی‌و سەر لێ شێواوی خۆمان بپارێزین , وەك دەفـەرموێ:- ﴿وَلاَ تَدْعُ مِنْ دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّـالِمِينَ(١٠٦)وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلاَ رَآدَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِـهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ يونس (١٠٦)... هەروەها خوای گەورە ڕوو لە پێغەمبەر -ﷺ- دەکاو پێ دەفەرموێ :- کە ڕوو بە خەلکەکە بلێ هیچ قازانج وەیـا زیانێکم بۆ خۆم بە دەست نیە- چ جای بۆ خـەڵك – مەگـەر ویـست و خواسـتی خـوای لەسەر بـێ .. ﴿قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا إِلاَّ مَا شَاءَ اللّهُ ﴾ الاعـراف (١٨٨) وە قورئان چەندەها جار لەزەم و سەر زەنشتی ئەو شتانە کەخـەڵك پێـی گـومڕا بـوون , نەزەرەریان بە دەستەو نە قازانج , وەك دەفـەرموێ:- ﴿وَلاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا ﴾ الفرقان (٣) کەواتە هەموو شتێك بە دەست خوایەو هیچ هێزو دەسەڵاتێ ناتوانێ سودێك بە کەس بگەیەنێ وەیا زیانێکی بچوکی لێ بدات مەگەر بە ویـست و خواسـتی

خوای گەورە نەبێ... بۆیە دەبێ خاوەن باوەڕ تەنیا چاوی لە دەرگای ڕەزامەندیو بەخششی خوا بێ, گومانی لەو ڕاستیەدا نەبێ کەوا هیچ کەس ناتوانێو بۆی نیەیە جگە لە خوای گەورە, کەمترین سوود یان زیان بگەیەنێ ... جا ئەگەر موسوڵمان باوەڕەکەی خۆی لە باوەش کرد ئەبێ باکی بەچی بێ, مەگەر بە تاکە خۆشەویست و هاورێی خۆی کە خوا بەخشندەو میهرەبانە......

## ٩٢ـ النـــور :

ناوێکە لە ناوە جوانە دڵ ڕفێنەکانی خـوای بەخـشش و فـراوان , بنـچینەی ئـەم ناوە -نور- ە واتە نورو ڕووناکی... النور -واتە خوای گەورە نـورو ڕووناکیـیـە نـورێکی ئاشکرایەو وە هەموو شتێکیش لای ئەو ڕوون و ئاشکرایە وە ڕوناك کەرەوەیە لە دونیـاو قیامەتدا, نورو ڕوناك کەرەوەیە لە دونیادا بە دوو شێوە شـێوەیەکیان مەعنەویـیـە وەك بەخشینی بیرو عەقڵ وهۆش ئیمان و باوەڕ ,...هتد وە پێغەمبەریشی گێڕاوە بە نور بـۆ ڕۆشن کردنەوەی دڵان و بیرو هۆشەکان هەروەکو دەفەرموێ :- ﴿قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ ﴾ المائدە (١٥) وە شێوەکەی تریان ماددیـیە بە چاو دەبینرێ وەك مـانگ و ڕۆژو ئەستێرەکان , کە دەربارەیان دەفەرموێ:- ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُورًا ﴾ یونس (٥) جا خوای گەورە نورو ڕووناکی ئاسمانان و زەویـیە , وەك لـە سـورەتی نوردا دەفەرموێ:- ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ النور (٣٥) هەر چی لـەم ئایەتـە سەرسورهێنەرە خۆی دەردەخا ئیتر نورێکی ئارام و ڕۆشن دەبارێ هەموو کەون و بونەوەر دادەپۆشێو ئـەڕژێ بەسـەر هەسـت و هـۆش و ئەندامـەکانا , ئـەڕژێ بەسـەر هـەموو شوێنێکدا هەتا هەموو بونەوەر تەسبیحاتی دەکـەن , لـە بـەهرەی ئـەم نـورەدا دەسـت دەکەنە ملی یەك و چاو و بیناییان لێی تێر نابێت , پەردەکان لادەدرێ دڵان ئاسك ئەبێ گیان و ڕوحەکان باڵ دەگرنەوە هەموو شتێ لەم بەهرەیەدا نوقم دەبـێ , هـەموو شـتێك خاوێن دەبێ لـە دەریـای نـوردا شـتەکان قـورس و سـەنگینیان نـامێنێ ئـازادیو بـاڵ گرتنەوەیە بە یەك گەیشتنەوەو یەکتر ئاسینە , هاو دەمیو خۆشیو شـادیـیە , هـەموو بونەوەرە هەرچی تیایەتی وەهەر کەس تیایەتی نورێکی ئازادەو دورە لە کـۆت و زنجیرو سنور, ئاسمانەکان پەیوەستن بە زەویـیەوە , گیانـدارەکان لـە گیانەکانـەوە دورەکـان لـە نزیکانەوە، ڕێگەو ڕێبازەکان شاراوەو دیارەکان هەست وهۆش ودڵەکان هەموو لێك نزیك دەبنەوە ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ ئاسمان و زەوی بـەم نـورەوە وەسـتاون , بـەم نورە یاساکانیان ڕاوەستاوە، وەهەر ئەم نورە خوایـیە کە بونی پێ بەخشیون و ڕێك وپێك ڕای گرتوون.. خوای گەورە ئیسلام و هیدایەتی بە نورو ڕوناکی وە کافرو بێ بـاوەڕی بـە تاریکی ناو بردوو. وەك دەفـەرموێ ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى

النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمْ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنْ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ﴾ البقرة (٢٥٧) وە خوای گەورە لە بێ باوەڕو کافران ئەدوێ کە بەدرێژایی ڕۆژگار دەیانەوێ نوری خوا بکوژێننەوە خوای گەورە بەڵێنی ئەوە ئەدا کەنوری خۆی هەر تەواو بکاو بەرنامەی خۆی هەر پەرە پێ بدات , هەر چەند کافران و بێ باوەڕان پێیان ناخۆشبێ هەروەك دەفەموێ:- ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾ الصف (٨) موسلیم و ابن ماجه ریوایەتیان کردووە لە کیتابی ئیمانا لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە (خ) :- ( **قام فينا رسل الله-ﷺ- بخمس الكلمات , فقال : ان الله عزو جل لاينام ولاينبغي له أن ينام يخفض القسط ويرفعه ، يرفع اليه عمل الليل قبل عمل النهار وعمل النهار قبل عمل الليل ، حجابه نور ، لو كشفه لاحرقت سبحات وجهه ما انتهى اليه بصره من خلقه** )... واتە- خوای گەورە نانوێ شایان و شایستەی ئەو نیە بنوێ تەرازوو بەرز دەکاتەوەو دای دەنوێنێ , واتە بۆ هەر کەسێ خواستی ببێ ڕزقی زۆر دەکا, یا کەم دەکا , وە کردەوەی ئادەمیزاد لە ڕۆژا بەرز دەکاتەوە بۆ لای خۆی بەر لە کردەوەی شەوی دوایی , وە کردەوەی شەوی بەرز دەکاتەوە بەر لە کردەوەی ڕۆژی دوایی , وە ئە پەردەیە وا لە بەینی خواو عیبادایە نورە , ئەگەر ئەو نورە دەربخا , ئەو نورەکانی جەمال و عەزەمەت و هەیبەت وسامی هەتا چاوت کار بکات مەخلوق دەسوتێنێ□ وە زۆربەی زۆری ئادەمیزادەکانیش وورەی وەستانی لای مردوێکیان نیە. بە تەنیایی , لە بەر بێ هێزی و نا تەواویان کەچی هەندێکیان ئارەزووی بینینی خوا دەکەن بە چاوە لاوازو بێ هێزەکانیان , بە نەفسی پیس و لاوازو ناتەواو بێ تاقەتیان , بە گیانی تاوانکارو ترسنۆك و بێ ووەریان □

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای نورو ڕوناکی , بنچینەی ئەم ناوە —هدایـە-ە... واتە ڕینمـونی و هیدایـەت ... الهـادي- واتـە خـوای گـەورە ڕێنمونـەیی کـاری هـەر بونەوەرێکە هەر لە ئادەمیزادەوە تا ئاژەڵ و مەڕو ماڵات و وە باقی گیان دارانی تـریش هەریەکـەیان مـافی خـۆی ئـەداتێ لـە ڕێنموونـەیی کردنیـدا بـۆ جـێ بـەجێ کردنـی پێداویستیەکانی ژیانیان.... وە بونەوەرێ نییـە بتوانێـت ڕێنمونـەیی سروشـتی ژیـانی بگرێتە بـەر مەگـەر لـەلای پەروەردگارییـەوە پێـی درا بێـت , جـا خـۆرو مـانگ و ئەستێرەکان بێ یا نەهەنگەکان و ماسییە جۆر بە جۆرەکان بـێ یـا باڵنـدەو زینـدەوەرە بچوکەکان بێ وە یا گشت گیاندارانی تر بێ ... وە خوای گەورە بۆ ئادەمیزادەکـان دوو ڕێگە ڕێنمونەیی پێ داون وەك دەفـەرموێ ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ الانسان (٣) یا ئەفـەرموێ : ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْـدَيْنِ ﴾ البلـد (١٠) دا ئـەم دوو ڕێگەیـە یەکێکیان موافیق و ڕاستەوانەی ڕەزامەندی خوایە کە بریتیە لە ڕێگـەی پێغەمبـەران و پیاو چاکان یا بەمانایەکی تر پەروەردە کردنی دەروون و گیان و پاککردنەوەو بەرز کردنی بە تەقواو خوا پەرستی , ئەمەشیان دەکرێتـە دوو بـەش ... ا-بەشـێکی کـە دراوەتـە دەست پێغەمبەران و زانایان کە بریتییە لـە ڕوون کردنـەوەی یاسـاو بەرنامـەی خـوای گەورە   وەکو خوای میهرەبان بە پێغەمبەر دەفـەرموێ:- ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِـرَاطٍ مُـسْتَقِيمٍ ﴾ شـوری (٥٢).. ب- ئـەم بەشەشـیان بریتییـە لـە ڕەگ و نـاوەڕۆکی ئـەم ڕێنمونەیییە کە تەنها بە دەست خوای میهرەبان وەك دەفەرموێ ﴿وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ البقرة (٢١٣) یا دەفەرموێ ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّـهُ فَهُـوَ الْمُهْتَـدِ ﴾ الاسراء (٩٧) یا دەفەرموێ ﴿لَيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ ﴾ البقرة (٢٧٢) واتە-لەسەر تۆ تەنها پەیام گەیاندنـە وە ڕێنمونـەیی کردنیـان ودڵ دامـەزرانیان لەسەر تۆ نیە , بەڵکو خوا بەخواستی خۆی ڕێنمونەیی ئەو کەسە دەکـات کـە بیـەوێ , چونکە بە ڕاستی کەسێ لە حەقیقەت وچۆنیەتی نەفس وگیانی کەسێ نازانێ بە تـەواوی

، تەنها خوای گەورە نەبێ کە بە دیهێنـەرەو کاریـەتی.... وە ڕێگـەی دووەم لـە یاسـا دەرچووەکانا کە پێك هاتوون لە ئادەمیزادانی زاڵم و زۆر دارو کافری سـەر سـەخت , وە گەلانی لە ڕێگا دەرچوو وە کەسانی درۆزنی نیعمـەت پـۆش وە کەسـانێ موسـریفی زۆر درۆزن ئەمانەو هاو وێنەیان بەر هیدایەت و ڕێنمونەیی خوای گـەورە ناکـەون و , خـوای میهرەبان ڕێنمونەیی و هیدایەتیان نادات , وەك لەم ئایەتانەدا دەفـەرموێ:- ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ البقرة (٢٥٨) ﴿وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَـوْمَ الْكَـافِرِينَ ﴾ البقـرة (٢٦٤) ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴾ الزمر (٣) ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾ غافر (٢٨) خـوای گـەورە هـەر خـۆی دەزانـێ کـێ و کامـەو چـۆن ڕێنمونەیی دەکاو کێش و گومڕاو سەر سەخت دەبێ وەك دەفـەرموێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ اهْتَدَى ﴾ النجم (٣٠) هەروەها ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی بدات هەر ئەوە ڕێنمونەیی‌و هیدایەت دراو, وە ئەوەی خوای گەورە هیدایـەتی نەدا ئەوە بێگومان گومڕاو سەر لێ شێواو دەبێ و وەتوشی زیان باری وخەسـارەت دێـت لە دونیاو قیامەتدا , وەك دەفەرموێ:- ﴿مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَـدِي وَمَـنْ يُـضْلِلْ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْخَاسِرُونَ ﴾ الاعراف (١٧٨) ، خوای گەورە خاوەن باوەڕان و پیـاو چـاکان هیدایەت دەدات ودڵ شادومانیان دەکات وەك دەفەرموێ :- ﴿وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّـهِ يَهْـدِ قَلْبَهُ ﴾ التغابن (١١) دیارە گومڕایش لەوەیەوە دەبێ کە ئادەمیزاد بە نەزانین و بە بـێ بەرنامەی خوای گەورە ژیان بباتە سەرو وە بەدوایی هەواو ئارەزوو خواستی خۆی بکەوێ وەك دەفەرموێ:- ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنْ اللَّهِ إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَهْـدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ القصص (٥٠)... وە ئێمە پێویستە باوەڕمان لە خلقە دوور بکەینەوە وە بە دڵسۆزی پەیڕەوی بەرنامەی خوای گەورە بکەین وە لەبەر خوای گەورە بپارێینـەوە کە ڕێنموونەیمان بکات , وەك دەفەرموێ ﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَـدُوا ﴾ النـور (٥٤) ئەگـەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بن و بەفەرمان ڕەوایی قەبوڵ بکـەن ئـەوە ڕێگـەی ڕینومایی هیدایەت ئەپێکن و سەرکەوتوو سەرفراز دەبن.......

## ٩٥ ـ البـديـع :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای ڕێنمونەیی کار, بنچینەی ئەم نـاوه -بدعـه- یـه واته بەدیهێنان و هێنانه کایەوه... البديع:- واته خوای گەوره خالیق و دروسـت کـەری هەموو بونەوەرەکانه له هیچ و نەبوونەوه بۆ گۆڕەپانی بـوون و شـێوه وەرگرتنیـان , بـێ گومان ئەم سیفەته هاوتای سیفەتی (الخالق-الباریء )ەکه هەر شایان و شایستەی خوای میهرەبانه, وه هەرچی له بووندا هەیه بۆی نیەو نـاتوانێ شایـسته نیـیه ئـەم سـیفەته بگرێته باوەش وه مێشولەیەکیشیان پێ نایەته کایەوه.... خوای گەوره ئـەم سـیفەتەی دووجار له قورئانی پیرۆزدا بەیان کردووه. که یەکیان له سورەتی به قەرەیـه لـه ئایـەتی سەدو حەڤده وەك دەفەرموێ:- ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ واته خوای گەوره خالیق و دروست کـەری ئاسمانـەکان و زەویـیه هـەر فەرمانێ بڕیار بدا هەر ئەوەندەی دەیەوێ که بفـەرموێ ئـیتر دەسـت بـەجێ و یەکـسەر بەچاو تروکانێ ئەنجام دراوەو به جێ گەیوه ... هەروەها له سورەتی ئەلئـەنعام دا لـه ئایەتی (١٠١) سەدو یەك دا دەفـەرموێ ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ ، بەدیهێنـەرو خـالیقی ئاسمانەکان وزەوییه ناشێ وشایسته نیه ڕۆڵەی هەبێ یـا ئـافرەت وخێزانـی هـەبێ , وه هەموو شتێکی بەدیهێناوه وه خۆی به هەموو شتێ زانایەو ئاگـاداره سـستیو لاوازی‌ـو بێ هێزی بەسـەر نـەهاتووەو ڕووی تـێ ناکـات بێنیـازو ئومێـدو پێویـسته، پێویـست بەکۆمەك و یارمەتی ناکات و هەموو شتێ پێویست بـەوه دەکـات و پێویـستیانی هـەر بەوه (سبحانه و تعالی) ..

## ٩٦- الباقـي :

ناوێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای بەدیهێنەرو خالیق, بنچینەی ئەم ناوە –بقی–یە واتە مانەوەو لەناو نەچوون ...

الباقي : واتە خوای گەورە هەر ئەمێنێتەوەو باقییە کەم و کوڕی و لەناو چوون و مردن شایان و شایستەی ئەو نییە, وە لە ڕابردوو وەکی بێ بن و لەبن نەهاتوو بووە (واتە مالا نهایە) هەر هەبووەو باقی بووە , وە لە داهاتووی بێ کۆتایی هەر باقییەو ئەمێنێتەوە , وە ئەو سیفەتانەی بەسەر بەدیهێنراو دێن وەك بێ هێزی‌و لاوازی‌و ناچاری‌و ناتەواوی‌و مردن و...و...هتد ئەمانە شایان و شایستەی پەروەردگار نین , خوای گەورە ئەزەلی‌یەو ئەبەدی‌یە , واتە سەرەتاو کۆتایی بۆ نەبووەو نییە , هەموو بونەوەرەکان لە هاتنی کات و وادەی خۆیان دەبێ بۆ لەناو چوون و مردن سەر شۆڕکەن بە ناچاری‌و بێ دەسەلاتی , تەنها پەروەردەی کاری مەزنی بەرێزو عەزەمەتە دەمێنێتەوەو باقییە , وەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ(٢٦)وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ﴾ الرحمان. ئەم سیفەتەی خوای گەورە هەر شایستەی خۆی بێ هاوتایە وەکو سیفەتی –(الاخر..الوارث..)ە. لە یەك ماناو مەبەست کۆدەبنەوە. خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا بە خواستی خۆی بێ باوەڕان و زاڵمان و ستەم کاران لە دۆزەخدا دەهێڵێتەوەو باقی یان دەکا هەتا هەتایێ , وە هەروەها ئیمان داران و خاوەن باوەڕان لە بە هەشتی پڕ بەخشش ونیعمەتدا دەیان هێڵێتەوەو باقییان دەکا , وە کەسێ لە ئادەمیزادەکان و جنەکانا لەو ڕۆژە لەشوێن و مەنزڵی خۆیاندا بەجێ نامێنن و غایب نابن , جا چ ئیمانداران و خاوەن باوەڕ بن یا چ کافرو بێ باوەڕ بن وەك دەفەرموێ ﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ(١٣)وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ(١٤)يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ(١٥)وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ﴾ الانفطار...

## ٩٧ـ الـوارث :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای نەمر , بنـچینەی ئـەم نـاوە-ارث-ە واتـە کـە لەپورو پاش ماوه...

الوارث : واته خوای گەورە میراتگری هەموو شتێو هەموو کەسێکە , وەك چۆن لەسەرەتاوە بونەوەری لە نەبوونەوە دروست کردوەو بەدیهێناوە , وە هەر خۆشی کۆتاییان پێ دەهێنێ و هەر بۆ خۆشیەتی ئەنجامی کەلوپووری هەموو کەسێو هەموو شـتێ, وەك دەفەرموێ ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ ﴾ الحجر (٢٣) واته- بـێ گومـان ئێمه خۆمانین ژیێنەرو مرێنەر وە هەر خۆشمان میرات گرین بۆ هەموو شـتێ , هـەروەها دەفـەرموێ :- ﴿وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ ال عمـران (١٨٠) واته- بۆ خوای گەورەیە میراتـی ئاسمانـەکان و زەوی , وەئاگـادارو زانایـە بـەو کردەوانەی کە ئەیکەن ...هەروەها دەفـەرموێ ..﴿ إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ الاعراف (١٢٨) واته- به ڕاستی بـۆ خـوای گەورەیـە ئـەم زەوییە جا ئەیدا بەیەکێ کـە خـۆی بیـەوێ لەبەنـدەکانی سـەرەنجامی بـاش و پـیرۆزو سەرکەوتوو بۆ خواپەرستـانە ... خـوای گـەورە مزگێنـی دەدا بەبەنـدە پارێزەرەکـان و موتتەقییەکان بەوەی کەبەهەشتیان پێ دەداو بۆیان دەمێنێتـەوە , وەك دەفـەرموێ :- ﴿...تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيًّا ﴾ مریم (٦٣)... ڕابردوو مێـژوو شایەدە بۆ ئەم ڕاستەقینەیە , کە چەندان پاشاو خاوەن ماڵ و سامان سـەرەنجام خـاوەنی خۆشیان نەبوون و خۆشیان لەدەست چووە.. تەنانەت خێـرو شەڕێکیـشیان بـەبێ ئیزنـی خوای گەورە لەدەست نەبووە , تـەنیا نیەتـە شـاراوەکەی دڵیـان نـەبێ. چـونکە ئەگـەر خێرێکیان بە دەست بایە خۆیان لەمردن رزگار دەکرد , وە یا ئەگەر شەڕێکیان لەدەست بوایە , خۆیانیان لێ دەپاراست ..بە مانایـەکی تـر لـە بـەدیهاتنی هـەموو بەشـەکانی بونەوەر هەروەها هاتنی کات و وادەی لەناو چوون بۆ هەریەکەیان هەروەها سودو زیانیان یا ژیان و مردنیان یا مانەوەو فەوتانیان گـشتی بەسـتراوەتەوە بـە حیکمـەت و دانـایی

خوای گەورەوە , وە دانایی و حیکمەتی خوای گەورە فەرمان ڕەوایەو ئەندازیارە بۆ هەر چەن و چۆنیٚ و کام و کەینیٚی هەر شتیٚ , وە دوورە لەوەی هەر خوێرییٚ یا سەر سەرییٚ یا زالمیٚ یا ستەمکاریٚ یا گێلە پیاوو کۆڵەواریٚ پەنجەی تیا بیٚ , یا پەنجەی تیا بخا , هەروەها بە دەستی پێغەمبەران – علیهم صلاة والسلام –وە پیاو چاکانیش نیە , وەك و خوای گەورە ڕوو بە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویٚ :- ﴿لَيْسَ لَكَ مِنْ الْآمْرِ شَيْءٌ ... ﴾ ال عمران (١٢٨) واتە: سەرەنجامی وەبن ئەنجامی هیچ کارو فەرمانیٚ بە دەست تۆ نیە ئەی نێراوی خوا جا چ جای بە دەستی کەسێکی تر بیٚ , سبحان الله وتعالى- بەڵکو هەمووی وا لە ژێر فەرمان ڕەوایی حیکمەت و دانایی خوای گەورەیە.. (وە ژێری بیری ئادەمیزادیش وەرناگریٚ و قەبوڵ ناکات لەو ئەندازیارێتیەی خوای گەورە کە بە ستوویەتەوە بە قەزاو قەدەر وە هەر چەقاوە سویٚ و گەمژەییٚ هەڵسیٚ پەنجەی خۆی تیا بکا)....ئەم سیفەتەی خوای گەورە دەبیٚ وامان لیٚ بکات کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا لەو پەڕی کارو کرداری چاکی بین بە گوێرەی توانامان وە کار چاکیو بیرو باوەڕی ڕاست و جوان بکەینە پاش ماوەی خۆمان و بەجیٚی بهێڵین , وە هەروەها لێیەوە فەرامۆش نەبین و کە هەرچی هەمان بووەوە دەمان بیٚ ئەوە خوای میهرەبان پێمانی داوە وە دوایش بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، لێپرسینەوەو یەخەمان لەدوا ڕۆژدا دەگرێتەوە وەکو خوای گەورە دەفەرمویٚ :- ﴿إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْآرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾ مريم (٤٠) واتە- بە ڕاستی ئێمە خۆمان میرات بەری زەوین وە بەوەی کە لەسەرێتیەوە بۆ لای ئێمە دەگەڕێتەوە، خوای گەورە موژدەو مزگێنیەکی تری دونیایی داوە بە پیاو چاکانی خوایی کە خۆیانن دەبنە خاوەن پایەو دەسەڵات لەسەر ڕووی زەوی وەکو دەفەرمویٚ:- ﴿أَنَّ الْآرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِي الصَّالِحُونَ ﴾ الانبياء(١٠٥)...

## ٩٨ـ الرشيد :

ناوێکه له ناوه جوانەکانی خوای میراتگری هەموو کەسێ، بنـچینەی ئـەم نـاوه- رشد-ه، واته: ڕاست ڕەوو ڕێنموونـەیی کـراوه-هـدی-...الرشـید- واتـه خـوای گـەوره دامەزراوه لەسەر حەق و ڕاستیو وه دژ به ناتـەواوی و ناپـاکی و زیادەڕەوییـه وەکـەم وکوڕی و ناتەواوی به هیچ شێوەیێ له هیچ ڕوو لایەنێکـەوه لێ ڕوو نـادات وه لەگـشت سیفەتیەوه له کەمال و جەمالیەوه هەروەها خـوای گـەوره ئـازاو بـێ ترسـه بەرامبـەر هەموو شتێ هەموو کەسێ , هەروەها بێ ترسه لەئـەنجام دانـی هـەر کـارو فـەرمانێك پەشیمانی و پەشۆکاوی ڕووی تێ ناکا وه شایسته نىیه بۆی , وه لەو پەڕی چاکەویـستی و مەردایەتییه , وه دژی هەموو ناپاك و نەگریس و سەر شۆڕکەرو بێ نرخێکـه.. حـەز دەکا هەموو دەم بەندەکانی لەسەر بەرزیو کارچاکیا بن.. هەروەها -ڕەشید- بـه مانـای ڕاست ڕەوو چاك کارو سەرکەوتووش دێت.. وه لەسەر خاوەن باوەڕانه خۆیان بەم سـیفەتە بڕازێننەوه وه بەر مەحبوبیانی خوا بکەون.. خوای گەوره به زومانی بێ بـاوەڕان ڕوو بـه حەزرەتی شوعەیب بۆمان دەگێڕیتەوەو دەفـەرموێ :- ﴿قَالُوا يَاشُعَيْبُ أَصَلوتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِـيدُ ﴾ هود(٨٧) واته- گەلی شوعەیب به گاڵتەکاری و پێکەنینەوه ووتیان ئەی شوعەیب ئایـه نوێژەکانته فەرمانت پێ دەدا کەواز لەپەرستراوێ بێنین کەباب و باپیرانمان پەرسـتویانه , یا واز بێنین له سەرف کردنی ماڵ و سامانمان بـه کـەیف و ئـارەزووی خۆمـان ؟ ماشـاء الله!! ماشاء الله!! دیاره هەر تۆ به ڕاستی لـەم وولاتـەدا ئادەمیزادێـك خـاوەن هـۆش و ڕوشدو زانیاری و تێگەیشتنی که بـه ئاشـکراو پـەنهان دەتـەوێ ئیـصلاح و کارچـاکی لایەنی مەعنەوی ماددەیەتمان بکەی ؟! هەڵـسه لاچۆ کەی باوی ئەم قسانەیه!! جـارێکی تر حەز ناکەین گوێمان لێت بێ بەم جۆره!!.. وەکو ئێستا گەر خوێن گەرمێکی دڵسۆزی ڕێگەی خوای گەوره بڵێ لـه ڕای خـوا ئـاین و بەرنامـەی خـوا نەخەنـه ژێـر عـادات و

تەقالیدتان یاسای خوای گەورە وانیە کە ئێوە گوفتارو ڕەفتاری پێ دەکەن !!؟! ئـەوە لێ ناگەڕێن لەووتەکانی ببێتەوە خێرا یەکێ بە دەنگێکی بەرزی نارەزاییەوە بەوەڵام دێـت و دەڵێ کاکە باب وباپیری ئێمە هەر وایان کردووەو هەزاران پیـاو چـاك و زاناشـیان لـەناو بووە دیارە تۆ ژیر ترو زانا تری , واز لەم باسانە بێنە میللەت بە تۆ چـا نـابێ؟!.. بـێ گومان ئەو هەموو قسانەی لە خوا بێ ئاگایان لەڕووی خێرخوازان هەر بۆ ئەوەیـە , کـە کەسێ بەرژەوەندی نەفس پەرستیان لێ شل و شۆق نـەکاو تێـك نـەدا وە لێیـان ئـاڵۆزو سەخت نەکا.. دەنا هیچ ئاوات و ئامانجی بیرو باوەڕێکی ڕاستڕەو هانیان نادا!!!.. خـوای گەورە لەسەر زمانی جنەکان دەفەرموێ ئەوەی خۆی تەسلیمی یاسای خوا کردووە وە بـە دڵ و گیان پێشوازی کردووە ئەوە ئەو کەسانەن کە لە ڕاستەقینەیان پشکنیتەوە بەمـەوە ڕاستڕەوو سەرفرازی ڕویان تێ کردووە , وەك دەفـەرموێ ﴿...فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُوْلَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴾ الجن ... وە خوای گەورە بە زمانی ئیمانداریّ لـە گـەلی فیرعـەون دەفـەرموێ کەوتوویەتی ئەی گەلی من بە دوایی بیرو باوەڕی خوا بە یەك ناسین بکەون کـە مـن لـە ڕێگەی ڕاستام ئەمەیە ڕێگەی ڕاست و دروست کە پیشانتان ئەدەم , وەك دەفەرموێ :-

﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَاقَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴾ غافر (٣٨) هـەروەها سـیفەتی —الرشید- لەگەڵ سیفەتی- الهادی- یەك مانا دەبەخشێ......

## ٩٩- الصبور :

ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای دامەزراو لەسەر حەق و ڕاستی وەدژ بە زیادە ڕەویو ناتەواوی ، بنچینەی ئەم ناوە-صبر-ە، واتە سەبرو ئارام ...

الصبور: واتە خوای گەورە زۆر لەسەرەخۆو بە ئارامە لە هەموو کارو فەرمانەکانی ، وە ئارام و لەسەر خۆی دەدا بە هەر کەسێ بیەوێ لە بەندەکانی یا لێی دەسێنێتەوەو دڵتەنگ و بێ ئارامی دەکا...خوای گەورە لەزۆر ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا مەدحی صەبرو صابیرانی کردووە، ئەم سیفەتەی بەسیفەتێکی زۆر باش و بەجێ داناوە ، وە داوا لە بەندەکانی دەکا ئارام گرو لەسەرخۆبن ، وە خوای گەورە ئارام گران و صابیرانی خۆش دەوێ وەك دەفەرموێ:- ﴿...وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ ال عمران (١٤٦) هەروەها مزگێنی و موژدەیان پێ دەدا کەوا خۆی بە هەموو گەورەییەو عەزەمەتەوە لە گەڵیانەو پشتیوانیان لێ دەکا وەکو دەفەرموێ:- ﴿...إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ البقرة (١٥٣) هەروەها بە ئیمانداران دەفەرموێ یارمەتی و هێز وەربگرن لە ئارام گرتن و نوێژ کردندا وەك دەفەرموێ:- ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ...﴾ البقرة (٤٥) خوای گەورە لە سورەتی ئەنفال دا مزگێنی سەرکەوتن دەدات بە جەنگاوەرانی ئیسلام بەوەی ئەگەر ئارام بگرن سەرکەوتوویان دەکات با ژمارەشیان کەم بێت لەچاو دوژمنەکانیانا ، وەك دەفەرموێ:- ﴿...فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ الانفال (٦٦) بەڵێ سەرکەوتن بەروبومی صەبرگرتن و تێکۆشان و کۆڵ نەدانە لەکاتی ناخۆشیو تەنگانەدا ...ئەمەش نیعمەتی خوایە ئەیدا بەوان کەسانەی ئەم سیفەتە پیرۆزە لەگەڵ خۆیانا ئاشنا دەکەن پاداشی ئارام گرتن نەك هەر سەرکەوتن و بەس ، بەڵکو خوای گەورە پاداشتی بێ ژمارەیان پێ دەداتەوە لەدونیاو قیامەتدا وەك دەفەرموێ : ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ زمر(١٠) ئارامی و صەبر لە بەروبومی ئیمانە ، تا ئادەمیزاد ئیمانی فراوانترو بەهێزتربێ ئەوە بازاڕی صەبرو ئارامی زیاد دەبێ وە

پێچەوانەشەوە.... خوای گەورە هەڕەشەی توند دەکات لەوانەی کە ئارام نـاگرن لەسـەر حەق و ڕاستی وە ناشکوری دەکەن و بە قەزاو قەدەری خوای گەورە ڕازی نـین , وەك لـە فەرمودەیەکی پیرۆزدا (حديث القدسي) هـاتووە کـە پێغەمبـەر - ﷺ - دەڵـێ خـوای گەورە دەفەرموێ ﴿ انا الله الذی لا اله الا انا من استسلم لقضائي وصبر علی بلائـــي وشكر نعمائي كتب عندي صديقا ومن لم يستسلم لقضائي ولم يصبر علی بلائـــي ولم يشكر نعمائي فليطلب رباً سواي ﴾ واتە- منم ئەو خوایەی کە هـیچ پەرسـتراوێ نیـە تەنیا من نەبێ , ئەوەی تەسلیمی من بێت و پێی ڕازی بێـت وە ئـارام بگرێـت لەسـەر بەڵاو ناخۆشیەکانی دەینێرم , وە سوپاس و ستایشی نیعمەتەکانم بکات ئەوە لەلای خـۆم بە ڕاستگۆ دەینووسم , بەڵام ئەوەی ڕازی نەبێت بە قەزاو قەدەری من وە صـەبرو ئـارام نەگرێ لەسەر بەڵایانی من وەسوپاس و ستایشی نیعمەتەکانیشم نـەکات , بـاداوا کـات پەروەردگاری تر بە غـەیری من , واتە گومڕاو سەر لێشێواوەو لێـی ڕازی نـیم و خۆشـم ناوێ... ئەوەشمان لەیاد نەچێ صەبرو ئارام گرتن دەبێ لەسەر حەق و ڕاستی بێ یا ئەبێ لەسەر تێکۆشان بێ , بۆ هێنانەوەو لەسەر ڕۆیشتنی حەق و ڕاستی کە بریتیـیە لەیاسـاو بەرنامەی خوای گەورە.. نەك صەبرگرتن لەسەر کوفرو بـێ بـاوەڕیەو بـێ ئاگـاییەو دوور لەیاساو بەرنامەی خواییەو دەست گرتن بەکڵاو با نەیباو سەر شۆڕییەکی بێـی کۆشـش رزگاریەو , ئەمانە گشتیان بێ ئاگاییەو کوفرن , چونکە صەبر گرتن لەسـەر کـوفرو بـێ باوەڕی ڕازی بوونە بە کـوفر ئەمـەش لەحەقیقەتـدا کـوفرو بـێ باوەڕیـە , چـونکە لـە بەرژەوەندی کافران و فاسقان دایە , وە ئیمانی ڕاست و تەواویش کپ و بێ دەنـگ نـابێ لە بازاڕی تاریکیدا- جا سەبر گرتن لەشوێنی خۆی پەلە کاریش لەشوێنی خۆی وەك کـە مەسڵەحەت و حیکمەت ئەیخوازێ، ئەم هەموو سـیفەتانەی خـوای گـەورە زۆر جـوانن و کـەمال و پـیرۆزو بـەجێن , وە کـون وکەلەبـەری حـەق و ڕاسـتیەو دادپـەروەریان پڕکردۆتەوە... وە هەر سیفەتێ کار ناکاتە سەر ڕێژەی سیفەتەکانی تری خوای گـەورە ,

وه کەم و کوڕی بۆیان بەرپا ناکا , گشتیان مل کەچی حیکمەت و دانایی خوای بێ هاوتان . . .

چەندین ناوانی دواوه درێژەمان بەباسەکانیان نەدا لەبەرچەند خاڵێ هەندێکیان لەداتاو مانای (مرادفی ناوی تر بوون ، وەلەبەر زۆر گەورەبوونی نوسراوەکە کەکولفەی لەچاپ و کڕین و فرۆشتنی زۆر ئەوەستا ، بەتایبەتی بۆ ئەمڕۆی بازاڕ دەنا ناوه جوانەکانی خوای گەوره وەك لەقورئانا ماناو واتایان دیاه ، لەکەون و بونەوەریشدا دەخوێندرێنەوه وەلەتاریخ و مێژووشدا ڕەوشەنن وەلەسروشت و فیترەی ئامادەمیزادیشدا هەر دیارن ، ئێمەش مەبەستمان فراوان کردنی بیرو فکری خوێنەر بوو لەئاست ناوەکانا .

الحمد لله له الاسماء الحسنى

## ووته دواییه‌كان

سوپاس وستایشی له بن نه‌هاتوو بۆ ئه‌م خوایه‌ی كه نـاوه جوانـه پیرۆزه‌كـانی لـه خۆی ناوه وه به ڕاستیو به ته‌واوی هه‌ر شایسته‌ی ئه‌ون و پیرۆزی بێـو پیرۆزیـایی هـه‌تا هه‌تایی لێ ده‌كه‌ین , ئێمه‌ش پێی دڵ فراوان و دڵ خۆش و ئاسووده‌ین به هیوای خۆشیو شادومانی و لێ بووردنی خۆمانی لێ ده‌خوازین، وه دروودو سڵاوی ئه‌م میهرپانـه بـڕژێ به‌سه‌ر گیانی پیرۆزی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان و گشت پێغه‌مبه‌ران , وه دوایـی بـڕژێ به‌سه‌ر هه‌ڵگرانی بیرو باوه‌ڕی خوا به یه‌ك ناسی هه‌ر له‌ئاده‌مـه‌وه تـا دوا كـه‌س له‌سـه‌ر ڕووی ئه‌م زه‌مینه , كـه هـه‌موو ده‌م لـه تێكۆشـانی ئـه‌وه بوونـه یـا ئـه‌وه ده‌بـن كـه ئاده‌میزاده‌كان رزگار بكه‌ن له مه‌خلوق په‌رستی بۆ په‌رستنی خـوای خـالیق ومیهره‌بـان ... دووباره‌و هه‌زار باره سوپاس و ستایش بۆ خـوای میهره‌بـان , كـه توانـای دام ئـه‌م زنجیره‌یه پێشكه‌ش دڵسۆزانی حه‌ق و ڕاستی بكه‌م , وه هیـوام وایـه كـه بـه‌ردێكی زلی بناغه‌ی كۆشكی بیرو باوه‌ڕمان روون كردبێته‌وه به زومانی شـیرینی كـوردی. جـا پـێش ئه‌وه‌ی كۆتایی پێ بهێنین ئه‌م فه‌رمووده قودسی‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ر -ﷺ- ده‌خه‌ینه بـه‌ر چـاو كه ده‌فه‌رموێ خوای گه‌وره -جل جـلال-فه‌رمویـه‌تی : ﴿ **یاعیبادی انی حرمت الظلـم علی نفسی وجعلته بینكم محرما فلا تظالموا** ﴾ ئه‌ی به‌نده‌كانم حه‌رام و یاسـاغم كـردووه سته‌م و زوڵم له‌سه‌ر خۆم , وه به حه‌رام و یاساغیشم گێڕاوه له به‌ینی ئێـوه‌دا , ئێـوه‌ش سته‌م و زوڵم مه‌كه‌ن ﴿ **یا عبادی كلكم ضال الا من هدیته فاستهدوني اهدكم** ﴾ ئـه‌ی به‌نده‌كانم ئێوه گشتان گومڕاو سه‌ر لێ شێواون ته‌نیا ئه‌و كه‌سه نه‌بێ كه من هیدایه‌ت و ڕێنمویم كردووه , جـا داوای ڕێنمونـه‌ییو هیدایـه‌تم لێ بكـه‌ن هیدایـه‌تیان ده‌ده‌م .. ﴿ **یاعبادي كلكم جائع الامن اطعمته فاستطعموني اطعمكم** ﴾ ئه‌ی به‌نده‌كانم ئێوه گشتان برسین ته‌نیا ئه‌و كه‌سه نه‌بێ كه خواردنم پێی داوه جا داوای خواردنم لێ بكه‌ن خواردنتان ده‌ده‌مێ ... ﴿ **یاعیبادي كلكم عار الا من كسوته فاستكـسوني اكـسكم** ﴾ ئـه‌ی به‌نده‌كانم ئێوه گشتان ڕووتن ته‌نها ئه‌و كه‌سه نه‌بێ كـه مـن پۆشـاكم پـێ داوه , وه دام پۆشیوه جا داوای پۆشاكم لێ بكه‌ن تا بتان پۆشم و جل و به‌رگتان پـێ بـده‌م ... ﴿ یـا

**عبادي انكم تخطئون بالليل والنهار وانا اغفر الذنوب جميعا فاستغفروني اغفر لكم ﴾**
ئەی بەندەکانم بێ گومان ئێوە هەڵە دەکەن بە شەوو بە ڕۆژ وە من لە هەموو تاوانتان خۆش دەبم .. جا داوای لێ خۆش بوونم لێ بکەن لێتان خۆش دەبم... **﴿ يا عبادي انكم لن تبلغوا ضري فتضروني ولن تبلغوا نفعي فتنفعوني ﴾**... ئەی بەندەکانم بە ڕاستی ئێوە هەرگیز ناگەن بەوەی زیان و زەرەرم لێ بدەن تا زەرەرو زیانم لێبدەن وە هەرگیزیش ناگەن بەوەی سودو قازانجم پێ بگەیەنن تا قازانج و سودم پێ بگەیەنن ... **﴿ يا عبادي لو ان اولكم واخركم وانسكم و جنكم كانوا على أتقى قلب رجل واحد منكم ما زاد ذلك في ملكي شيئا ﴾**... ئەی بەندەکانم گەر ئێوە هەر لەیەکەم کەستان وەتا دوایی کەستان ئادەمیزادەکانتان و جنەکانتان وەکو باشترین کە سێ بن دڵ بە تەقوا لە ئێوە (کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ)-) ئەوە زیاد ناکا لە ماڵ و سامان و موڵکی من هیچ شتێ ...**﴿ يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وانسكم وجنكم كانوا على افجر قلب رجل واحد منكم ما نقص ذلك من ملكي شيئا﴾** ئەی بەندەکانم ئەگەر ئێوە هەر لە یەکەم کەستانەوە تا دواکەستان لە ئادەمیزادەکانتان و جنەکانتان وەك دڵی خراپترین کەسی بێ لە ئێوە کە -شەیتانە- ئەمە هیچ لە موڵکی من کەم ناکا **﴿ يا عيادي لوان اولكم واخركم وانسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني فاعطيت كل واحد مسألته ما نقص ذلك مما عندى الا كما ينقص المخيط اذا ادخل البحر ﴾**...ئەی بەندەکانم گەر ئێوە هەر لە یەکەم کەستانەوە تا دوا کەستان لە ئادەمیزادو جنەکانتان ڕاوەستن لەسەر پارچە زەوییەکا , داوام لێ بکەن هەر یەکە بە ئارەزووی خۆی , جا داوا کاری هەریەکەتان بەجێ دەگەیەنم ودەتان دەمێ بەمە هیچ کەم ناکات بەوەی لەلامە , مەگەر هێندە کەم بکات کە دەرزی بخەیتە دەریایێ... **﴿ يا عيادي انما هي اعمالكم احصيها لكم ثم اوفيكم اياها فمن وجد خيرا فليحمد الله ومن وجد غير ذلك فلا يلومن الا نفسه ﴾** رواه مسلم... ئەی بەندەکانم بە ڕاستی ئەوە پوختەی کارو کردەوەی ئێوەیە بۆتان دەژمێرم و حیسابی دەکەم , پاشان بەپێی کردارتان ڕەفتارتان لە گەڵا دەکەم جا ئەوەی بە پیر خێرو چاکەی بچێ و بەدەستی بێنێ با سوپاس و ستایشی خوای گەورەی

لەسەر بکات , وە ئەوەی بەپیر خەراپەیێ بچێت و بە دەستی بێنێ بالۆمەو سەرزەنشتی کەسێ نەکا تەنها گیان و نەفسی خۆی نەبێ

﴿ وصلى الله على سيدنا محمد وعلى ال سيدنا محمد﴾

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين ﴾ .......... ﴿ شيعر ﴾ ﴿ خوای گەورە ﴾

ئەی زاتی پاکی تاك ، خوا وەندی بێ وێنە ، ئیش وکارت هەمووی ، جوان و دڵ ڕفێنە ، بۆ خاتری ناوانت ڕەحمەت بۆ دڵ بێنە ، وەك خۆت لێ بوردەی ، ئێمەش وا رابێنە ، بە هەڵەو تاوانمان ، سەرمان مەشێوێنە ، قەڵەمی لێ بووردەت ، بە سەریان دا بێنە، تاکو لە ژین ما بین، قەد بێ ئومێد نابین ، بۆ رەحم و بە زەیت هەردەم داواکارین ، ئاسمانی شین و پان ، ئەو هانە فراوان ، گشت نیشانەو بەڵگەن ، بۆ تۆی زۆرمیهرەبان .

﴿ سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك ﴾...

سبحانك لاعلم لنا الا ما علمتنا انك انت العليم الحكيم

١٩٨٧/٧/١٧

کۆتایی هات

## سەرچاوەکان


١-قورئانی پیرۆز.
٢-فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ -.
٣ – في ظلال القران – سيد قطب
٤ – تفسير ابن كثير – الامام ابي الفداء اسماعيل بن كثير القرشي.
٥ – المعجم المفهرس لالفاض القرآن – محمد فؤاد عبدالباقي .
٦ – صحيح البخاري (متن) – تسعة اجزاء - الإمام ابي عبدالله محمد البخاري .
٧ – صحيح مسلم – بشرح النووي (١٨) جزءاً ، الامام محى الدين ابو زكريا يحيى المعروف بالنووي .
٨ – سنن ابن ماجه جزئان – الامام محمد بن ماجه القزويني .
٩ – سنن الترمذي – الجامع الصحيح (٥) اجزاء الامام ابي عيسى محمد الترمذي .
١٠ – التاج الجامع الاصول لاحاديث الرسول (٥) اجزاء – الشيخ منصور علي ناصف .
١١ – الاحاديث القدسية جزئان – لجنة القرآن والحديث للشؤون الاسلامية.
١٢ – رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين – الامام النووي .
١٣ – احياء علوم الدين – الامام الغزالي .
١٤ – الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي – ابن القيم الجوزية .
١٥ – تەفسیری نامی - ملا عبدالكريم المدرس .
١٦ – الايمان والحياة – القرضاوي .
١٧ – الاسلام – سعيد حوى .
١٨ – گەلێ سەرچاوەی جۆراو جۆری تریش .

